# ٥٠ ساڵ خەبات

## کورتە مێژوویەکی
## حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

بەرگی دووەم



## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


* ٥٠ ساڵ خەبات (کورتە مێژوویەکی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران) بەرگی دووەم

* نووسینی: جەلیل گادانی

* نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

* بەرگ: ئاسۆ مامزادە

* پیتچنین: ئیسماعیل راجی

* گۆڕینی لە IBM بۆ IMC: گۆران رواندزی

* چاپ: بەرگی چاپی سێیەم ٢٠٠٨

* ژمارەی سپاردن: ٩٥٣

* تیراژ: ١٠٠٠

* نرخ: ٣٠٠٠

* چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٢٧٠)



ماڵپەر: www. mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani

ئەو کتێبە پێشکەش دەکەم بە هاوسەری ئەمەکناسم «ئەسمەر بەدری»
کە ماوەی چەند ساڵ لە شارو شاخ خزمەتی کردووە و ئەو دەرفەتەی بۆ
رەخساندووم بەدڵسۆزی و بەپێی هەڵومەرج لە خزمەت حیزب و
کەلەکەم دابم و ئەوە چەند ساڵیشە لە دەرەوەی وڵات ئاگای لە
مندالەکانمانە و

بەدوای ئەو قسەو باسە درێژەی کە پلۆنۆمی شەش١ەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەسەر ئەم کتێبە (بەرگی دووهەمی پەنجا ساڵ خەبات) کرلو بەدوای نووسینی روون کردنەوەیەک لە رۆژنامەی کوردستانی ژمارە ٤٢٤دا دەنگی دایەوە، وەک هەر لەوێ بڕیارمدا رادەگەیەنم کە ئەم کتێبە لە روانگەی منەوە بەشێکی کورت لە مێژووی حیزبی دیموکرات و بەتایبەتی تێکۆشانی نیزیک بە نۆ ساڵی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕە کە لە رێکەوتی ١٣٦٧/١/١ی دامەزران و هەڵوێستی خۆی راگەیاند و تا ١٣٧٥/١٠/١٩ی هەتاوی کە دوو باڵی حیزب یەکیان گرتەوە تێکۆشان و خەباتی بەرچاوی هەبووە.

جەلیل گادانی

## خوێنەری بەڕێز:

زەمان دێ و تێدەپەڕێ. ئەوەی بۆمان دەمێنێتەوە ئەزموونە تاڵ و شیرینەکانی ژیانن کە دەبێ لە بیریان نەکەین، پەندیان لێوەرگرین و بە ئەمانەتەوە بە جیل و نەوەکانی دوای خۆمانی بسپێرین. چونکو ژیان مەجالی ئەوە بە هیچ کەس نادا هەموو شتێک بۆ خۆی ببینێ و ڕووداوەکان جارێکی دی تاقی کاتەوە.

هەروەک جەواهێر لەعل نەهرۆ پیاوی بلیمەت و مێژوونووسی هیندی و هەروەها«سانتیانا» فەیلەسووفی ئەمریکایی بەڕەچەڵەک ئیسپانیایی دەڵێن:" ئەتەوەیەک کە لە مێژووی ڕابردووی خۆی بێ خەبەر بێ مەحکووم بەوەیە ئەو ڕووداوە مێژووییانە دووپات کاتەوە.

گومانیش لەوەدانییە کە بۆ هەر ڕووداوێک دەلیلی تایبەتی هەیە و زەمینەی پێشتر لە گۆڕێدایە و شوێنەواری دوای خۆشی بە جێ دێڵێ کە زۆر جار بەسوودن و هێندێک جاریش زیانی گەورەیان لێدەکەوێتەوە.

بەداخەوە ئێمەی کورد ئێستاشی لەگەڵ بێ کەم وا هەیە بەتایبەتی ئەگەر لە سەرەوە بێن و بەرپرسایەتی بەرزمان هەبێ لە ئەزموونی ڕابردووی خۆمان و گەلەکەمان کەڵک وەرگرین. لە ئاکامی ئەو بۆچوونە چەوتەدا زۆر جار هەڵەی گەورە ڕوو دەدا و بە هۆی خاوە خاو کاتی زۆر بەکەڵک و بەنرخ لە دەست دەچێ و دووکەڵەکەشی دەچێ لە چاوی گەلی بەش مەینەتانەوە کە بە درێژایی مێژوو دوژمنان بە کوتکی زۆرداری کوتاویانە و مەجالی بیرکردنەوە و بە ئازادی ئەفەس کێشانیان پێنەداوە.

گەلێک جار وا لە ڕووداوەکانی ڕابردوو دوور دەکەوینەوە کە بە جارێک ڕاستییەکان فەرامۆش دەکەین. جا کە وەخۆ هاتینەوە لەم و لەو پرسیار دەکەین بەڵکوو شتێکمان بۆ ساغ بێتەوە، ئەویش ڕەنگە زۆر کەم و کووڕی تێدابێ. بۆیە پاش چەند ساڵ تێپەڕ بوون لە نووسینی ئەم پەرتووکە بە چەند مەبەست هەوڵم دا چاپی بکەم تا ئەو بەشە لە هەوڵ و خەباتی تێکۆشەرانی دێموکرات و حیزبەکەشمان ون نەبێ و لە مێژوو دا بمێنێتەوە:

یەکەم لەبەر ئەوەی ئەگەر دوای چەند ساڵی دی کادرێک یا پێشمەرگەیەکی حیزبی دێموکرات یا هەر کەسێکی دیکە ویستی لەسەر هەلومەرج و چلۆنایەتی ئەو سەردەمە و ڕووداوەکان شتێک بنووسێ یا لێکۆڵینەوەیەک بکا، ئەو بەڵگانەی لەبەر دەست دابن و کەڵکیان لێوەرگرێ.

دووهەم لەبەر ئەوەی ئەو ڕووداوانەمان لەبەر چاو بێ و پەندی لێوەربگرین و بۆ پتەو

بوونی ریزەکانی حیزب و یەکیەتی کورد و پێک هێنانی تەفاهوم و رووحی برایەتی زیاتر لە نێو هەموو حیزب و رێکخراوە کوردستانییەکان کەڵکی هەیە و ئیمانمان بەوە هەیە کە ئەوەی بە یەکگرتن و تەبایی بۆمان دەکرێ، هیچ کات بە دووبەرەکی و ناکۆکی پێک نایە. پێویستە دان بەوە دابنێین کە بە درێژایی تەمەنی کورد دوژمنان هەموو کات کەڵکیان لە ناتەبایی و ناڵۆزیی وەزعی ناوخۆی کورد وەرگرتووە و لەم رێگەوە بەسەری دا زاڵ بوون.

بۆ ئەوەی ئێمە وەکوو کورد وەبیر خۆمان بێنینەوە چمان بە یەکتر گوت، چمان بە یەکتر کرد و چمان بەسەر یەکتر هێنا، بۆ ئەوەی ئەو رووداوە تاڵ و دڵتەزێنانەی لە ماوەی جیاوازی دوویاڵی حیزب دا هاتنە گۆڕێ، هیچ کات لە بیر نەکەین و قەدری ئەو یەکگرتنەوە دە کردەوەدا بە قووڵی دەرک بکەین، لە عەینی کات دا بزانین رۆڵەکانی راستەقینەی دێموکرات هەر خۆیان بوون کە توانیان بە سەر هەستی خۆویستی و خۆبەردەستی دا زاڵ بن و قازانجی گشتی گەل و بەرژەوەندی جووڵانەوە میللی دێموکراتیکەکە بەرچاو بگرن و ببنەوە یەک ماڵ و ئەو کەلێنە گەورە پڕ بکەنەوە.

چوارەم بۆ ئەوەی جیلەکانی داهاتوو و لاوانی ئەمڕۆ بزانن لە شەڕی ناوخۆیی دا چیها خوێنی رۆڵە دڵسۆزەکانی کورد بە دەستی براکانی خۆیان رژاوە و ئیتر لەمە بەدوا هیچ کوردێکی بەشەرەف و هیچ حیزب و رێکخراوێکی بەرپرس لە هیچ شوێنێکی کوردستان بە هیچ بڕوبیانوویەک مافی ئەوەی نەبێ پاش ئەو هەموو زیانە قەرەبوو نەکراوەیەی لە شەڕی براکوژی دا وەکورد کەوتووە، کارەساتەکان دووپات کاتەوە و لە جیاتی وتووێژ و دیالۆگ شەڕ هەڵایسێنێ.

بەو هیوایە رەشایی لە دڵەکان دا نەمێنێ و بەوپەڕی دڵپاکی و هەستی بەرپرسایەتی و واز هێنان لە هەموو مەسڵەحەتێکی تاکە کەسی و گرووهی و هێژمۆنی خوازی هەموو لایەک لە پێناو وەدی هێنانی ئامانجەکانی گەلی کورد دا تێکۆشین و هیچ کات لە بیرمان نەچێتەوە بۆ هاتینە ریزی شۆڕشەوە و ئەو رێگە پڕ مەترسییەمان تا ئێرە بۆ چ بڕیوە و چۆن دەتوانین بە رێبازی پیرۆزی شەهیدە سەربەرزەکانمان وەفادار بین.

لە کۆتایی دا سوپاسی هاوڕێیان کاک هاشم کەریمی، کاک عوسمان رەحیمی، مامۆستا بێبەش، کاک سەعید بەگزادە و کاک سەلاح گادانی دەکەم کە لە پێداچوونەوەدا بە دەربڕینی رای خۆیان، هاوکاریان کردووم و هەروەها سوپاسی مامۆستا هیوا مستەفاش دەکەم کە زەحمەتی تایپ و کامپیوتێریزە کردنی بە ئەستۆ گرتووە.

**جەلیل گادانی**

**١٣٨١/٤/٣٠ی هەتاوی**

## سەرەتا:

"لوئی ئالتوسیر" فەیلەسووفی فەڕەنسایی سەردەم دەڵێ: ئەو زانستانەی ئێمە دەیانناسین، لەسەر چەند قاڕە دامەزراون، قارەی ریازیات (ماتماتیک) قارەی فیزیک، یەکەمین بە هۆی یونانییەکان (تالس) و دووهەمیشیان بەهۆی (گالیلە) دەرگایان کرایەوە. "مارکس" لە بەرامبەر ناسینی زانستیدا دەرگای قارەیەکی سێهەمی کردەوە واتە قارەی مێژوو.

ئەو وتەی سەرەوە مانای ئەوەیە کە ئەخشی مێژوو کەمتر لە زانستەکانی تر نییە و ئەگەر لە ریازیات و فیزیک زۆرتر نەبێ لە ئاستی ئەوان دایە. چونکە کەرستەی ئەوان ژمارە و ماددەن، بەڵام کەرستەی مێژوو مرۆڤە.

لەسەردەمی زووشدا مێژوو نووسراوە و مێژوونووسی بەناوبانگ هەبوون، بەڵام مێژوو لەسەردەمی زوودا زیاتر تەرخان دەکرا بۆ باس و خواسی جیهانگیریی ئیمپراتوران و دەسەڵاتداران و کەمتر لەسەر کۆمەڵانی خەڵک دەدوا. گرینگی دان بە دەوری مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی هەژدە و نۆزدە کە مێژووش وەکو زانستەکانی تر دەستوور و رەوشی تایبەت بە خۆی بۆ لەبەر چاو گیرا و بوو بە زانستێکی سەربەخۆ.

مێژوولەو سەردەمەدا باس لە رووداوەکان و رابردووی پێشینیان بە هەموو چین و توێژەکانیەوە دەکا و لە کۆمەڵ و قانوونەکانی پەرەسەندنی ئامرازی بەرهەم هێنان و پێوەندی ئەو پەرەسەندنە لەگەڵ گەشەکردنی کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە.

هەر حیزب و رێکخراوێک وەکوو هەر گەلێک و وەکوو هەموو مرۆڤایەتی مێژووی تایبەت بە خۆی هەیە کە کەم و زۆر مێژووی ئەو رەوتە سیاسییە لە رەوتی ژیانی سیاسی بۆ تۆرەمەی(نەسل)ی ئێستا و داهاتوو زۆر پێویستە.

حیزبی دێموکراتی کوردستان خاوەنی مێژوویەکی پتر لە پەنجا ساڵە کە دیارە خەبات و تێکۆشانی ئەندامانی ئەو حیزبە بەشێکە لە مێژووی ئێران و وڵاتانی دراوسێ بە گشتی و مێژووی خەبات و تێکۆشانی رۆڵەکانی گەلی کورد بەتایبەتی. ئەو خەبات و تێکۆشانە هەڵی دەگرت کە زۆر وتار و نامیلکە و کتێبی لەسەر بنووسرایە. بەڵام قەدەغە بوونی تێکۆشانی حیزبی دێموکرات لە زۆربەی تەمەنی خۆی دا بەداخەوە دەرسەدێکی کەمی مێژوونووسینی بۆ تەرخان کراوە.

پێش شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی ۱۳۵۷ ی هەتاوی بەرامبەر بە ۱۹۷۹ ی

زایینی دا ئەگەر لەوبارەوە هەنگاو گەلێک هەڵێنرابێتەوە، لەلایەن چەند نووسەر و ڕۆژنامەنووسی بیانییەوە بووە و ئەوەندەی من ئاگادارم بێجگە لە سەرەتای تاریک و ڕوونی مامۆستا هێمنی ئەمر کە بەشێکە لە مێژووی حیزب و کتێبی کوردستان و کوردی شەهید دکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوو و کاروانی شەهیدانی ئەمر کاک کەریم حسامی لەلایەن ئەندامانی حیزب یان کەسانی تری گەلەکەمانەوە هەنگاوی بۆ هەڵنەهێنرابۆوە (کوردستان و کورد و کاروانی شەهیدانی کوردستان مێژووی تایبەت بە حیزب نین بەڵام بەشی مێژوویی حیزبیشیان تێدا هەیە).

لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران کە بۆ ماوەیەکی کورت ئیمکانی تێکۆشانی ئازاد بۆ حیزب پێک هات تا ئەم ساڵانەی دوایی لە لایەن چەندین کەس لە ئەندامان و لایەنگرانی حیزب و چەند کوردی ترەوە یان وەکوو مێژوو یان وەکوو بیرەوەری چەندین کتێب و نامیلکە بڵاوبوونەوە و تەنانەت چەندین مێژوونووس و ڕۆژنامەنووسی بیانی کاتێک لەسەر مێژووی گەلی کوردیان نووسیوە بەشێکیان بۆ مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستان تەرخان کردووە. ئەو ئەندام و لایەنگرانەی حیزب کە لەسەر مێژووی حیزب کتێبیان بڵاوکردۆتەوە دەبنە دوو بەش : یەکەم ئەوانەی ناوی مێژووی حیزبیان لەسەر کتێبەکەیان داناوە، دووهەم ئەو کەسانەی کە بیرەوەری ژیانی خۆیان نووسیوە، کە لەبەر ئەوەی سەر بە حیزبی دێموکرات بوون.بمانهەوێ و نەمانهەوێ بەشێک لە بیرەوەرییەکانیان بەشێکە لە مێژووی حیزب.

لێرەدا باسی ئەوە ناکەم و جێی ئەوەش نییە کە هەڵیان سەنگێنم کام مێژوو یان بیرەوەری پوختەتر بوون یان کامیان کەموکورتییان زۆرترە، من لێرەدا تەنیا ئاماژەیەکی کورت دەکەم بە کتێبی پەنجا ساڵ خەبات بەرگی دووهەم کە بەرگی یەکەمی دەوروبەری پێنج ساڵ پێش ئێستا بڵاوبۆتەوە. لە بەرگی یەکەمی پەنجا ساڵ خەبات دا جگە لە دوو بەشی کە لەلایەن کاک عوسمان رەحیمی و کاک هاشمی ڕۆستەمییەوە نووسراوە، بەشەکانی تری و تەواوی بەرگی دووهەم لەلایەن هاوڕێ جەلیل گادانییەوە نووسراوە.

هاوڕێ جەلیل بۆ زۆر لە ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لە کوردستانی ئێران و تەنانەت لە بەشەکانی تری کوردستان ناسراوە. بەڵام بۆ ئەوانەی نایناسن، نووسینی کورتەیەک لە ژیانی بە پێویست زانرا. هاوڕێ جەلیل کادری کۆنی حیزبە کە لە دەوری کۆماری کوردستان دا وەک تازە لاوێکی دێموکرات تێکۆشانی هەبووە و لە دوای ڕووخانی کۆمارێشەوە تا ئێستا وەکوو ئەندام و کادر و پێشمەرگەی حیزب لە خەبات و تێکۆشان دایە. هاوڕێ جەلیل لەو ماوەدا زۆر جار تووشی خۆشاردنەوە و ئاوارەیی و دەربەدەری بووە

و پتر له دوازده ساڵ ژیانی له زیندانەکانی قزل قەلعە و قەسر و تەوریز و بورازجان و شیراز و جەلدیان و وورمێ و خورەم ناباد بەسەر بردووە. پلەی تەشکیلاتیی حیزبی هاوڕێ جەلیل بۆ ساڵها ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی و بۆ چەندین ساڵیش سکرتێری گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بووە و هەر ئێستاش ئەندامی ڕێبەرایەتی حیزبە. هەر بۆیە هاوڕێ جەلیل هەم سەلاحییەت و هەم شارەزایی تەواوی هەیە کە لەسەر حیزبەکەی خۆی مێژوو بنووسێ.

کەسێک بە تەنیا مێژووی حیزبێک یان گەلێک دەنووسێ بێ گومان کەم تا زۆر کەم و کورتی لە نووسینەکەی دا دەبێ کە ئەم کتێبەی هاوڕێ جەلیلیش لە کەم و کورتی بێ بەری نییە، بەڵام وەکوو دەڵێن ئەوەی کار ناکا هەڵە ناکا.

بۆیە ئەگەر بە چاوێکی واقیعبینانە و دوور لە هەر غەرەز و مەرەزێک سەیری ناوەرۆکی ئەم کتێبە بکەین و بیخوێنینەوە، هەم بۆ خاتری ئەوەی هاوڕێ جەلیل خۆی لەنێو جەرگەی تێکۆشانی حیزب دا بووە و هەم لە زۆر قۆناغ دا لە ئاستی ڕێبەری دا بووە کتێبەکەی زۆر بەنرخە و پێویستە ڕۆڵەکانی گەلەکەمان بە وردی بیخوێننەوە و کەڵکی لێ وەربگرن. پەنجا ساڵ خەبات" بەرگی دووهەم" مێژووی ئەو سەردەمەیە کە بە داخەوە دوای کۆنگرەی هەشت حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو بە دوو بەشەوە و ئەم بەرگە زیاتر باس لە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ تا کاتی یەکگرتنەوەی دوو باڵی حیزب دەکا.

هاوڕێ جەلیل جگە لەوەی لە نووسینی مەبەستە سەرەکییەکەدا کەمێژووی ئەو سەردەمەی حیزبە بۆچوونێکی واقیعبینانەی ڕەچاوکردووە، بە هێنانەوەی بەڵگە و سەنەدی زیندوو و بە هێنانی پەسەندکراوەکانی کۆنفرانس و کۆنگرەکان و وتاری ئەندامانی هەڵبژێردراوی کۆنفرانس و کۆنگرەکان و شەهیدەکانی ئەو قۆناغە کتێبەکەی دەوڵەمەند کردووە و بەڕاستی سەرچاوەیەکی جێی باوەڕە بۆ ئەو کەسایەتییە لە داهاتوودا دەیانهەوێ مێژووی حیزب بنووسنەوە.

بەم بۆنەوە بەش بە حاڵی خۆم وەکوو کەسێک کە نزیکەی سی( ٣٠ ) ساڵ لە نزیکەوە شاهیدی خەبات و تێکۆشان و کاری بێ وچانی هاوڕێ جەلیل گادانیم، بە گەرمی دەستخۆشانەی پێ دەڵێم و هیوادارم هاوڕێ جەلیل لە بواری نووسینیشدا... وەکوو بوارەکانی تری ژیانی سیاسیی ماندوویی نەناس و شێلگیر بێ.

**هاشمی کەریمی**

**٢٠٠١/١/١١**

# بەشی یەکەم

بێگومان کار و تێکۆشانی دوای کۆنگرەی ۷ بەتایبەتی لە باری نیزامیییەوە جێگای سەرنج بووە، لەم پێناوەدا زۆر پێشمەرگە و کادری بەوەج یا شەهید بوون یا بریندار بوون کە پێویست بوو جێگایان پڕ کرێتەوە. هەروەها ئاڵوگۆڕی بەرچاولە پێوەندی نێونەتەوەیی لەلایەک بەینی وڵاتانی سەرمایەداری بەتایبەتی ئەمریکا و وڵاتانی بلووکی ڕۆژهەڵات و لە لایەکی دیکە توندبوونی هەلومەرجی شەڕی نێوان عێراق و ئێران و، درێژەی ڕەفتاری وەحشییانەی ڕێژیم لە کوردستان دا کە بەرەو کاول کردنی وڵاتەکەمان دەچوو، هەڵیان دەگرت بەرەو کۆنگرە بچین و لە ساڵی ١٣٦٦دا کۆنگرەی هەشتەم بگیرێ و بەم شێوەیە پێڕەوی نێوخۆش بەڕێوەبچێ کە تەئکیدی لەسەر گرتنی کۆنگرە بە دوو ساڵ جارێک دەکرد.

لە مانگەکانی سەرماوەز و بەفرانباردا کۆنفراسەکان لە ئۆرگانەکانی نێوخۆی حیزب و دەوروبەری دەفتەری سیاسی و فێرگە و هەروەها بە هێندێک ئاڵوگۆڕی تا دوایی نەزانراو، لە دەرەوەی وڵات پێکهاتن و نوێنەرانی خۆیان هەڵبژارد کە دوایە لە هێندێک شوێن و لە ژێر تەنسیری ئەمرونەهی سکرتێردا ئاڵوگۆڕ کراون.(١)

مانگێک بەر لە پێکهاتنی کۆنگرەی هەشت پلینۆمێک لە بۆڵێ کە تازە دەفتەری سیاسی لێ جێگیر ببوو گیرا، لەم پلینۆمە دا وێڕای باس لەسەر ڕاپۆرتی کۆمیتەی

---

١- شایانی باسە کە یەک دوو کۆمیتەی وەک ئاڵمان و بریتانیا کە تا پێش کۆنفراسەکان زۆریش فەعال بوون، بۆ مەسڵەحەتی کاتی، کۆنفراسەکانیان هەڵوەشێندرانەوە و هیچ کام نوێنەریان لەکۆنگرەدا نەبووە. زۆریش بە زەقی سەید ئەحمەد حسێنی لە ئوتریش کە نوێنەری شەرعی و خاوەن دەنگ بووە، هەڵگیراوە و جێگاکەی دراوە بە کاک خوسرەو بهرامی.

ناوەندی بۆ کۆنگرە، دوکتۆر قاسملوو باسی " لیستەی فیکس"ی[٢] هێنا گۆڕێ و گوتی بۆ ئەوەی باشتر بتوانین کاروباری حیزبی ڕاپەڕێنین و بەم هەموو بۆچوونە جیاوازە لە شێوەی کارکردن، کار ناچێتە پێش، بۆیە دەبێ هێندێک لە هاوڕێیان کە دەتوانن پێکەوە کار بکەن و هاوسەلیقە بن، بێنە نێو کۆمیتەی ناوەندی. ئەم باسە زیاتر لە ڕاپۆرت وەختی پلینۆمی گرت، چونکە گێرە و کێشەی لێ ساز بوو. هێندێکی بە تەواوی دژەنگ کرد و هەڵبەزاندنەوە. دیاربوو دوکتۆر لە پێشدا لەگەڵ هێندێک لە هاوڕێیان لەم باردوە باسی کردبوو، هەر لەبەر ئەوەبوو کە دوکتۆر صادق، کاک مستەفا هجری و مامۆستا عبدالله حسن زادە دیفاعیان لە بۆچوونی دوکتۆر کرد و بە شتێکی باشیان زانی. هێندێک لەهاوڕێیانی وەک ڕەوانشاد سەیدسەلام و شەهید عەبدوڵلا شەریفی و جەلیل گادانی و بەشێکی دیکە لە هاوڕێیان بە شتێکی نادێموکراتییانەیان لە قەڵەم دا.

لەم پێوەندییەدا لە بەینی دوکتۆر صادق و کاک حەسەن ڕەستگار کێشەیەکی توند ساز بوو، کار گەیشتە گوتنی قسەی ناشیرین بە یەکتر. نووسەری ئەم دێڕانە بۆ ئەوەی کێشەکە تەواو بکا، بە توڕەیی گوتی حیزب و کۆمیتەی ناوەندی جێگەی دونل بازی نییە. بەم توڕە بوونە کێشەکە دامرکایەوە.

پلینۆم تەواو بوو، بەڵام ئەم مەسەلە ببووە باسێکی توند لە نێو بەدەنەدا و لە هەموو شوێنێک قسەی لەسەر دەکرا و بە گشتی بە شتێکی نادێموکراتیک دادەندرا و دژایەتییەکی زۆری لەگەڵ دەکرا.

ڕێژیم بە توندی بە دوای زانینی جێگا و کاتی کۆنگرەوە بوو، تەنانەت جارێکیش بەر لە تەواوبوونی کاری ساختومانی لە شوێنی تازە لە گوندی بۆڵێ کە بۆناوەندی حیزب و دەفتەری سیاسی و نەخۆشخانە ساز دەکرا، چەند تەیارەی ڕێژیم هاتن و بە خەستی بۆمبارانیان کرد کە بەداخەوە هاوڕێ حسن پور خزری هۆزانوان کە لە نزیک ئەو شوێنە لە کۆڕی هونەری و ناوەندی لاوان دەبوو، شەهیدکرا، زیانی ماڵیش زۆربوو.

---

٢- لیستەی فیکس بریتی بوو لە نووسینی ناوی ٢٥ کەس کە لەسەر ئەزەری دوکتۆر قاسملوو و یەک دوو کەسی دیکە ئامادە کرابوو. پێشنیاریشیان ئەوەبوو کە تەنیا ئەو ٢٥ کەسە ببنە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و چەند کەسیش هەر بەم شێوە ببنە ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندی، بێ ئەوەی هیچ کەس بتوانێ یەکیان لەوی تر جیا بکاتەوە، یا بەشێوەیەک دەنگ بە یەک لەوان ئەدا و بە بۆچوونی خۆی دەنگ بە کەسێکی دیکە بدا، لە عەینی کاتدا ئەو مەجالە بۆ کەسێک کە بیهەوێ خۆی کاندید بکا بەتەواوی بڕا بوو واتە کەس نەیدەتوانی لەم مافە ڕەوایەی کە لە پێڕەوی حیزبدا هاتبوو کەڵک وەرگرێ.

بەم هۆیەوە کۆمیتەی ئامادەکردنی کۆنگرە بڕیاری دا لە شاری سلێمانی کۆنگرەکە بەڕێوەبچێ. ڕۆژەکانی ٢٦ و ٢٧ ی بەفرانبار هەموو نوێنەران لە ناوەندی حیزب و شوێنەکانی دیکەوە بۆ سلێمانی ڕاگوێزران. ئێوارەی ڕۆژی ٢٧ بە هەڵسەنگاندنی وەزع و زیانێکی کە گومانی تێدا نەبوو لەسەر مەسەلەی لیستەی فیکسی پێشنیاری کاک دوکتور قاسملوو دێتە گۆڕێ، لەسەر داوای نووسەری ئەم دێڕانە و چەند کەسێکی تر لە ئەندامانی ڕێبەری کە لەبەر زیانی دواڕۆژی حیزب موخالیفی ئەم مەسەلە بوون، داوا لە دوکتور کرا کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی بکرێ. پێشنیارەکە وەرگیرا و کۆبوونەوەکە دەستی بەکار کرد، بەڵام تەنیا یەک دوو کەس قسەیان کردبوو کە دوکتور بە بیانووی ئەوەی کاری تایبەتی هەیە، کۆبوونەوەکەی بەجێ هێشت. دوکتور صادقی جێگری لە جێگای دانیشت و بە تێکەڵ و پێکەڵ کردنی باسەکە کۆبوونەوەکەی شێواند و هیچ ئاکامێکی لێ وەرنەگیرا. بەڵام هەر لەو کاتەوە ئەم باسە لە هۆدەکان و کاتی پشوودان لە نێو نوێنەرانی کۆنگرەدا درێژەی هەبوو.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ٢٨ ی بەفرانباری ١٣٦٦ کۆنگرەی هەشتەمی حیزب دەستی بەکارکرد. پێشتر لە کۆمیتەی ئامادەکردن کە دوکتور قاسملووش ئەندامی بوو، بە ئیسراری زۆرەوە بە پێچەوانەی مەیلی خۆم دیاریان کردبووم، هەم ڕاپۆرتی کاری کۆمیتەی ئامادەکردن بدەم، هەم وەک یەکێک لە ئەندامانی هەرە کۆن بە وتارێک کۆنگرە بکەمەوە. منیش بە هەست کردن بە مەترسیی زیانێک کە وێدەچوو لە هاتنە گۆڕی لیستەی فیکسی دوکتور وە حیزب بکەوێ، لە قسەکانم دا زۆرم داواکرد بە وریایی بڕوانە کۆنگرە و هەست بە بەرپرسایەتیی تەواو بکەن و بە زانیاریی تەواو لە سەر هەموو بەشەکانی کاری کۆنگرە هەڵوێست بگرن و بڕیار بدەن !.

ئەو مەوزووعە بۆ هێندێک کەس کە بیریان دەکردەوە، دوکتور وردە حیسابی لەگەڵیان هەیە، زۆری نیگەرانی پێک هێنابوو. سەرەڕای ئەوەش باسەکان لە کردنەوەی کۆنگرە و ڕاپۆرتی کۆمیتەی ئامادەکردن و، ئەو بەشە لە پێڕەو و پرۆگرام کە کۆنگرە پەسندی کرد بگۆڕدرێ تا ڕادەیەک عادی بوو. ڕەخنەی زۆر توندگیرا، لەلایەن هاوڕێیانەوە ئیشارە بە زۆر شت کرا، یەک لەوان وجوودی فەساد لە حیزب دا کە ٧٢ ڕەقەم وەک بەڵگەی زیندوو لە لایەن نووسەری ئەم دێڕانە بەرپرسی کۆمیسیۆنی بازرەسی هاتە گۆڕ و داواکرا با هەتا حیزبەکەمان تووشی شتی زۆر خراپتر نەبووە، بڕیار بدەین پێشی ئەم شتانە بگرین و دژیان لە نێو حیزب دا بەربەرەکانی بکەین ! و هەروەها ڕەخنە لە ڕەفتاری هێندێک لە بەرپرسان

و خودی دوکتور قاسملووش گیرا. سەرەڕای ئەوەش مەسەلەی لیستەی فیکس نە تەنیا لە بەرنامەی کار نەچووە دەر، بەڵکو کاتی دانانی ڕێبەرایەتی نوێ کە بە پێچەوانەی پێڕەوی نێوخۆ لەلایەن دوکتور و چەند کەسی ترەوە دیاری کرابوو، چەند سەعات دەمەتەقە و کێشە و جەدەلی لێ پەیدا بوو.

دوکتور قاسملوو تەنانەت لەگەڵ پێشنیاری زیادکردنی یەک نەفەریش لە لیستە ٢٥ کەسییەکە یا خۆکاندیدکردن و هەڵبژێرانی یەک کەسیش بە دەنگی نهێنی و لەلایەن بەشدارانەوە موافقەتی نەکرد.

هەرچەندە خۆی و چەند کەس بۆ ڕازیکردنی هێندێک لەو ئەندامە لەمێژینانەی ڕێبەری کاریان دەکرد و تەنانەت وشەی کۆمیسیۆنی لێپاڕانەوە لەوێ و لەسەر ئەو مەسەلە هاتە گۆڕێ، نەیانتوانی زۆربەی ئەوان بە تەنیدکردنی ئەم شێوە دیاری کردنەی ڕێبەری ڕازی بکا.

ڕاستە بۆ ئەم شێوە کارە بە شێوەی ئاشکرا و دەست هەڵێنان لە پێشدا دەنگ وەرگیرابوو و بەهەڕەشە و تەقیع و وەعدە و وەعید بەسەر کۆنگرەدا سەپا، دەنگدان بۆ لیستەکە دوای خۆدەرهاویشتنی ٦ کەس لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و دوو کەس لە جێگردکان بە هۆی غەیرە دیموکراتیک بوونی شێوەی هەڵبژاردنەکە، لیستەی فیکس تەنیا بە ١٩ کەسەوە نیوەی بە نیزافەی یەکی دەنگی کۆنگرەی هێنایەوە.

ئەو ٦ کەسە بریتیبوون لە : جلیل گادانی، حسین مدنی، فتاح کاویان، صدیق بابانی، عوسمان ڕەحیمی و ابوبکر راد، هەروەها دوو جێگردەکە بریتی بوون لە مامۆستا گۆران و سەید براییمی کەریمی.

دوای ئەوەی هەر کام لەوانەی سەرەوە قسەیان کرد و دژایەتی دەگەڵ ئەم شێوە دانانەی کومیتەی ناوەندی ناوی خۆیان خەت دا، ئەندامێکی لاوی کۆنگرە کە پێشمەرگەیەکی ئازای هێزی پێشەوا بوو، ناوی "سمایل ئەقدەم" ە، گوتی: " کاک دوکتور ئێمە بڕیارمان داوە ٢٥ کەس ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەبێ، ئێستا بەم ١٩ کەسە کە ماوەتەوە و زۆربەشیان دەناسین کێن و چۆن کار دەکەن، حیزب ئیدارە ناکرێ ". لە وەڵام دا بێ لەبەرچاوگرتنی ئوسووڵ و ئەزەرخوازیی دووبارە لە کۆنگرە گوتی :" هەر بەوەندە کەسانە بەڕێوەی دەبەین ! "

ئەم پێشێلکارییە و ئەو هەموو پێداگرتنە ناڕەوایەی دوکتور و دەوروبەری، حیزبی تووشی زیانێک کرد کە ڕەنگە هیچ کات قەرەبوو نەکرێتەوە. هەر ئەم مەسەلە نادیموکراتیک و نادڵسۆزانەیە کە سەرچاوەی لە غرووری بێ جێ گرتبوو، شلەی بە کاری

کۆنگرە دا و ئەو دڵساردییەی لە نێو بەشدارانی کۆنگرە و دواتریش لەنێو بەدەنەی حیزب دا پێک هێنا کە ناکامی چاوەڕوان نەکراوی لێ کەوتەوە.

مانگێک لە دوای کۆنگرە کار گەیشتە جێگایەک دووبەرەکی لە نێو تەواوی کادر و پێشمەرگە و ئۆرگانەکان دا سازبوو.

بۆ ئەوەی کارەکان بە شێوەیەکی ئۆرگانیک ئەنجام بدرێن، لە کومیتەی شارستانەکانی مهاباد، بانە و داڵاهۆ کە بنکەکانیان لە قسڵان بوو هەرکام بە جیا تۆماریان ئیمزا کرد و وێرای سەردانی کومیتە شارستانەکانی دیکە کە بەدوای چاوپێکەوتنی ئەو هەیئەتەی کۆمیتەکانی قسڵان ئەوانیش تۆماریان ئیمزا کردبوو ناردبوویان بۆ دەفتەری سیاسی و بۆ پێداچوونەوەی وەزعەکە و داوای گرتنی کۆنگرە یا کۆنفرانسێکی نائاساییان بە مەبەستی قەرەبوو کرانەوەی زیانەکانی لیستەی فیکس کردبوو تا بەم شێوە پێشگیری لە شێواوی ریزەکانی حیزب بکەن، بەڵام وەڵامی پێویست بەو داخوازە رەوایە کە تەنیا رێگاچارەی لێکدانەبڕان بوو نەدرایەوە.

بەشێکی زۆر کە بێگومان زیاتر لەوە بوو کە پێڕەوی ناوخۆ دەڵێ، داوای گرتنەوەی کۆنگرە یا کۆنفرانسی نائاسایی کراوە بۆ ئەوەی هەر کەس لە ئەندامانی کۆنگرە یا کۆنفرانس بەشێوەی نهێنی و تاکەکەسی دەنگیان دابە بیێتە ئەندامی رێبەری، بەڵام سەرەڕای ئەوەی دوکتور قاسملوو خۆشی پێی لە هەڵەی خۆی دەنا، قەبووڵ هەر نەکرا.

هەلومەرجەکە زۆر ئاڵۆز بوو، لەهەموو لایەک ناڕەزایەتی بە ئاشکرا خۆی دەنواند. جەماعەتێکی بەرچاو لەچەند ناوەند و کومیتە شارستان و هێزەکان نامەیان نووسیبوو داوای گرتنی کۆنگرەی نائاسایی یا کۆنفرانسیان کردبوو، بەڵام کەس گوێبیست نەبوو چەق و تەفەدا کە نیگەرانی لەسەر شان و لە دەروونی هەموو کادرو ئەندامانی حیزب دا قورسایی دەکرد، بەرپرسایەتی منیش وەرگیرابۆوە و تەحویلی کاک بابەعەلی مێهرپەروەر درابوو، بەڵام من لە بۆلێ هەر لە شوێنی مانەوەی خۆم مابوومەوە.

بەیانی یەکێک لەو رۆژانە دەگەڵ مامۆستا مەلا محەممەدی عوسمانی لەسەر بانی بەشی لێکۆڵینەوەی حیزب کە من پێشتر بەرپرسی بووم پیاسەمان دەکرد و باسی وەزعی حیزبمان دەکرد. بە پێچەوانەی هێندێک کەس کەوا ایان بیر دەکردەوە بیرۆکەی جیابوونەوە لە حیزب لەلای من و مامۆستا مەلا محەممەد دەگۆڕێ دایە بە هیچ شێوەیەک شتی ئاوامان بەبیردا نەدەهات و هەر ئەو رۆژە لە رەوا بوونی بەربەرەکانی و خەباتی ناوەکی حیزب دواین بەڵام بیری جیابوونەوەمان هەر بە مێشکیش دا نەدەهات.

هەر دوای نیوەڕۆی ئەو رۆژە لەلای سکرتاریا هاتنە شوێنم و پێیان راگەیاندم کە دوکتور داوام دەکا. منیش بێ راوەستان چووم بۆ لای کە کاک محەممەدی حەسەن پووریش لەوێ بوو، رێنوێنی کردم بۆ هۆدەی کاک دوکتۆر کە بە تەنیا بوو. پاش ئەحوالپرسی دانیشتین و مەسەلەکەی هێنا گۆڕێ و فەرمووی: کاک جەلیل تۆ بە هیچ شێوەیەک نیگەران مەبە، ئەگەر وەک پێشمەرگەی سادەش بی قەدرت لەلای ئێمە زۆرە و هەر وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی لێت دەروانین. ئێستاش هێندێک وزەوز هەیە و کەسانێک خەریکی ئاژاوە نانەوەن و باسی لەت بوونی حیزب دەکەن بەلام هیچیان پێناکرێ، ئەتۆ گوێت بە قسەی ئەوانە ئەبزوێ چ دەکەن با بیکەن.

منیش وەلامم دایەوە و گوتم: کاک دوکتور جەنابت ناوی دەنێی وزەوز و دەفەرمووی هێندێک کەس، بەلام شتەکە ئاوا سادە و ساکاریش نییە، بیستوومە داوانامەیەک بە ئیمزای زۆر کەس هاتووە بۆ دەفتەر و حەقمن دیوتە کە منی تێدا نیم بەلام داواکە رەوایە، وەک سکرتێرێکی بەرپرس و عادڵ و خاوەن بڕیار حەق وایە گوێ بۆ داخوازییەکانیان شل کەی، نوێنەریان بانگ کەی و بیاندوێنی و رێگە چارەیەکی حەکیمانە بۆ حەللی ئەم موشکیلەی خۆت هێناوتەتە گۆڕێ بدۆزیەوە.

- مەنزوورت فیتنەی لیستی فیکسە؟

- بەڵێ راست مەبەستم ئەوەیە، چەندت لەبەر پارامەوە، عەرزم کردی ئەو کارە لە نێو ئێمە دا ناگونجێ ئێمە وەک هیچ کام لە حیزبە ئەورووپاییەکان نین بەلام بە قسەت نەکردم و ئەو نارەحەتییەی لی کەوتۆتەوە، بە بڕوای جەنابت ئەگەر هەڵبژاردنی ئازاد و دێموکراتیک با، چەند کەس لەوانەی بە لیست داتناون ئەدەبوونەوە ئەندامی کومیتەی ناوەندی؟

- ئێمەش دەبێ فێر بین و وەک ئورووپاییەکان کارەکان هاسان بکەین.

- دوکتور گیان ئەوە پێویستی بە زەمان و چوونەپێشی فەرهەنگی خەڵکەکە و بافتی حیزبەکانەوە هەیە، بە ناشکوری نەبێ هەر ئەوەندەمان کادری خوێندەوار و لێزان هەیە کە دەیان بینین، ئەویش خەریکین بەدەستی خۆمان وەلایان دەنێین.

- رەنگە کارەکە هەڵەش بووبێ بەلام رادێین.

- جا ئەگەر حیزب وەک تەنیا جێگەی هیوای خەڵک لەبەریەک چوو. ئاخر ئێمە بەرگەی ئەم هەموو گێرە و کێشە ناگرین. لە کۆنگرەی ٦دا کورتەباس بوو بە هۆی کشانەوەی زۆر کەس یا دەرکردنی هێندێک پیاوی شایستەی حیزبی، ئەوەش کۆنگرەی حەوت کە دیسان دەستە و بەستەی لێ ساز بوو، هێندێک بە حەق یا بە ناحەق دڵ ئێش

بوون و ڕۆیشتن، ئەوەش کۆنگرەی هەشت کە بەداخەوە بە هۆی هێنانە گۆڕی لیستەی فیکس ناتەبایی زیاتری لێ کەوتۆتەوە.

– ئاخر ئەوانە دەڵێن دەبێ کۆنفرانسی نائاسایی بگرینەوە یا کۆنگرەیەکی دیکە بگری!

– باشە ئەوە ڕێگە حەللێکی ئەساسنامەییە، ئەگەر خوازیار دەگاتە حەددی نیساب بەقسەیان بکە یا چیدی لێرە و لەوێ ئابرووی حیزب ئەچێ. دەزانی دوێنێ رادیۆ کۆمەڵە لەسەر کۆنگرەی ٨ چ حەشرێکی پێ کردووین، ئەگەر لە نێو خۆمان دا ئیشکالەکان حەل کەین باشتر نییە لەوەی خەڵکی دی و دوژمنەکانمان لەسەرمان بدوێن؟

– ئاگادارم کۆمەڵە چی لەسەر گوتووین بەڵام ئێمە سیاسەتی خۆمان بەڕێوە دەبەین. "ئێمە مام جەلال نین کە مەلا بەختیار و ئەوان لەسەر بۆ چوونی جیاواز بگرین".

– باشە کاک دوکتور سەرەڕای ئەوەی جەنابت لە بەرنامەرێژی درێژخایەن دا پسپۆری و ئاگاشت باش لە وەزعی حیزب و بەتایبەتی بیانوو گرتنی دوژمن هەیە بۆ لەو لێکدانەوەدا دەقیق ئەبووی، هیچ بیرت لەوە کردۆتەوە کە لە ڕێبەرایەتی ئێستای حیزب کە بە لیستی فیکس هاتۆتە ئاراوە نوێنەری ٤٩٪ ی ئەندامانی حیزبی تێدا نییە، چ سیاسەتێکی مەنتیقی و عادلانە نیزن دەدا لە حیزبێکی دێموکرات دا ڕادەیەکی ئاوا زۆر نوێنەری هەڵبژێردراوی خۆیان لە ڕێبەری دا نەبێ؟ من پێم وایە هیچ حیزبێکی دێموکرات نە شتی ئاوا دەکا، نە ئەگەر بیکا بەدەنەی ئەو حیزبە قەبووڵی دەکا.

– ئەوە کارێکە کراوە لەوانەیە لە داهاتوودا قەرەبوو بکرێتەوە.

– پێم وایە درەنگ دەبی، حیزب زۆر زیان دەکا، کادر و پێشمەرگەی زۆر چالاکمان لەدەست دەچن. بۆ پێت وابوو ئەو دۆستە تازانەی حیزبی لە من بۆتۆ و حیزب دڵسۆزترن. ئەی بۆ ئەو هەمووەمان هاوار کرد بە قسەت نەکردین، لە هەڵبژاردنێکی ئازاد رەنگە ٢ کەسی ئامۆناسبیش هەڵبژێردرێن، بەڵام بە هۆی لیستەی فیکسەوە و بە ناوی دژایەتی دەگەڵ لیستە، زۆر کەس لە ئەندامی ڕێبەرایەتی وازیان هێنا و زۆری دیکەش هەبوون کە خەڵک لە هەڵبژاردنی ئازاد دا دەنگی دەدانێ کە لە بەشێک لەوانەی ئێستا بە لیستەی فیکس داندراون بۆ حیزب بە کەڵکتر بوون.

– جا ئەوە جارێ ئاوایە تا کۆنگرەیەکی دی بزانین چۆن دەبێ.

– کاک دوکتور ئەو بێمەوبالاتییە بە دەنگ و داخوازی ئەو هەموو کادر و پێشمەرگەی حیزب زیانی زۆری دەبێ و، ڕەنگە بەم زووانە قەرەبوو نەکرێتەوە. بۆیە منیش پێشنیار

دەکەم بۆ ئەوەی هەڵەی هێنانی لیستەی فیکس زووتر قەرەبوو بکرێتەوە کۆنفرانسێک پێک بێنە و رێبەرایەتییەکەی تەرمیم کەوە با ئەو کادرە باشانەش دڵیان نەیەشێ.
- ئەوە ناکرێ و نابێ.
- جا کاک دوکتور با عەرزت بکەم ئەتۆ ئەگەر هەر بۆچوونی خۆت مەنزووربێ و گوێ نەدەیە قسەی حیسابی خەڵک ناکامی زۆر نالەباری دەبێ، بۆیە ئەگەر هەر ناوا بڕوا منیش لە چوارچێوەی ئەم شێوە سیاسەت و ئیدارە کردنەی حیزب دا خۆ نابینمەوە، هەر چەند وەک ئەوەی وایە چەند ساڵ خەریکی دروست کردنی خانووبەرەیەک بووبم و لە پڕڕا بەسەرم دا خراپ بێ، بەڵام ئەمنیش ئەوەم پێ قەبووڵ ناکرێ و ماڵئاواییت لێ دەکەم.
من هەستام و کاک دوکتوریش هەستا، لە حاڵێکدا هەردووکمان لەوپەڕی ناڕەحەتی دابووین تۆقەیەکی ساردمان کرد و لێک جیا بووینەوە. ئەوە دوایین دیدار و چاوپێکەوتنم بوو دەگەڵ کاک دوکتور و بە داخەوە هەرگیز ئەمدیتەوە، چەند ساڵ دواتر لە سەفەری پاریس چوومە سەر گڵکۆکەی و چەپکە گوڵم پێشکەش کرد.
سێ چوار رۆژ دوای ئاخرین دیدارمان ماڵئاواییم لە بۆڵێ و ئێنزی کرد و بەرەو سەنگەسەر و قەڵادزێ کە هێندێک لە هاوڕێیان لەوێ گیرسابوونەوە وەڕێ کەوتم.
پاش کۆنگرەش رەفتاری زۆر ناحەز و نادیموکراتیک بەرامبەر بەو هاوڕێیانە دەستی پێکرد و تارادەیەک بە گیرانیش هەڕەشەیان لێدەکرا. بە پێچەوانەی ئەو عیبارەتە کە فەرمووی! " ئێمە مام جەلال نین مەلا بەختیار و ئەوان لەسەر بۆچوونی جیاواز بگرین"، دوای ماوەیەک لە ئێعلامی هەڵوێستی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، لە راگەیەندراوێکی سیاسی ـ نیزامی دا بە جاش لە قەڵەم دراین و حوکمی شەڕیشیان بە دژماندا.
بەتایبەتی دوای ئەوەی کە بەچاوی سووک تەماشای ئەم هەواڵانەکرا و دوکتور لە سەرکەوتنی خۆی دڵنیابوو و، دیتی کە لیستەی فیکس بەم شێوەیە سەرکەوت. غافڵ لەوەی حیزب چ زیانێکی گەورەی پێکەیشت، بە ئاشکرا بەپێچەوانەی هەموو نوسوولێک دەستکارییەکی زۆر ناشەرعی پێڕەو و پرۆگرامیان کرد و دەرکەوت کە پێشێلکارییەکە گەیوەتە لەرزێنی نانی شتە پەسندکراوەکانی کۆنگرەش.
لە کۆنگرەدا تەنیا خاڵێک کە لەبەرنامەدا هاتەوە جێی خۆی و لە کۆنگرەی چوار لە ساڵی ١٣٥٨ بە هۆی لە ئارادا بوونی وتوویژ لەگەڵ رێژیمی خومەینی لە بەرنامە سڕابۆوە، ئەویش بریتی بوو لە " جیایی دین لە دەوڵەت ". بەڵام بە دوای کۆنگرەدا ٢٩ شوێن لە وشە و رستەکان ئاڵوگۆڕ کرابوو. کە ریزەکەی لەلاپەڕی دواییدا دەکەوێتە بەر چاوتان.

کاتێک زۆر لەو هاورێ نارازییانە بە پێچەوانەی ویستی دەروونیی خۆیان، هەر لە لایەن دوکتورقاسملوو و رێبەرییە هەماهەنگە داندراوەکەی مەجبوور کران یەک یەک و دوو دوو نەوێ بەجێ بێڵن و لە شوێنێکی دی تێکۆشانی حیزبییان درێژە بدەن، دوکتور کە تازە هەستی بەم برینە کردبوو، نامەیەکی چەند لاپەڕەیی بۆ کاک فەتاح کاویان نووسیبوو، لەوێ دا لە روانگەی خۆیەوە هێندێک شتی مەنتقی هێنابوو لە ئاخری دا نووسیبووی ئەگەر بێنەوە دەستتان ماچ دەکەین، بەڵام بەداخەوە زۆر درەنگ ببوو، ئەوانەی نامەکەشیان هێنابوو و پێشتر ئەندامی هەڵبژێردراوی رێبەری کۆنگرەی حەوت بوون (کاک نەبی قادری و مامۆستا گۆران) ئەگەڕانەوە، هەر لەم لا مانەوە و تێکۆشانی حیزبیانەی خۆیان درێژە پێدا، ئەمەش کورتەی نامەکەیەتی:

## برای بەڕێز کاک فەتاح

١٣٦٦/١٢/١٢

### پاش سڵاوێکی گەرمی برایانە

هێندێ دەنگۆ لەسەر تێکۆشانی ئێستای ئەو چەند هاوڕێیە کە لە کۆمیتەی ناوەندی دا ئەماون بڵاوبۆتەوە کە هیوادارم راست نەبێ، بەڵام چونکە چەند کەس لەو هاوڕێیانە کە بنکەی دەفتەر و جێگای کاری خۆیان جێهێشتووە و ئێستا لە قەڵادزێ کۆبوونەوە بە کینایە یا بە ئاشکرا رایان گەیاندووە کە دەیانەوێ لە حیزب جودا ببنەوە یا حیزبێکی دیکە ساز بکەن (کە ئاواتم ئەوەیە ئەم قسەیە هەر دەنگۆ بێ) بە پێویستی دەزانم ئەزەری خۆمت بۆ بنووسم. بە ناوی هاوکاری و دۆستایەتی چەند ساڵەمان پێم وایە مافی ئەوەم هەیە کە قسەکانی خۆم بە سەراحەت بکەم و دڵنیاشت دەکەم کە ئەم قسانە تەنیا و تەنیا لەڕووی دڵسۆزییەوەیە. دیارە ئەگەر جودابوونەوە و حیزب دروست کردنێک لە گۆڕێ دا نەبێ هەر وا بزانە ئەم نامەیەت پێ نەگەیشتووە...

... بۆچوونەکەتان سیاسییانە نەبوو، کوردە ناموسییانە بووە... بەڵام ئەزەری خۆم لەسەر سازکردنی حیزب و یا رێکخراوێکی دیکەش عەرز بکەم. ئەگەر کەسانێک هەن کە دەیانهەوێ رێکخراوێکی دیکە بە ناوێکی دیکە تەشکیل بدەن دیارە ئازادن، بەڵام حەقەن ئەوەیان لە بیرە کە ئەمیری قازیش رێکخراوی دروست کرد. باشە چی بەسەر هات؟ پێم

وایە ئەو کەسانە دەبێ ئەوەندە عەقڵیان هەبێ کە حیزبێکی دێموکراتی دیکە دروست نەکەن چونکە حەتمەن چارەنووسی تاقمی حەوت کەسییان لە بیرە. لە هەر حاڵ دا هیوادارم ئەو کەسانە کە رێکخراو ساز دەکەن ئەوەیان لە بەرچاو بێ کە هەر رێکخراوێکی دژی حیزبی دێموکرات بێ، دوژمن شاد و دۆست خەمبار دەکا. سەرەڕای ئەوە سەریش ناکەوێ. مێژووی سالانی رابردوو چەند جار ئەو راستییە نیشان دەدا.....

... بەڵام لە مەسەلەکە خراپ حاڵی بوون، یان بێ ئەوەی خۆیان پێیان خۆش بێ زیاتر لەبەر کوردە ناموسی و قەول و قەرار تێ کەوتوون. هەق ئەوەیە ئەو هاورێیانە فیکر لە ناکامی کردەوەی ئەمڕۆی خۆیان بکەنەوە و ئەگەر لە نیوەی رێگاش بگەڕێنەوە هەر قازانجیان کردووە. بۆیە ئەم نامەیە خەتاب بە تۆ دەنووسم چونکە تۆ یەکێک لەوانەی و هەروەها تا ئێستا بە دڵسۆزی ئەو حیزبەم ناسیوی و چەندین ساڵیشە زەحمەت دەکێشی. بەڵام دەگەڵ ئەوە هەرکەس لەو هاورێیانە (بێ ئیستسنا) بگەڕێتەوە و هاوکاری بکا وەک لە کوردەواری دا باوە دەستی ماچ دەکەین. بۆیەش پێم ناخۆش نییە هاورێیانی دیکەش ئەم نامەیە بخوێننەوە. ئەگەر کەسێکیش رێگایەکی دیکەی گرتە پێش ئەوە گلەیی لەسەر خۆیەتی.

من ان چه شرط بلاغ است با تو میگویم
تو خواه از سخنم پندگیر خواه ملال

**دیسان سلار**
**برات عبدالرحمان قاسملو**

دیارە ئەگەر ئەم دیارییە تازەش نەبایە، کە هەتا ئێرەش نە لەگەڵ پێڕەوی نێوخۆ دەگونجێ و نەلەگەڵ داب و نەریتی کوردەواری و نە لەگەڵ کردەوەی حیزبێکی دێموکرات کە خەبات و سوننەتێکی زیاتر لە نیو سەدەی خۆی هەیە، دەگونجێ، وە ئەگەر دوای کۆنگرەش ئەم کار و کردەوە نالەبارانە نەکرابان، ناکامی کۆنگرەی هەشت و وەزعی حیزب لە روانگەی نێوخۆیی و دەرەوە لە جێگایەکی دیکە دەبوو. هیچ دوور نەبوو بەم ئاڵوگۆڕە بەرچاوانەی جیهانی و ناوچەیی کە لەم چەند ساڵەدا هاتوونە پێش توانیبامان دوژمنیش بە چۆک دا بێنین.

سەیرتر ئەودیە کە دوای هەڵوێست گرتنی ئەو هاوڕێیانە کە لە فەسڵی داهاتوو دا باس دەکرێ، هەر ئەو کەسانەی دوێنێ دەستیان ماچ دەکردن، بە پێچەوانەی هەموو ئوسووڵی ئینسانی و ئەخلاقی بە خائین و جاش لەقەڵم دران و ئیعلامی شەڕیان لەگەڵ کرا و لە پاسدار و جاشی خومەینی خراپتر دەخرانە بەرچاوی خەڵک و کادر و پێشمەرگەی خۆیان. زۆر جێگای داخە بۆ هێندێک لەم هاوڕێ شۆڕشگێڕانە کە تاوانیان تەنیا دژایەتی لەگەڵ پێشێلکاری مافەکان و رەفتاری غەیرە دێموکراتیک بوود، بە پێچەوانەی ئەودی لە کاتی خۆیدا گوتبوویان ئێمە ودک هێندێک، لەسەر بۆچوونی جیاواز کەس ناگرین، بەندیخانە، ئەشکەنجە، ئیعدام و شەڕ پێ فرۆشتن و کوشتنی ناڕەواش بۆ ماودی چەند ساڵ هاتبوود گۆڕێ. با بۆ مێژوو بمێنێتەود لەسەر ئەم بۆچوونە نادروستانە دوو بەش لە ئەندامانی حیزب کە بەشێکی زۆر لە تەمەنیان لەیەک سەنگەری هاوبەش دا دژی دوژمنی هاوبەش شان بە شان شەڕیان کردبوو، بە بڕیاری یەک لایەنەی بەڕێوەبەری ئەو کۆنە هاوڕێیانە کە لە خۆ بەزل زانییەود سەرچاودی دەگرت، نەیاندەتوانی یەکتر بدوێنن. با ئەوەش لە سینەی مێژوودا هەر بمێنێ کە لەم شەڕەدا کە بەسەر حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ دا سەپابوو، بەو ئەندازەی لە شەڕ لەگەڵ دوژمندا شەهیدیان داود، لە لایەن هاوحیزبییەکانی پێشتری خۆیان بە داخەود لەسەر پێشنیاری دوکتور خۆی و پەسندی پلینۆمیان شەهید کراون کە رادەیان لە بیست کەس زیاترە.

**له کۆنگرەی هەشت دا بڕیارنامەیەک بەشێوەی خوارەوە پەسندکرا:**

«کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران وێڕای پەسندکردنی یەکدەنگی ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی کە ئەرکەکانی حیزب تا کۆنگرەی داهاتوو دیاری دەکا، لەسەر ئەم خاڵانە پێ دادەگرێ:

١- درێژەدانی شەڕی ماڵ وێرانکەری ئێران و عێراق لە لایەن ڕێژیمی کۆماری ئیسلامییەوە مەحکووم دەکرێ. حیزبی دێموکرات لایەنگری ئەوەیە کە بڕیاری ٥٩٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایش بێتەدی، ئاشتی و دۆستایەتی لە نێو گەلانی دوو وڵاتی دراوسێ دا سەرلەنوێ جێگیر بێتەوە.

٢- مافی گەلی فەلەستین لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆی و پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە خاکی نیشتمانیی خۆیدا مافێکی ڕەوا و دێموکراتییە. لەم پەیوەندییەدا ڕاپەڕینی کۆمەلانی خەڵکی فەلەستین لەسەر خاکی نیشتمانە داگیرکراوەکەیان جێگای هاودەردی و پشتیوانییە. حیزبی دێموکرات «ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین» وەک نوێنەری ڕاستەقینەی داخوازە ڕەواکانی گەلی فەلەستین دەناسێ.

٣- خەڵکی ئەفغانستان مافی ئەوەی هەیە بە ئازادی چارەنووسی خۆی دیاری بکا. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە هەم ئەرتەشی سۆڤیەتی، ئەفغانستان بەجێ بێڵێ و هەم هاوکات لەگەڵ ئەوە دەوڵەتە سەرمایەدارییەکانی ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەمریکا و دەوڵەتە کۆنە پەرستەکانی ناوچەکە لە یارمەتی دان و پشتیوانی کردنی تاقمە چەکدارەکانی دژی حکوومەت دەست هەڵگرن.

٤- ڕەوتی چارەسەرکردنی گیر وگرفتەکان لە ڕێگای ئاشتیخوازانەوە لە ئەمریکای لاتین لە هەموو بارێکەوە جێی پشتیوانییە و، سیاسەتی دەست درێژکەرانەی دەوڵەتی ئەمریکا بۆ کار و باری نێوخۆی نیکاراگوئە و وڵاتانی دیکەی ئەم ناوچەیە مەحکومە.

٥- لابردنی هەموو جۆرە چەکێکی ئەتۆمی و شیمیایی و لەنێوبردنی یەکجارییان پێویستییەکی مێژووییە. هەر لەم پێوەندییەدا ڕەوتی ئاشتی و سوڵحی جیهانی بە گشتی تەئید دەکرێ.

٦- ڕەوتی دێموکراتی کردنی دەسەلاتی سیاسی کە لە هێندێک وڵاتی جیهانی سێهەم دا وەبەرچاو دەکەوێ، وەک دیاردەیەکی گرینگی دوا ساڵەکانی چەرخی بیستەم جێگای پشتیوانییە.

٧- رەوتی دێموکراتی کردن لە یەکیەتیی سۆڤیەت و ولاتانی دیکەی سوسیالیستی دا بێگومان شوێنێکی زۆر لە بار هەم لەسەر گەشەکردنی سوسیالیزم و، هەم لەسەر رەوتی گشتیی سیاسەتی نێونەتەوەیی دادەنێ. لەم پێوەندییەدا حیزبی دێموکرات کە لە کۆنگرەی شەشەمی خۆیەوە هاتۆتە سەر ئەو بڕوایەی سوسیالیزم لە دێموکراسی جیا ناکرێتەوە و دێموکراسی بە سوسیالیزمەوە کامڵ دەبێ، جارێکی دیکە «سوسیالیزمی دێموکراتی» وەک سەنتێزی دێموکراسی و سوسیالیزم بەتەواوی تەئیید دەکا.

٨- بەلەبەرچاوگرتنی سیاسەتی حیزب سەبارەت بە پێویستی بڕیاردانی سەربەخۆ و، بە راگرتنی هەڵوێستی ئوسووڵی رەخنە گرانە، بۆ پەرەپێدان و پتەو کردنی پێوەندیی حیزب و رێکخراوە پێشکەوتنخوازەکانی جیهان بە گشتی و، ولاتانی سوسیالیستی بە تایبەتی، هەوڵی بەردەوام بدرێ.

٩- لە پێوەندی لەگەڵ رێکخراوەکانی کوردستان، سیاسەتی پشتیوانی لە بزووتنەوەی میللی ـ دێموکراتی نەتەوەیی کورد و یارمەتیدانی هێزە دێموکرات و شۆڕشگێڕەکانی کورد تەئیید دەکرێ. کۆنگرە بە بەرێوەبەرایەتیی حیزب دەسپێرێ کە: بەلەبەرچاوگرتنی ئەسڵی «دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوخۆیی»یان دا لەم بارەوە هەوڵێکی پتر بدا.

١٠- لە چوارچێوەی رێژیمی خومەینی دا هیچ کام لە داخوازە سەرەکییەکانی خەڵکی کوردستان، یانی دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان بەدی ناکرێ - بۆیە دروشمی حیزب کە بریتییە لە رووخاندنی ئەم رێژیمە و هێنانە سەرکاری رێژیمێکی دێموکراتی - هەر لە جێی خۆیەتی.

١١- خەباتی چەکدارانە شێوەی ئەسڵیی خەبات بۆ رووخاندنی رێژیمە. بەلام پەرەپێدانی هەموو شێوەکانی دیکەی خەبات و گرێدانیان بە خەباتی چەکدارانە و وەدی هاتنی هەل و مەرجی رووخانی رێژیم ئامادەتر دەکا.

١٢- پێک هێنانی بەرەیەکی دێموکراتی، ئەرکێکی پێویست و مێژووییە. هەر بۆیە هەوڵدانی تا ئێستای حیزب بۆ پێک هاتنی بەرە تەئیید دەکرێ و، بە پێویست دەزانرێ کە ئەو هەوڵدانە لە داهاتووش دا درێژەی پێ بدرێ.

بێگومان دەرچوونی بڕیارنامەیەکی دوازدە خاڵیی ئاوا، نیشانەی پڕ نێوەرۆک و هەمەلایەنە بوونی راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەیە و، چونکە بە جیاواز چاپ و بلاوکراوەتەوە، ئێمە لێرەدا لە هێنانی راپۆرت چاو دەپۆشین.

پێویستە بگوترێ مەسەلەی لیستەی فیکس وەزعی ئاسایی نەهێشتبووە هەرچەند

بڕیارنامەکە زۆر شتی تێدا هاتووە، بەڵام بە جارێک خۆی لە موشکیلاتی ناوخۆی حیزب دزیوەتەوە.

دیارە هێندێک پەیامیش بۆ کۆنگرە هاتبوو کە ئەوانیش هەر بە جیاواز چاپ کراون، ئێمە تەنیا بە هێنانی ناوی خاوەنی پەیامەکان لە دەرەوەی وڵات قەناعەت دەکەین :

١- کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کاری سویس.
٢- ڕێکخراوی پزیشکانی جیهان.
٣- حیزبی سوسیالیستی فەڕەنسا.
٤- یورگن نوبرگ لە سوئید.
٥- ڕێکخراوی ئازادیی کار.
٦- مهدی خانبابا تهرانی.
٧- دوکتور م. پویا لەلایەن مامۆستایانی زانستگەکانی تاران.
٨- «تێکۆشەر» بڵاوکراوەی کوردەکانی دانیشتووی بلژیک.
٩- حیزبی کۆمۆنیستی چەپی سوئید.
١٠- فیدراسیونی ئەنجوومەنەکانی کوردستان لە سوئید.
١١- حیزبی کومونیستی بلژیک.
١٢- هنس هاوزیر سەرۆکی ئەنجوومەنی دۆستانی گەلی کورد لە ئوتریش.
١٣- ژیرار شالیان.

# بەشی دووهەم

بۆچوونە چەوتەکانی ئەو هاوڕێیانە بەتایبەت لە بواری سیاسەتی نێوخۆی حیزب دا بە هێنانەگۆڕی لیستەی فیکس لە کۆنگرەی هەشتەم دا و پێداگرتن لەسەری بەم شێوە کە پێشتر باسکرا، هەروەها وەڵام نەدانەوە بە ویستی زۆربەی کادر و پێشمەرگەکان بۆ پێکهێنانی کۆنگرەی نائاسایی، یا کۆنفرانس کە پێڕەوی ناوخۆ بۆ هەلومەرجی ناوا حوکم دەکا و داوای ئەو مافەی بە رەوا داناوە، ئاشکراتر لە جاران خۆی نواند.

بەتایبەتی دوای دەستکاری پێڕەو و پرۆگرامی حیزب و هێندێک رەفتاری نالەبار بەرانبەر بەم هاوڕێیانە هیچ رێگەیەکی دیکە جگە لە هەڵوێست گرتن بۆئەم دڵسۆزە راستەقینانە نەمابوو.

بە پێچەوانەی هێندێک قسەی ناراست کە لەم بوارەدا گوتراون و نووسراون، ئەو بەشە لە هاوڕێیانی حیزبی بەر لەم رووداوانە نەک بە هیچ شێوەیەک باسی جیابوونەوە و هەڵوێست گرتنیان نەکردبوو، بەڵکو ئەو کارە هەر بیریشی لێ نەکرابۆوە. بەڵام ئەوەی راستی بێ باس لەسەر چلۆنایەتی دانانی رێبەری بە شێوەی لیستەی فیکس و وەڵام نەدانەوە بە داخوازی بەشی زۆری کادر و پێشمەرگەکان لەسەر گرتنەوەی کۆنگرە یا کۆنفرانس بە تەواوی حیزبی شڵەژاندبوو.

ئەم بارودۆخە بەشێکی بەرچاو لە هاوڕێیانی رێبەرایەتی و کادرەکانی سەروی حیزبی هێنایە سەر ئەو بڕوایە کە بۆ رزگاری حیزب و درێژەدانی خەبات و موبارەزە بە شێوەیەکی دروست و بۆ پاراستنی پرەنسیپەکانی حیزبی و تەشکیلاتی و هەروەها دژایەتی لەگەڵ هێندێک کردەوە و سیاسەتی چەوت هەڵوێست بگرن.

ئەنجامی ئەم بیروبۆچوونە گەیشتە ئەو جێگایەی کە رۆژی یەکی خاکە لێوەی ۱۳٦۷ پازدە کەس لە ئەندامانی رێبەرایەتی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی حەوتەم لە راگەیەندراوێکی " ۱۰ دە " ماددەیی دا هەڵوێستی خۆیان دەرهەق بەم رەوشتە نادیموکراتیکە و باقی سیاسەتەکانی حیزب دەربڕی و داوایان لە کادر و پێشمەرگە و ئەندامان و لایەنگرانی حیزب و هەروەها دڵسۆزانی بزووتنەوە کرد کە لەم هەڵوێست گرتنە پشتیوانی بکەن. ئەمەش دەقی راگەیەندراوەکەیە.

**هاونیشتمانە بەڕێزەکان،**

**خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان،**

**ئەندامان، کادر و پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران،**

**ڕێکخراو و حیزبە شۆڕشگێڕەکانی ئێران**

نۆ ساڵ لە خەباتی خوێناویی گەلی زۆرلێکراوی کورد دژی ڕێژیمی کۆنەپەرست و دژی گەلی کۆماری ئیسلامی تێ دەپەڕێ. لەو ماوەیەدا دەیان هەزار کەس لە خەڵکی کوردستان و زیاتر لە چوار هەزار کەس لە پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزب لە ڕێگای دیفاع لە ئازادی و دێموکراسی دا گیانیان بەخت کردووە. هەر لەو ماوەیەدا دەیان هەزار کەس لە ڕۆڵە ئازا و خەباتگێڕەکانی گەلانی دیکەی ئێران لە خەباتی ڕەوای خۆیان دا دژی کۆنەپەرستیی دەسەڵاتدار شەهید بوون.

لە سەرانسەری ئەو ماوەیەدا، پێ بە پێی ڕەوتی خەباتی قارەمانانەی گەلی کورد، دوکتور قاسملوو بێ سەرنج دان بە ئامانجە بەرزەکانی حیزب و کارتێکردن و ڕێنوێنییەکانی لادەرانە و ڕاست ئاژۆیانەی ئاغای صادقی شەرەفکەندی (سەعید بەدەل) هێندێک سیاسەتی لە نێو حیزب و دەرەوەی حیزب دا بەڕێوەبردووە کە ئامانجی دواڕۆژیان لەو سیاسەتانە سازان لەگەڵ کۆڕ و کۆمەڵە ئیمپریالیستییەکان و دوورکەوتنەوە لەبەرەی شۆڕش، چ لە ڕادەی ئێران و کوردستان و چ لە ڕادەی جیهانی دا بووە.

بەکارهێنان و درێژەدانی ئەم سیاسەتانە لەنێو حیزب دا لەلایەکەوە لەگەڵ ئیعتیراز و بەرهەڵستی ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتری بەدەنەی حیزب و کادرەکانی پلەی سەروو و بەشێک لە ڕێبەری بەرەوروو بووە و لە لایەکی دیکەوە توندتر بوونی مەیلی دیکتاتۆرانە و دژی دێمۆکراتیکی لە لایەن ئاوبراوانەوە بە دواوە بووە.

ڕەنگدانەوەی ئەم سیاسەتە ڕاست ئاژۆیانەی فراکسیۆنی شەرەفکەندی و قاسملوو بۆتە هۆی تەریک کەوتنەوەی نیسبیی حیزب لە نێو ئۆپۆزیسیۆنی شۆڕشگێڕی ئێرانی و لە دەرەوەی ئێرانیش بۆتە کۆسپی سەر ڕێگای دامەزرانی پێوەندیی ئوسوولی لەگەڵ ولاتانی سوسیالیستی.

ئەم فراکسیۆنە بۆ خەفەکردنی دەنگی هەر چەشنە ئیعتیرازێک دژی ئەو سیاسەتە، لەهەر قۆناغێک دا بە بیانوویەک دەستی کردووە بە پالاوتنی بێ جێ و بێ مانا لە نێوخۆی حیزب دا کە لە ئاکامی ئەو پالاوتنانەدا ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامانی وشیار و خەباتگێڕ " پاسیو" بوون یان لە حیزب دەرکراون. بە شێوەیەک کە بۆ وێنە لە کۆنفرانسی پێش کۆنگرەی شەشەمی حیزب لە کۆمیتەی سەردەشت زیاتر لە سەد کادر بەشدار بوون، بەڵام ئێستا بێجگە لە ڕادەیەکی کەم کە ژمارەیان لە قامکی دەستان تێ ناپەڕێ کەسی

لێ نەماوەتەوە. زۆربەی کۆمیتە شارستانەکان و ئۆرگانەکانی دیکەی حیزبیش هەر وەزعێکی ئەوتۆیان هەیە.
ڕەوالەتێکی دیکەی ڕێبازی لادەرانەی ئەم فراکسیۆنە لە مەیلی سازشکارانە و وتوویژخوازانە لەگەڵ ڕێژیمی کۆنەپەرست و دژی گەلیی کۆماری ئیسلامیدا خۆ دەنوێنێ. بوونی مەیلێکی ئەوتۆ جار بەجار بۆتە هۆی پێکهاتنی خوارو ژوورکردن لە هەڵوێستی سیاسی حیزب لە بەرامبەر ڕێژیم دا و لە هەر قۆناغێک دا هێندێک گومان و دوو دڵی سەبارەت بە ماهییەتی کۆنەپەرستانە و نامانجە دژێوەکانی ئەو ڕێژیمەی پێکهێناوە.
بێ بە پێی تێپەڕبوونی زەمان و ئاشکرابوونی هەرچی زیاتری ئامانجە واقیعییەکانی ئەم فراکسیۆنە و بەرزبوونەوە و پەرەگرتنی ئیعتیراز و بەرهەڵستی کردن لەگەڵ ئەم ڕێبازە سیاسییە لە لایەن بەدەنەی حیزبەوە، پیلان گێڕان و کەین و بەینی ئەم فراکسیۆنەش بەربلاوتر و توندتر بوو تا ئەو جێیەی کە بە پێچەوانەی پێڕەوی نێوخۆی حیزب بە ئاشکرا نفوزی خۆیان لە شێوەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی هەڵبژێردراو بۆ " کۆنگرەی هەشتەم" لە کۆنفرانسی ئۆرگانەکان دا بەکار هێنا.
سەرەنجام لە "کۆنگرەی هەشتەم"دا هەڵسووڕێنەرانی ئەم فراکسیۆنە بە لەژێرپێنانی شێوەکانی ئاسایی و دێموکراتیکی هەڵبژاردن لەنێو حیزب دا، نوێنەرانی "کۆنگرە"یان لە مافی هەڵبژاردن و هەڵبژێرانی ئازادانە بێ بەش کرد. ئەوان بە فێڵ و تەڵەکەی جۆراوجۆر، وەک تەماع وەبەرنان و قەولی پلە پێدان بە ئەم و ئەو و هەڕەشەکردن لە هێندێک لە نوێنەران، توانیان لیستێکی " فیکس " لە کەسانێک کە پێشتر لەبەر چاو گیرابوون بەسەر نیوەی نوێنەران دا بسەپێنن و زیاتر لە ٪ ٤٩ ی دیکەی نوێنەران لە مافی هەڵبژاردن و هەڵبژێران بێ بەش بکەن.
سەیر ئەوەیە کە ئەم شێوە بەناو هەڵبژاردنی نوێنەرایەتییە کە دوکتور قاسملوو خۆی ناوی " فیتنە "ی لە سەر دانا، لە حاڵێکدا بەڕێوەچوو کە زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هەم لە پلێنۆمی پێش "کۆنگرەی هەشتەم" و هەم لە جەرەیانی " کۆنگرە " دا بە هێنانەوەی بەڵگەی بەهێز و شیاو لە بەرامبەری دا ڕاوەستان و زۆر جار ناکامی خراپ و زیان هێنەری شێوەیەکی ئەوتۆ لە " هەڵبژاردن"یان دەست نیشان کرد.
دوایی هاتنی "کۆنگرەی هەشتەم" بە هیچ جۆر بە مانای بڕانەوەی ئیعتیراز و دەربڕینی ناڕەزایەتی نەبوو، چونکە دەکرێ بڵێین دەست بەجێ دوای تەواوبوونی " کۆنگرە " زۆربەیەکی بەرچاو لە ئەندامان و کادر و پێشمەرگەکان چ بە وتە و چ بە ناردنی بڕیارنامە لە ڕێگای ئۆرگانەکانی خۆیانەوە داوای پێک هاتنی کۆنگرەی نائاساییان کرد. بەلام ئەگەر چی ژمارەی ئەو کەسانە زیاتر لە ڕادەی پێش بینی کراو بوو کە لە پێڕەوی نێوخۆ دا

بۆ پێک هێنانی کۆنگرەی نائاسایی دیاری کراوە، فراکسیۆنی ناوبراو گوێی پێ نەدا و لە ناکام دا بە تەواوی دەرکەوت کە ئوسوولی پێڕەوی نێوخۆ لەلای ئەوانەوە بە ئەندازەی پوولێکی رەش بایەخی نییە.

بەکورتی ئەو فیتنەیەی دوکتور قاسملوو هەڵی نایبساند مەسەلەیەک نییە کە لە "کۆنگرە" دروست بووبێ، بەڵکو بێگومان ناکامی سیاسەت و کردەوەی خۆی و دەست و پێوەندەکانی لە ساڵەکانی رابردوو دا بوو. لەو ماوەیەدا ئەوان بە برەو پێدانی شێوەی فەردپەرستی، باندبازی و دەستە بەندی، پێک هێنانی رایەڵەی جاسووسی و دووزمانی لەنێو حیزب دا، تیرۆری شەخسیەت و پەردەدان بە دەنگۆ دژی موخالیفان، شکاندنی بەردەوامی ئوسوولی پێڕەوی نێوخۆ، پێشێل کردنی دێموکراسی و دامەزراندنی دیکتاتۆری لە نێو حیزب دا، سەرکوتکردنی عاتیفەی ئینسانی لە رووبەڕوو بوون لەگەڵ ئەندامان، کادرەکان و پێشمەرگەکان، هاندانی مەیلی کۆنەپەرستانە و رەدکردنەوەی ئوسوڵ و بایەخەکانی پێشکەوتنخوازانە و.. هتد، وەزعێکی ئەوتۆیان پێکهێنا کە حیزبی ئێمەیان خستە مەترسی لێکهەڵوەشان.

بە لەبەر چاوگرتنی ئەم راستییانە و بە هەست بە بەرپرسایەتی کردن لە بەرامبەر جوولانەوەی گەلی کورد و ئامانجی حیزب (دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان)دا کە هەزاران رۆڵەی فیداکاری گەلەکەمان بۆ وەدیهێنانی گیانیان فیدا کردووە، ئێمە ئەندامانی دەفتەری سیاسی، ئەندامانی ئەسڵی، جێگر و موشاویری کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ وەلانانی فراکسیۆنی شەرفکەندی ـ قاسملوو، ئەو ئەسڵێنەی خوارەوە وەک رێبازی بنەڕەتیی سیاسەتەکانی حیزب رادەگەیەنین، ئەو ئەسڵانەی کە بەهۆی کردەوەی چەوتی فراکسیۆنی ناوبراو زۆر جار و لە زۆر بارەوە دەستکاری و پێشێل کراون. پشتیوانیی بێ دریغی هەموو ئەندامان، کادر و پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزب و هەروەها پشتیوانیی هەمو حیزب و رێکخراوە شۆڕشگێڕەکان و هەموو ئەو کەسانەی دڵیان بۆ ئازادی و دێموکراسی لێ دەدا، سەرکەوتنی ئێمە لە گەیشتن بەو ئامانجانە و وەدیهێنانی ئەو ئەسڵانە خێراتر دەکا:

١- دارشتنەوەی بناخەکانی ئوسوولی دژی ئیمپریالیستی لە حیزب دا و وەلانانی سیاسەت و مانۆرەکانی سازشکارانە و راست ناژۆیانەی فراکسیۆنی شەرەفکەندی و قاسملوو لە سازان لەگەڵ کۆڕ و کۆمەڵە ئیمپریالیستییەکان و ئۆپۆزیسیۆنی دژی شۆڕشی بەستراوە بەوان.

٢- تێکۆشان بۆ دامەزراندنی پێوەندی دۆستانە لەگەڵ وڵاتانی سوسیالیستی و پێشکەوتنخواز، بەهێزکردن و پەرەپێدانی پێوەندی لەگەڵ حیزب و رێکخراوە پێشکەوتنخوازەکان و، هاوپێوەندی لەگەڵ جوولانەوە رزگاریخوازییە ئیشتمانییەکان.

٣- پێ داگـرتن لەسـەر درێژەدان و پەرەپێـدانی خـەباتی چەکـدارانە و رەتکردنەوەی سیاسەتی سازشکارانە و وتووێژ خوازانە لە بەرامبەر رێژیمی کۆماری ئیسلامی دا، سیاسەتێک کە بێجگە لە پێکهێنانی گومان و دوودڵی سەبارەت بە ماهییەتی رێژیم ناکامێکی نەبوود.

٤- پشتیوانیی لە تێکۆشانی نێونەتەوەیی بۆ کۆتایی هێنان بەشەڕی ماڵ وێرانکەری ئێران و عێراق و دامەزراندنی ئاشتی لە نێوان دوو وڵات دا لەسەر بناخەی بڕیارنامەی ٥٩٨ی ئەنجوومەنی ئاسایش.

٥- هەوڵدان بۆ لە نێوبردنی ناڵۆزیی (تشنج زدایی) نێوان حیزب و رێکخراوەکانی خەباتگێر و دێموکرات و شۆڕشگێڕ لە رادەی ئێران و کوردستان دا و تێکۆشان بۆ پێکهێنانی پێوەندیی دۆستانە و هاوکاری لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی شۆڕشگێڕ لەسەر بناخەی رێزگرتنی بەرامبەر بە مەبەستی هەرچی بەهێزتر بوونی جووڵانەوەی میللی-دێموکراتیکی گەلی کورد و پتەو بوونی پێوەندیی ئەو جووڵانەوەیە لەگەڵ خەباتی سەرانسەری بۆ رووخاندنی رێژیمی کۆنەپەرست و دژی گەلیی کۆماری ئیسلامی و دامەزراندنی رێژیمێکی دێموکراتیک لە ئێران دا.

٦- لابردنی هێندێک مەبەست و مەوزووعی لادەرانە و کۆنەپەرستانە کە بە هۆی مەیل و بیر و باوەڕی غەیرە دێموکراتیکی ئەو فراکسیۆنە خراوەتە نێو بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆی حیزب.

٧- گەڕاندنەوەی ئوسووڵ و بایەخە دێموکراتیکەکان بۆ نێو ئۆرگانە جۆراوجۆرەکانی حیزب، لەبەرچاوگرتنی مافەکان و پاراستنی پرێستیژی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەندامان و، پارێزکاری کردن لە دێموکراسی هەم لە نێوخۆی حیزب و هەم لە دەرەوەی حیزب دا.

٨- لابردنی ئایینی شەخسیەت پەرستی، خەبات دژی مەیلی دیکتاتۆری و کۆبوونەوەی دەسەلاتی تاکەکەسی.

٩- هەوڵدان بۆ وەرگرتنەوەی دووبارەی ئەو ئەندام و کادر و پێشمەرگانە کە بەهۆی سیاسەتی چەوتی ئەم فراکسیۆنە لە حیزب دەرکراون یان "پاسیو" بوون. ئەم ئەسڵە ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە خەیانەت، یان جینایەتیان کردبێ.

١٠- پاراستنی بایەخەکانی بەشەردۆستانە و لەبەرچاوگرتنی هەرچی زیاتری ئوسوڵی ئەخلاقی و کۆمەلایەتی بۆ پێکهێنانی دڵسۆزی و هاوپێوەندیی هاوڕێیانە لە هەموو ئۆرگانەکانی حیزب دا.

**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**

**رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**

**١٣٦٧/١/١**

١- جەلیل گادانی        ئەندامی کۆمیتەی ناوندی
٢- حەسەن رستگار        ئەندامی دەفتەری سیاسی
٣- فەتاح کاویان        ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
٤- حوسێن مەدەنی        =    =    =
٥- نەبی قادری        =    =    =
٦- صدیق بابایی        =    =    =
٧- ئەبوبەکر راد        =    =    =
٨- عوسمان رەحیمی        =    =    =
٩- عەلی کاشف پور    ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
١٠- سەرهەنگ ئیرەج قادری ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندی
١١- کەمال کریمی        =    =    =
١٢- عصمت عبدی        =    =    =
١٣- شاپور فیروزی        =    =    =
١٤- رەحیم محەمەد زادە  ئەندامی موشاویری کۆمیتەی ناوەندی.
١٥- شاپورشجاعی فرد        =    =    =

بەم هەڵوێست گرتنە بەکردەوە حیزبی دێموکرات بوو بە دوو بەش، بەشێک بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و بەشێکی دیکە بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ. هەر لە رۆژی هەڵوێست گرتنیشەوە هیچ لایەکیان لایەنەکەی دیکەی قەبووڵ نەبوو. لایەک بە فراکسیۆن و لایەکەی دیکە بە "لادەر" ناوی یەکتریان دەبرد.

یەکێک لە گرنگترین هۆیەکانی ئەم هەڵوێست گرتنە هەروەک لە خاڵی حەوتەمی راگەیەندراوەکەدا هاتووە گەڕاندنەوەی ئوسووڵ و بایەخە دیموکراتیکەکان بۆ نێو ئۆرگانەکانی حیزبی و پاراستنی پرێستیژی سیاسی و کۆمەڵاتی ئەندامانی حیزب و بە کورتی پارێزگاری کردن لە دیموکراسی لە نێوخۆی حیزب و دەرەوەی حیزب دا بوو.

بۆ روون کردنەوەی زیاتری ئەم مەسەلەیە لەسەر بۆچوونی ئەو بەشەی تری حیزب ئاماژە بەهێندێک لە وتە و نووسراوەکانیان دەکەین. لە وتارێک دا لە ژێر سەردێڕی چەند قسەیەک لەسەر کۆنگرە لە ژمارە ١٣٤ی رۆژنامەی کوردستان کە ژمارەی تایبەتی کۆنگرەش بوو دەنووسێ (راستی ئەوەیە هەر حیزب و رێکخراوێکی سیاسی دروشمی دیوکراسی هەڵدەگرێ و داوای دیوکراسی دەکا، تا کاتێک ئەو دێموکراسییە لە نێو ریزەکانی خۆی دا لەبەر چاو نەگرێ و جێگیری نەکا ناتوانێ ببێتە هۆی ریشە داکوتانی

دیموکراسی لەهەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵەکەیدا، بەڵکو تەنانەت ناتوانێ ئیدعا بکا کە لەداواکەی دا راست و دڵپاکە. کەسێک کە بۆ شتێک دروشم هەڵدەگرێ پێویستە لەپێش هەموو کەس دا خۆی وەک نموونەی ئەو شتە بەخەڵک بناسێنێ، ئەگینا کاردکەی لانی زۆر لە دروشمێکی بێ نیوەرۆک تێ ناپەڕێ کەوابوو کاتێک راگەیەندراوی کومیتەی ناوەندی سەبارەت بەپێک هاتنی کۆنگرەی هەشتەم دەڵێ کە پێکهاتن و بەڕێوەچوونی کۆنگرەی هەشتەم ئەم راستییە جارێکی دیکە دەردەخا کە حیزب ئیمانێکی قووڵی بەدیموکراسی هەیە یان نووسینی چەند قسەی جوان و رازاوە سەبارەت بەدیموکراسی لەسەر کاغەز نابێتە بەڵگە بۆ دیموکرات بوون و خاوەنی بیروبڕوای دیموکراتی بوون. نیشاندەری راست بوون یا نەبوونی هەر ئیدعایەک کردەوە و نێوەرۆکی کردەوەیە. نموونەش کۆنگرەکانی حیزبی دیموکرات!).

لەحاڵێک دا مەبەست لە پێکهێنانی ئەو تەنگ و چەڵەمانە یەک دەست کردنی کادری رێبەری و وەلانانی بەقەولی ئەوان ئەفرادی موزاحیم بووە و هێنانی لیستەی فیکسیش هەر بەم مەبەستە بوو، بەڵام بوو بەهۆی تەقینەوەی ناتەباییەکانی نێو حیزب و هاتنە پێشی گەورەترین رووداوی ناخۆشی ژیانی سیاسی حیزب.

لە راپۆرتی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بۆ کۆنفرانسی چوارەمی حیزب بۆ سەلماندنی رەفتاری نادیموکراتیکی ئەوان و مەبەست لەم شێوە هەڵبژاردنە زۆر بەڵگە و دەلیل باس کراوە، بۆ وێنە:(*)

أ/ بێ بەش کردنی ئەندامانی حیزب لەهەڵبژاردنی ئازادانەی نوێنەرانی خۆیان لەهێندێک شوێن بۆ کۆنگرەی حیزب، هەروەها شێوەی دانانی رێبەری تازە و بڕینی مافی دەنگدانی ئەهێنی لە ئەندامانی کۆنگرە بەپێی بۆچوونی خۆیان. ئەوە خۆی پێشێل کردنی بنەڕەتی حەقی دیموکراتیکە لەنێو خۆی حیزبدا.

ب/ دانی لیستێکی سابیت لەکاندیداکانی کومیتەی ناوەندی یان هەر ئۆرگانێکی دیکە لەلایەن هەر کەس یا کەسانێک لە رێبەرایەتی لە راستی دا بەرنامەیەکە ئەوان بەپێی مەیل و ئیرادەی خۆیان و لەجیاتی هەموو ئەفراد و ئەندامانی حیزب، ئەفرادێک بۆ رێبەرایەتی هەڵبژێرن. بەواتایەکی دیکە کەس یا کەسانێکی تایبەتی لەجیاتی هەموو ئەندامان، کادرەکان و پێشمەرگەکانی حیزب بیر دەکەنەوە، بڕیار دەدەن و بەزەوقی خۆیان رێبەرایەتی حیزب هەڵدەبژێرن.

---

* بەڵگەکانی کۆنفرانسی چوارەمی ح. د. ک رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ ٨ تا ١٣ی پوشپەڕی ١٣٦٧.

ه/ ناکامیکی دیکەی ئەو رێبەری دیاریکردنە ئەوەیە کە کەمایەتییەکی گەورە (لەکۆنگرەی هەشتەم دا نیوەی یەک کەم لەئەندامانی کۆنگرە و لە راستی دا نیوەی ئەو کەسانەی لەحیزب دا دەنگیان بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی خۆیان بۆ بەشداری لە کۆنگرە دا داوە لەبوونی نوێنەر بێ بەش کراون.

و/ لەحیزبی ئێمەدا دابێکی جێ کەوتوو هەیە کە وەبەرچاو گرتنی لەلایەن ئەندامانی رێبەرایەتییەوە هەموو کات وەک شتێکی بێ ئەم لا و ئەولا روون و پێویست بووە. بەو مانایە کە لەهەموو کۆنگرەیەک دا دوای پێشکەش کردنی راپۆرتی کومیتەی ناوەندی، ئەندامانی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی پێشتر بەکردەوە بەرپرسایەتییەکیان نامێنێ و هەر کام لەوان وەک نوێنەرێکی کۆنگرە بێ هیچ جیاوازییەک لەگەڵ نوێنەرانی دیکە، درێژە بە بەشداربوونی خۆی لە کۆبوونەوەکان دەدا چونکە لەحیزبی ئێمەدا هیچ باڵێکی تایبەتی بەشێوەی رەسمی نەبووە، دانی لیستی ئەندامان ئەویش بەشێوەی فیکس و نەگۆڕ بۆ رێبەرایەتی لەلایەن هەر کەسێکەوە بێ، کارێکی غەیرە ئوسوڵییە.

ز/ ئەو شێوە هەڵبژاردنە دەبێتە هۆی ئەوە کە زۆر کەسی بێ سەلاحیەت و مەسڵەحەت خواز لە پەنای پشتیوانی خۆیاندا ببنە ئەندامی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی. لە حاڵێک دا بەهیچ جۆر شیاوی ئەندامەتی لەو ئۆرگانە دا نین.

ح/ لە ناکامی ئەم وەزعە نالەبارەی کۆنگرە و پاش کۆنگرەدا بێ هیوایی و ناهومێدی و هەست بەبێ دەسەڵاتی لەناو کادر و پێشمەرگەکان دا پاسیفسمێکی تەواوی پێک هێنابوو کە مەترسی زۆر شتی خراپی وەک خزانەوە بۆ لای دوژمن ولاتی کەم دانیشتن و بەجێ هێشتنی ولات و خەبات بوو. بەلام هەڵوێستی ح. د. ک. ر. ش تێن و هیوایەکی تەواوی بۆ هەموو ئەو لایەنانە پێک هێنایەوە.

هەڵوێست گرتنی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بووە هۆی ئەوە کە بەشێکی زۆر لەکادر و پێشمەرگە و ئەندامانی حیزب ناڕەزایەتی پێشتری خۆیان دەربڕن و پشتیوانی لەم حەرەکەتە بکەن ئێمە بۆ خۆپاراستن لەدرێژ کردنەوەی باسەکە لێرەدا تەنیا ئیشارە بەناوی ئەو کومیتە شارستان و هێز و ئۆرگان و کەسایەتییانە دەکەین کە بەدەرکردنی راگەیەندراو پشتیوانی خۆیان لەو هەڵوێست گرتنە دەربڕیوە. هەروەها بۆ نموونە راگەیەندراوی چەند کومیتە و هێز لەناوەوە و چەند کومیتە لەدەرەوەی ولات دەخەینە بەرچاو.

| لیستی کومیتەو هێز و ئۆرگان | ڕێکەوتی پەشیمانی | |
|---|---|---|
| ١- کومیتەی شارستانی مەهاباد و هێزی پێشەوا | ١٣٦٧/١/٣ | |
| ٢- کومیتەی شارستانی بانە و هێزی ئاربابا | ١٣٦٧/١/٣ | |
| ٣- تەشکیلاتی فەرعی حیزبی دێموکراتی کوردستان | ١٣٦٧/١/٤ | هەیئەتی ئیجرائی و زۆربەی ئەندامانی تەشکیلات |
| کادر و پێشمەرگەکانی کومیسیۆنی کومەڵایەتی | ١٣٦٧/١/١١ | (نزیکەی ٩٠٪ کادر و پێشمەرگەکان) |
| ٥- کادر و پێشمەرگەکانی ئۆرگانی سیاسی نیزامی | ١٣٦٧/١/١١ | ٦٥٪ کادر و پێشمەرگەکان |
| ٦- کادرەکانی بنکەی دەفتەری سیاسی | ١٣٦٧/١/١٢ | تەواوی کادرەکانی بنکەی دەفتەری سیاسی |
| ٧- کادر و پێشمەرگەکانی مەڵبەندی سێی سەنگ | ١٣٦٧/١/١٢ | بەشێکی بەرچاو لەکادر و بەرپرسانی نیزامی و زۆربەی پێشمەرگەکان |
| ٨- شازدە کەس لەئەندامان و کادرەکانی کومیتەی شارستانی سەردەشت | ١٣٦٧/٦/١١ | |
| ٩- کومیتەی ئوتریش | ١٣٦٧/٦/١٢ | زۆربەی ئەندامان |
| ١٠- کۆڕی خوێندنی حیزبی دێموکراتی کوردستان | ١٣٦٧/٦/١٣ | |
| ١١- شەش کەس لەکادرەکانی بەشی بێسیمی سەراسەری حیزب | ١٣٦٧/٦/١٤ | |
| ١٢- کادرەکانی کومیتەی شارستانی کرماشان | ١٣٦٧/٦/١٧ | |
| ١٣- بەشێک لەکادرەکانی ئینتشارات و تەبلیغات | ١٣٦٧/٦/٢٢ | |
| ١٤- عومەر شەریف زادە ئەندامی مشاوری کومیتەی ناوەندی و بەرپرسی مەڵبەندی یەکی حیزب | ١٣٦٧/٦/٣٠ | |
| ١٥- بەرێزمیرانی کۆڕی پەروەردە و فێرکردن و بەشی هەرمزیی ماموستایان | | |
| ١٦- کومیتەکانی حیزبی دێموکرات لەسوێد | ١٩٨٨/٤/١١ | |
| ١٧- بەشێک لەکادر و پێشمەرگەکانی کومیتەی شارستانی مەریوان و هێزی شاهو | | |

| | | |
|---|---|---|
| ١٨- زۆربەی ئەندامان و کادرەکانی کومیتەی شارستانی ئیلام | | |
| ١٩- کاک هاشم کەریمی ئەندامی پێشووی دەفتەری سیاسی و کاک حسن ایوب زادە (ماموستا گۆران) ئەندامی جێگری کومیتەی ناوەندی پێشوو | ٦٧/٣/١٩ | |
| ٢٠- ئێرەجی بەرپرسی سیاسی ئیلام و فەرماندەی هێزی گیلانغەرب و ژمارەیەک لە کادر و پێشمەرگەکان | ١٣٦٧/٢/٢ | |
| ٢١- بەشێک لە کادر و پێشمەرگەکانی کومیتەی شارستانی ڕەحمەت و هێزی زەمبوران | | |
| ٢٢- زۆربەی ئەندامانی مەڵبەندی باکووری کوردستان و فەرماندەی هێزی ئاگری و ژمارەیەک لە کادر و پێشمەرگەکان. | | |
| ٢٣- ئەندامان و پێشمەرگە کەم ئەندامەکانی دانیشتووی شاری رانیە و کوردستانی عێراق. | | |
| ٢٤- بەشێک لە ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستان دانیشتووی ئەڵمانی فیدراڵ | | |
| ٢٥- زۆربەی ئەندامان و لایەنگرانی حیزب لە وڵاتی ئیتالیا. | | |

## ئەوەش چەند نموونەیە لە پشتیوانییەکان:

### هاونیشتمانانی خۆشەویست[١]
### هاوڕێیانی بەڕێز...

ئێمە کادر و پێشمەرگەکانی کومیتەی شارستانی مەهاباد و هێزی شەهید پێشەوا پشتیوانی خۆمان لەهەڵوێستی ڕەوا و بەجێی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەردەبڕین و هەروەها هەر دە خاڵی ئیعلامیەکە پەسەند دەکەین و پەیمان

١- ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە/ ١٣٤ (چاپی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ).

نوێ دەکەینەوە بۆ گەیشتن بەدروشمی حیزب: دێوکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان) بەوپەڕی تواناوە تێ بکۆشین.

بۆیە داوامان لەهەموو کومیتەکان و هێزەکانی حیزبی و کۆمەلانی خەلکی کوردستان ئەوەیە کە بەدلسۆزی و بەرپرسایەتییەوە پشتیوانی خۆیان لە رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بۆ جێبەجێ کردنی ریسالەتی مێژوویی حیزب دەربڕن و هەرچی زیاتر فراکسیونی شەرفکەندی و قاسملوو تەریک بکەنەوە.

کومیتەی شارستانی مەهاباد و
هێزی شەهید پێشەوا
١٣٦٧/١/٣

وێنە بۆ: رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

## خەلکی خەباتگێڕی کوردستان:[٢]

ئەندامان، کادر و پێشمەرگە فیداکارەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، هاوولاتییانی خاوەن هەست و نیشتمان پەروەر.

هەلوێست گرتنی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران لەبەرامبەر فراکسیونی خۆ سەپێن بەسەر حیزبدا، تەقینەوە و دژکردەوەی چەندین سال خۆ خواردنەوە و تەحەمولی زۆر روانگەی تاکەکەسی و سەردڕۆیی ئەو فراکسیۆنە بوود لەپێناوی راگرتنی یەکپارچەیی ریزەکانی حیزب لەبەرامبەر رێژیمی دژی گەلی کۆماری ئیسلامی دا. رەوتی کۆنگرە و نارەزایەتی بەدەنەی حیزب لەسەر بردنە پێشی ئەو رەوتە دژی دێوکراتیکە و بایەخ دانەنان بۆ بیروڕا و داوای کادر و پێشمەرگەکانی حیزب لەسەر گرتنەوەی کۆنگرەی نائاسایی لەلایەن رێبەرایەتی خۆ سەپێنەوە، ئەندامانی دلسۆزی حیزبی لەبەرامبەر هەلوێست گرتنی راستەوخۆ و روون دا دانا. دەربڕینی قەتعنامە و

٢- هەمان سەرچاوە.

داوای راستەوخۆی ئێمە بۆ گرتنەوەی کۆنگرەی نائاسایی، چ بەهۆی نوێنەرانمان لەناوەندی رێبەرایەتی دا، چ لەبەرامبەر نوێنەرانی ئەوان لەکۆبوونەوە بەرینەکانماندا. و بایەخ دانەنان و وەڵام نەدانەوەی لەلایەن ئەوانەوە، بەڵگەیەکی روونی ئەو ئیدیعایەیە. بۆیە ئێمە وەک کومیتەی شارستانی بانە و هێزی ئاربەبا، هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە و بەجێی " رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران" تەئید دەکەین و بەهەموو توانامانەوە پشتیوانی لێ دەکەین و لەسەر ئێوەڕۆکی پێشەکی و خاڵەکانی ئەو بەیاننامەیە پێ دادەگرین و لەو رێبازەدا ئامادەی تێکۆشانین.

**کومیتەی شارستانی بانە**

**هێزی ئاربەبا**

**١٣٦٧/١/٣**

وێنە بۆ: رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران.

## خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان:[٣]
## هاونیشتمانە شۆڕشگێڕەکان:
## رێکخراوە خەباتگێڕ و پێشکەوتن خوازەکان:

قەیرانی نێوخۆ و ئەوزاعی ئاڵۆزی ئەو دواییانەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، کە بەتایبەت دوای پێک هاتنی کۆنگرە " کە گەیشتۆتە ئەوپەڕی خۆی، بوو بەهۆی ئەوە کە ژمارەیەکی زۆر لەکادرە شارەزاکانی رێبەرایەتی لەدەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی و هەروەها زۆربەی هەرە زۆری ئەو کادر و پێشمەرگە و ئەندامە وشیارانەی بە ئامانجی پیرۆزی گەلی کورد و هەموو گەلان ژێر دەست واتە خەبات دژی کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزم و تێکۆشان بۆ رزگاری لەچەوسانەوە و ژێر دەستی وەفادارن، ریزەکانی خۆیان لەریزی فراکسیۆنی شەرەفکەندی و قاسملو، کە نوێنەری خەتی راست ناژۆیانە لەحیزب دابوو، جیا بکەنەوە و لە رێکەوتی ٦٧/١/١ دا وەک رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزب هەڵوێستی خۆیان راگەیەنن هەر بۆیە بۆئاگاداریی جەماوەر رادەگەیەنین کە ئێمە زۆربەی ئەندامانی کومیتەی نوتریش پشتیوانی خۆمان لەو کردەوە شۆڕشگێڕانەیە دەردەبڕین و هاوپێوەندی خۆمان لەگەڵ رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران رادەگەیەنین.

---

٣- رۆژنامەی کوردستان ژمارە/١٢٤(چاپی رێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ).

سڵاو له حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و ڕێبەرایەتییە شۆڕشگێڕەکەی هەرچی پتەوترین ڕیزەکانی هێزە شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخوازەکان مەرگ و نەمان بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران بەرێ ئیمپریالیزمی جیهانی بەسەرۆکایەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکا.

**کومیتەی ئوتریش**
**١٣٦٧/١/١٢**

هەروەها زۆربەی حیزب و ڕێکخراوە سیاسییە ئێرانییەکان لەپێوەندی لەگەڵ ئەم هەڵوێست گرتنەدا بۆچوونی خۆیان دەربڕی و لە ئۆرگانی خۆیان دا بڵاویان کردەوە. جێگای سەرنجە کە لە روانگەی ئەوانەوە هەڵوێست گرتنی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ نەتەنیا بە خراپ نەزاندرا و مەحکوم نەکرا، بەڵکو بەنێوەرۆکی شۆڕشگێڕانەی راگەیەندراو و هەنگاوی بەکردەوەی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بۆ گەیشتن بە ئامانجە دیاریکراوەکان لە راگەیەندراوەکەدا لەگەڵ پێشوازی زۆربەی ڕێکخراوەکانی ئۆپۆزسیۆنی شۆڕشگێڕ ڕووبەڕوو بوو.

ئەو حیزب و ڕێکخراوانەی کە بڵاوکراوەکانیانمان بەدەست گەیشتووە و هەڵوێستی ئەو ڕێکخراوانەی تێدا چاپ کراوە بریتین لە:

١- ڕێکخراوی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کۆمەڵە - بڕیارنامە پەسەندکراوەکانی کۆنگرەی شەشەمی ڕێکخراوی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵە.

٢- ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێران - بڵاوکراوەی ژمارە ١٣٣ی یەکیەتی ئەنجوومەنەکانی خوێندکارە موسوڵمانەکان لەدەرەوەی وڵات.

٣- ڕێکخراوی کرێکارە شۆڕشگێڕەکانی ئێران (راە کارگر) - "راە کارگر" ژمارە/ ٥٠ی ئۆرگان.

٤- ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەلقی ئێران - (وتاری رادیۆیی دەنگی فیدایی ٦٨/١/٨).

٥- ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەلقی ئێران - پێڕەوی بەرنامە (هویت) "نبرد خلق" ژمارە/ ٤٦ی ئۆرگان.

٦- چریکە فیداییەکانی خەلقی ئێران - راگەیەندراوی چریکە... ٦٧/١/٨.

٧- ڕێکخراوی ئازادیی کار (فیدایی) "کار" ژمارە/ ٤٦ی ئۆرگان.

٨- هەستەی (اقلیت) - "سوسیالیزم" ژمارە/٧ی نۆرگان.
٩- رێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەلقی ئێران (اقلیت) "کار"ی ژمارە/ ٢٢٠ی نۆرگان.
١٠- ناوەندی راگەیاندنی بیر و بڕوای شەریعەتی (کانون ابلاغ اندیشەهای شریعتی) نیبلاغی ژمارە ٢٣ی نۆرگان.
١١- یەکیەتی کۆمۆنیستەکانی ئێران (اتحادیە کمونیستهای ایران) - راگەیەندراوی اتحادییە.... کومیتەی کوردستان.
١٢- چریکە فیداییەکانی خەلقی ئێران (ارتش رهایی بخش خلقهای ایران) راگەیەندراوی چریکە.... ٦٧/٢/٩.
١٣- حیزبی رەنجبەرانی نیران - رەنجبر ژمارە/ ١١ی نۆرگان.
١٤- رێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەلقی ئێران - "کار"ی ژمارە ٢١٢ی نۆرگان.
١٥- رێکخراوی فیداییانی خەلقی ئێران - فیدایی ژمارە ٤٧ی نۆرگان.
١٦- رێکخراوی فیداییانی خەلقی ئێران (اکثریت) -"کار" ژمارە ٥١ی نۆرگان.
١٧- حیزبی تودەی ئێران - "مردم" ژمارە ٢١٢ی نۆرگانی....
١٨- بەرەی یەکگرتووی دیموکراتی کوردستان - ٢٧ی خاکە لێوەی ١٩٨٨.

## ئەوەش چەند نموونە لە هەڵوێستی رێکخراوەکان:

### ١- هی رێکخراوی مرجاهیدینی خەلقی ئێران

... ئەو کارە بۆ هاوولاتییە چەوساوە کوردەکان گرینگییەکی تایبەتی هەیە، هەر بۆیە ئەو دەستەیە لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی و بەرپرسان و کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە بە وەلانانی سیاسەتی خائینانە و وتوێژخوازانە راپەڕیون، ئەگەر لەسەر رێگای خۆیان سوور بن و بێ لەسەر ئوسولی خەڵکی و شۆڕشگێڕانە داگرن، خزمەتێکی خەباتگێڕانەی گەورە بە خەڵکی دلێری کوردستان دەکەن و شێلگیر بوون لەو رێگایەدا بە مانای بەرێوەبردنی ئەرکی سەرشان بەرامبەر بە هەموو ئەو پێشمەرگە شەهیدانەیە کە لە جەردیانی شەڕ دەگەڵ جەللادەکانی رێژیم دا خوێنی پاکیان کێو و شارەکانی کوردستانیان رەنگاندووە.

**(بلاوکراوەی ژمارە ١٤٤ی یەکیەتی ئەنجوومەنەکانی خوێندکارە موسڵمانەکان لە دەرەوەی وڵات)**

## ٢- ڕێکخراوی کرێکارە شۆڕشگێڕەکانی ئێران (ڕاە کارگر):

ڕاگەیەندراوی بڵاوکراوە لەلایەن ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە، دوای کۆنگرەی هەشتەمی ئەو حیزبە نیشانەی یەکێک لە گرینگترین ئاڵوگۆڕی مێژوویی چل و چەند ساڵەی خەباتی خۆی و بەتایبەت مێژووی دوای ڕاپەڕینی ڕێبەندانی ئەو حیزبەیە.

لە نێوان کۆنگرەی شەشەم تا هەشتەم دا سیاسەتە دیموکراتیەکانی لاوازبوون، لادانی ڕاست ئایدلۆژییانەی حیزبی ناوبراو لە هەموو حەوزەکان بەهێزبوو، وەلانان، پاڵاوتن و سەرکوت کردنی باڵای شۆڕشگێڕ و لایەنگرەکانی هاتە گۆڕێ، بەکورتی حیزبی دیموکرات هەرچی زیاتر لە داب و سوننەتە شۆڕشگێڕانە و دیموکراتییانەی چل ساڵەی خۆی دوور خرایەوە. دوای کۆنگرەی هەشت مخالفانی دژ بە لایەنی دەسەڵاتدار لە ڕاگەیەندراوێک دا هەڵوێستی خۆیان ڕاگەیاند. ئەو ڕاگەیەندراوە لە کۆمەڵە هەڵوێستێک پێک هاتووە کە دژی زنجیرە لادانێکی زاڵ بەسەر حیزبی دیموکرات دا ڕاوەستاوە. لابردن و ڕاست کردنەوەی ئەو چەشنە لادانانە کارێکە کە بێ گومان دەبێ لەلایەن کۆمونیستەکان و شۆڕشگێڕە ڕەسەنەکانی ئێرانەوە تەئیید بکرێ.

ڕۆژنامەی ڕاە کارگر، ژمارە ٥٠، ئۆرگانی ڕێکخراوی ڕاە کارگر

## ٣- ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران:

ئەوەی کە لەو ڕاگەیەندراوەدا وەک هەنگاوێکی موسبەت شیاوی تەئییدە هەوڵدان بۆ ئیسلاح کردنی سیاسەتەکانی حیزبی دیموکرات لەلایەن ئەو کەسانەوەیە کە ڕاگەیەندراوەکەیان ئیمزا کردووە و ئەو هەوڵدانە دەتوانێ بەرەو کردنەوەی سیاسەتەکانی تا ئێستای حیزبی دیموکرات، لە خزمەتی هەوڵدان و پەرەسەندنی بزووتنەوەی گەلی کورد دابێ.
ئەوەی کە دەتوانێ وەک دەستەبەری وەدیهاتنی ئامانجە ڕاگەیەندراوەکانی ئەو کەسانە بێ کە ڕاگەیەندراوەکەیان ئیمزا کردووە و بە هەنگاوێکی سەرەتایی بەکردەوە بژمێردرێ، هەڵوێست گرتنێکی ڕوون بە ڕاشکاوی بۆ بڕانەوەی تێک هەڵچوونەکان بە هۆی چارەسەرییەکی دیموکراتییەوە.

**ڕادیۆ دەنگی (فیدایی)**
**ڕێکەوتی ٦٧/١/٨**

## ٤- ڕێکخراوی ئازادی کار (فیدایی):

بەهەر حاڵ ئێستا جیابوونەوە لە حیزبی دێموکرات بۆتە واقعیەتێکی عەینی و ئەو دوو هێزە کە لە مێژ ساڵ بوو لە حیزبی دێوکراتدا دژی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی خەباتیان دەکرد، لەیەکتر جیابوونەوە، هەروەک گوترا هۆیەکانی ئەسڵی ئەو جیاییە هێشتا بەتەواوی ڕوون نەبۆتەوە، بەڵام نە هەر لە ڕوانگەی کۆمونیستێکی شۆڕشگێڕەوە، بەڵکو بۆ هەر دێوکراتیکی شۆڕشگێڕیش کە توانیویەتی بە شێوەیەکی واقیعبینانە لەگەڵ مەسەلەکان ڕووبەڕوو بێ، قازانجی شۆڕش و گەل بکاتە معیاری قەزاوەتەکانی ڕوونە کە پشت لە بزووتنەوەی گەل کردن، خۆ بەدەستەوە دان لە بەرامبەر کۆنەپەرستی دا بۆ هیچ کام لەو دوو جەریانە لە گۆڕێ دا نییە و جێگای هەردووکیان لە چوارچێوەی بزووتنەوەی میللی دێوکراتی گەلی کورد دایە. هەر چەشنە هەوڵدانێک بۆ حاشاکردن لەو واقعییەتە، یان ڕەتکردنەوەی مەوجوودییەتی حیزبی وان، هەنگاوێکی لادەرانە و دژی دێوکراتییە کە تەنیا خزمەت بە بەهێزکردنی ناکامە مەنفییەکانی جیابوونەوە لە نێو کۆمەڵانی کورد و چاندنی تۆوی دوژمنایەتی، ڕقەبەرایەتی لە نێو هێزە پێشڕەوەکانی گەلی کورد دا دەکا.

دیارە داهاتوو، ماهییەتی ناکۆکییەکانی هەردووک هێز ڕوون دەکاتەوە و، ناکامەکانی لە بەرنامە و سیاسەتەکانی هەر کامیان دا دەردەخا.

**بڵاوکراوەی کار، ژمارە ٦٤**
**ئۆرگانی ڕێکخراوی ئازادی کار (فیدایی)**

دوایەش لەلایەن کاک بێهروز کورد ئەحمەدی وێژەر و نووسەری پێشووی ڕادیۆ و ئینتشارات کە لەماوەی نێوان کۆنگرەی پێنجەم و شەشەمدا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزب بووە و ئێستا لە وڵاتی سوئید وەک پەنابەری سیاسی دەژی ڕاگەیەندراوێک بڵاوکرایەوە و بۆچوونی خۆی لەو بارەوە دەربڕیبوو.

هەروەها لە ڕێکەوتی ١٩٨/٥/٢٠ دا کاک حەسەن هاشمی ئەندامی جێگری پێشووتری کۆمیتەی ناوەندی، کاک ڕەسوڵی پێشنماز ئەندامی پێشووتری دەفتەری سیاسی، کاک سەعید کوێستانی ئەندامی پێشووتری کۆمیتەی ناوەندی، کاک مەلا محەممەد خزری کادری پێشووی حیزب و کاک خالید عەزیزی کادری پێشووی بەشی

(تحقیق و ترجمه)ی حیزب که له سوئید وەک پەنابەر دەژین نامەیەکی سەرناوەلایەیان بۆ ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران نارد و هێندێک نەزەر و پێشنیاریان تێدا گونجاندبوو.

## غوونەی ئەوانە لە ڕۆژنامەکانی ژمارە ۱-۲ و۳ی کوردستان دا چاپ کراوە

ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لەهەموو بوارێک دا دەستی کرد بەتێکۆشانێکی چالاکانە و لەهەوڵی ئەوەدا بوو کە هەرچی زیاتر پرەنسیپە دیموکراتیکەکان جێگیر بکات بەڵام بەداخەوە لە ڕێکەوتی حەوتی خاکە لێوەی ١٣٦٧ واتە حەوتوویەک دوای هەڵوێست گرتنی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کۆمیسیۆنی سیاسی نیزامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ڕاگەیەندراوێکی بڵاوکردەوە کە ئەوە دەقەکەیەتی:

## "ڕاگەیەندراوی کۆمیسیۆنی سیاسی نیزامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ":

ڕۆژی یەکی خاکەلێوەی ١٣٦٧ چەند کەس لەئەندامانی حیزب کە پاش کۆنگرەی هەشتەم هیچ چەشنە مەسئولیەتێکیان لەحیزب دانەماوە بەیانێکیان بەدژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بڵاوکردۆتەوە و نیشانیان داوە کە ناتوانن لە ڕیزی حیزبی ئێمەدا بمێننەوە.

بەم بۆنەوە ڕادەگەیەندرێ کە ئەم چەند کەسەی خوارەوە بەهۆی لەژێر پێنانی پێڕەوی نێوخۆی حیزب لەو تاریخە ڕا هیچ پێوەندییەکیان بەحیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە نەماوە و ئەندامی حیزب نین.

١- حەسەن ڕستگار
٢- حوسێن مدنی
٣- فەتاح کاویان
٤- نەبی قادری
٥- جەلیل گادانی
٦- سەدیق بابانی

٧- عوسمان رەحیمی
٨- ئەبوبەکر راد
٩- عەلی کاشفپور
١٠- عصمت عبدی
١١- شاپور فیروزی
١٢- ئیرەج قادری
١٣- کەمال کەریمی
١٤- رەحیم محەممەد زادە
١٥- شاپور شجاعی فرد

**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**
**کۆمسیۆنی سیاسی نیزامی ١٣٦٧/١/٧**

بەدوای ئەم راگەیەندراوەدا لە رادیۆکەیانەوە وتارێکیان لەژێر سەردێڕی (روون کردنەوە لەسەر راگەیەندراوی کۆمیسیۆنی سیاسی نیزامی) بڵاوکردەوە و بەشێوەیەکی زۆر توند و بەدوور لە هەر چەشنە پرەنسیپێکی دیموکراتیک و ئەخلاقی شۆڕشگێڕانە هێرشیان کردە سەر رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ و بەخاین، گێرەشێوێن، لادەر، بێکارە ئەنگەل و کلکی موجاهیدین و بەزیو- و دواتریش بەجاش موجاهید لەقەڵەم دران.[٤]

ئەم هێرش کردنە تەبلیغاتییە درێژەی کێشا و هەڕەشە و گوڕەشە دەستی پێ کرد. بەپێچەوانەی سیاسەتی توندی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بەپێی نوسوڵی دیموکراتیک تێکۆشانی سیاسی خۆی لەهەموو بوارێکدا بەشێوەی مەنتقی دەست پێکرد، چ بەهۆی ئۆرگانە تەبلیغاتییەکانەوە، چ لەدانیشتنەکانی لەگەڵ هێزە سیاسییەکان دا دەستی کرد بە روون کردنەوەی سیاسەتەکانی خۆی و رەت کردنەوەی ئیدعاکانی دوژمنانەی لایەنی دی.

---

٤- شایانی باسە لە دانیشتنێکی هاوڕێیانی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لەگەڵ رێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێران پێش هەڵوێست گرتن بە پێچەوانەی هێندێک بۆچوونی چەوت و ناڕاست کە بیریان دەکردەوە ئەو هەڵوێست گرتنە لەوانی سەرچاوە گرتووە، موجاهیدین بەجیدی داوایان لەهاوڕێیانمان کردووە کە هەوڵ بدرێ لەجیابوونەوە خۆبپارێزین و جیابوونەوەیان بەقازانجی بزوتنەوەی سەرانسەری و کوردستان نەزانیوە. داوایان لە هاوڕێیان کردووە لەرێگەی خەبات و دیالۆگی دەروون حیزبییەوە گیروگرفتەکان چارسەر بکەن.

کـۆمیــسیــۆنی سـیـاسی نیـزامی جگە لەو ڕاگـەیەندراوە و ئەو وتارە توند و تیـژەی لەسەرەوە باسمان کرد بەخشنامەیەکی بۆ هەموو کومیتە شارستان و مەڵبەندەکانیان نارد کە لەوەدا بەشێوەیەکی غەیرە ئوسوڵی لەسەر حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ هەڵوێست گیرابوو و بە ئاشکرا ناوەڕۆکی شەڕخوازی و زۆرە ملی ڕێبەرایەتی ئەو بەشەی دیکەی حیزبی دەردەخست، ئەمەش دەقی بەخشنامەکە:

" ڕێنوێنی کۆمیسیۆنی سیاسی نیزامی بۆ کومیتە شارستان و مەڵبەندەکان"

١- ئەو ١٥ کەسەی ئووسراوەیان ئیمزا کردووە بەخائین بەحیزب و گەل و جاش دەناسرێن و هەروەک خائین و جاش ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێ.

٢- ئەو ١٥ کەسە و هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵیان کەوتوون و تەبلیغ بۆ لادەران دەکەن نابێ لەهیچ بنکەیەکی حیزبی ڕێگا بدرێن.

٣- کادر و پێشمەرگە و لایەنگرانی حیزب لەهەر جێگایەک تووشی لادەران بن، دەبێ بایکۆتیان بکەن و خەڵکی کوردستانی ئێران و عیراقیان لێ هان بدەن ئەوانیش بایکۆتیان بکەن.

٤- کادر و پێشمەرگەی هەڵخەڵەتاو هان بدەین کە بگەڕێنەوە و ئەگەر پەشیمان بوونەوە و صادقانە هاتنەوە پێویستە بەباوەشی ئاواڵە وەربگیرێنەوە.

٥- ئەو کەسانەی هەتا ئێستا لەگەڵ دەستەی لادەر بوون، بەڵام لەنێو بنکەکانی حیزب دا ماونەتەوە، ئەگەر دەستەی لادەر بەخائین و جاش دەزانن و مەحکومیان دەکەن، دەتوانن بمێننەوە. ئەگەر هەر کەس بەڕواڵەت ئەم دەستەیە مەحکوم بکا. بەڵام بەکردەوە تەبلیغاتی بۆ بکا یا کاری بۆ بکا وەک جاسوس دەناسرێ و وەک جاسوسیش ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ.

٦- بەرپرسانی کومیتەی شارستان و مەڵبەندەکان کۆبوونەوەی شارستان و مەڵبەندەکان پێک دێنن و لەم کۆبوونەوانەدا:

الف: دەستەی لادەر و خائین بەحیزب و گەل و جاش مەحکوم دەکەن.

ب: پشتیوانی خۆیان لەبەڕێوەبەریی هەڵبژێراوی کۆنگرەی هەشتەم دەردەبڕن و ئەم بڕیارە دەنێرین بۆ ڕادیۆ دەنگی کوردستان.

ج: کومیتەی شارستان و مەڵبەندەکان لیستی تەواوی ئەو کەسانە کە ڕۆیشتوون دەنێرن بۆ کۆمسیۆنی سیاسی نیزامی.

لەم لیستەدا دەبێ ڕۆژی ڕۆیشتن و مەسئولیەتی هەموو ئەو کەسانە دیاری بکرێ و

ئەگەر دارایی حیزبیشیان بردووە دەبێ نیشاردی پێ بکرێ. ئەم لیستە تا ڕۆژی پازدەی خاکەلێوە دەبێ بگاتە کۆمیسیۆنی سیاسی نیزامی.

**کۆمسیۆنی سیاسی نیزامی**

بەپێچەوانەی ئەوبۆچوونە دوور لەمەنتق و توندوتیژانە ئێمە خەریکی هەوڵدانی خۆمان بۆ پتەوکردنی ریزەکانی حیزب لەلایەک و پێکهێنانی تەفاهوم دەگەڵ هێزەکانی دیکەی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی و کوردستانی لەلایەکی دیکە بووین. بەتایبەتی کە یەکێک لەخاڵە گرنگەکانی راگەیەندراوی دە ماددەیی لابردنی ئاڵۆزی لەنێو حیزب و رێکخراوەکانی بەشدار لە جولانەوەی سەرانسەری و کوردستان دا بوو بۆ بەجێ گەیاندنی ئەم سیاسەتە دروست و ئوسوڵییە و بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە شەڕی چەند ساڵەی حیزب و کۆمەڵە زیانێکی گەورەی بە شۆڕش گەیاندووە و هەر دوژمن سوودی لێ بردووە، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لە کۆبوونەوەی خۆی دا پاش باسێکی دوورودرێژ بڕیاری لەسەر تەواو کردنی ئەو شەڕە دا، لەسەر ئەو بنەمایە رۆژی ٣٠ی خاکەلێوەی ١٣٦٧ حیزبی دێموکراتی کوردستان، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لە راگەیەندراوێک دا بەشێوەی یەک لایەنە ئاگربەسی لەگەڵ کۆمەڵە راگەیاند کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

## (راگەیاندنی ئاگربەسی یەک لایەنە سەبارەت بەشەڕی نێوان کۆمەڵە و حیزب[٥])

**هاونیشتمانە بەڕێزەکان**

**گەلی خەباتگێڕی کورد**

**حیزب و رێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی ئێرانی**

ئەندامانی کادر و پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. بەهەست کردن بە بەرپرسیاریەتی لە بەرانبەر گەلی ستەم لێکراوی کورد و هەموو گەلانی ئێران دا و بەسەرنج دان بەم راستییە کە تێک هەڵچوونی چەکدارانەی نێوان کۆمەڵە و حیزبی ئێمە لەچەند ساڵی رابردوودا زیانێکی زۆری بۆ بزووتنەوەی میللی دێموکراتیکی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران هەبووە، هەروەها بەمەبەستی بەڕێوەبردنی بەشێک

٥- رۆژنامەی کوردستان، ژمارە/ ١٣٤، واتە یەکەم ژمارەی دەرچوو لەلایەن ح. د. ک. ر. ش. دوایە ژمارەکان چاک کران و بەکردەوەش دەورەیەکی تازەمان دەست پێ کرد.

لەنێوەرۆکی ماددەی پێنجەمی ڕاگەیەندراوی دە ماددەیی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە لە ڕێکەوتی ١٣٦٧/١/١ دا بلاوکرایەوە، بۆ هەرچی بەهێزترکردن و بەرەو پێشتر بردنی ئەم بزوتنەوەیە، لە ڕێکەوتی ١٣٦٧/٢/١ ەوە بەشێوەی یەک لایەنە ئاگربەس ڕادەگەیەنین.

## حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ
## ١٣٦٧/١/٣٠

ئەو کارە بووە مایەی دڵخۆشی خەڵک بەتایبەتی کۆمەڵە کە پێشوازییەکی باشی لە مەسەلەکە کرد و جگە لەوەی وەڵامی موسبەتی بە ڕاگەیەندراوی ئێمە داوە دەگەڵ لایەنەکەی دیکەی حیزبیش ئاگربەسی ڕاگەیاند. بەداخەوە ئەوان نە تەنیا قەبووڵیان نەکرد، بەڵکو بەرانبەر بە کۆمەڵەش هەڕەشەیان دەست پێ کردەوە، دوو سێ ساڵ دواتریش شەڕ و کێشەکەیان هەر بەردەوام بوو. لەو ماوەش دا هەموو کات ئێمەیان بەوە تاوانبار دەکرد کە خوێنی شەهیدانمان بە کۆمەڵە هەرزان فرۆش کردووە !!

شەڕ و دووبەرەکایەتی توندتر دەبوو، ئەوەندەدان بەشەڕ پێ فرۆشتنی باڵی ناسراو بە ح. د. ک. ا بەڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ زەق کردنەوەی زیانەکانی شەڕی نێو خۆیی و هەوڵ و تێکۆشانەکانی لەم بوارەدا لەلایەک بووە هۆی سەلماندنی دروست و ئوسوڵی بوونی سیاسەتەکانی سەبارەت بەباوەڕ بەدێموکراسی و پلورالیزمی سیاسی بەتایبەت پێ داگرتن لەسەر ئەوە کە خەبات دژی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران ئەرکی هەموو کەسێکی دڵسۆز و شۆڕشگێڕ و هەموو لایەنێکی سیاسی خەباتگێڕە و کوردستان شوێنی ئەو خەباتە ڕەوایەیە بۆ هەموان، و لەلایەکی دیکەوە بووە هۆی پێکهاتنی پێوەندی دۆستانە لەسەر ئەساسی مافی بەرانبەر و ڕێزگرتنی دوو لایەنەی نێوان حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ و زۆربەی هێز و کەسایەتییە شۆڕشگێڕ و خەباتکارەکان.

لەو سەردەمەدا زۆر ڕاگەیەندراو و ئامیلکە بۆ وەڵام دانەوە بەهەڕەشە و گوڕەشەکانی ئەوان وێڕای وتارە ڕادیۆییەکانی دەنگی کوردستانی ئێران " سەبارەت بەدژایەتی لەگەڵ شەڕی براکوژی و پێویست بوونی تەفاهوم و تەنانەت دۆستایەتی و هاوکاری نێوان هەموو هێزە خەباتگێڕ و دێوکراتەکان لەلایەن ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕەوە بلاوکرایەوە.

سەرەڕای ئەو هەموو تێکۆشانە لەبواری پێوەندی لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی دیکە،

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ دەستی دایە ڕێکخستنی ریزەکانی خۆی. هەرچەند بواری مالی حیزب لاوازبوو بەڵام لەبواری تەبلیغی و چاپەمەنییەوە جیا لە چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی کوردستان، گۆڤاری سیاسی ئەدەبی٢٦ی سەرماوەز[٦] وەک گۆڤارێکی وەرزی و زۆر نامیلکەی جۆراوجۆری دیکە دەردەچوو.

بەزەحمەتێکی زۆر دەزگای رادیۆمان وەدەست هێنا و ڕۆژی یەکی مانگی مایس یا یەکی ئەیار ڕۆژی جیهانی کرێکار واتە ڕێکەوتی یازدەی بانەمەڕی ١٣٦٧ چل ڕۆژ دوای هەڵوێست گرتن دەستی بەکارکرد و لەژێر ناوی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران بەرنامەی بڵاوکردەوە.

لەسەر ئەو بنەمایە پڕ لەئیمان و برایەتییە و بڕوای قووڵ بەدرێژەدانی خەبات، بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەوانەی بە بەزیوو تەزیویان لەقەڵەم دەدایین حیزبەکەمان، دەستی کردەوە بە ڕێکخستنی هێز و کومیتە شارستانەکان و باقی ئۆرگانەکانی حیزبی. بۆ راکێشانی سەرنجی ئەوانەی کە بەدەلیلی ناڕازی بوون یا هەر هۆیەکی دیکە پێشتر دەستیان لەکاری حیزبی کێشابووە، لە کوردستانی عیراق یا هەندەران دانیشتبوون و هەر کام بەگوێرەی توانای خۆیان کاریان لە دەست دەهات و دەیانتوانی خزمەت بەجوولانەوە بکەن لەسەر بڕیاری ڕێبەرایەتی لە ڕێکەوتی یازدەی جۆزەردانی ٦٧ راگەیەندراوێک بڵاوکرایەوە کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

## راگەیەندراو[٧]

بۆ بەڕێوەبردنی بەندی نۆهەم لەبەیاننامەی دە ماددەیی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ کە لە ڕۆژی یەکەمی خاکەلێوەی ساڵی شەست و حەوتدا بڵاوکرایەوە، هەموو ئەو کادر و ئەندام و پێشمەرگانەی کە بەپێچەوانەی ئوسوڵی پەسەندکراو لە ئەساسنامەدا و بەپێی سیاسەتی چەوتی فراکسیۆنی شەرفکەندی قاسملۆ، بەدەلیلی بیروبۆچوونی سیاسی و (عقیدتی)یان بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە، بەناحەق وەلانراون و لە ناکام دا لەحیزب دەرکراون، یا دڵساردکراون و دانیشتوون، هەموو مافەکانی حیزبییان پێ دەدرێتەوە. ئەو کەسانە ئەگەر

٦- ئەم گۆڤارە پێشتر لەلایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە بڵاو دەبۆوە، دوای هەڵوێست گرتنی ڕێبەرایەتی بەهۆی کەم بوونەوەی کادر وازیان لێ هێنا.

٧- ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە١٣٤ ئۆرگانی کومیتەی ناوەندی دەورەی سێهەم جۆزەردانی ١٣٦٧.

نامادەبوونی خۆیان بەیەکێک لە ئۆرگانەکانی حیزب رابگەیەنن، پاش لێکۆڵینەوەی پێویست و لەبەرچاوگرتنی وەزعیەتیان لەلایەن ئەو ئۆرگانەی کە پێوەندی بەو کارەوە هەیە و پاش تەئییدی بەشی تەشکیلاتی ناوەندی دەبنەوە ئەندامی حیزب، بۆ ئاگاداریی زیاتر رادەگەیەنین: هەموو ئەو کەسانەی کە دەکەونە بەر حوکمی ئەو بەندەی کە ناومان برد مافەکانیان دەدرێتەوە و بەمەرجێک پلەی تەشکیلاتییان پێ دەدرێتەوە کە پاش گەڕانەوەیان بۆ حیزب نامادەبن لەیەکێک لەکومیتە شارستانەکان یان یەکێک لەهێزەکانی پێشمەرگە یان بەپێی پێویست لەیەکێک لە کومیتەکانی دەرەوەی وڵات یان ئۆرگانی ناوەندیی حیزب دا کاربکەن.

دیارە هەروەکو لەبەندی نۆی بەیاننامەی دە ماددەیی دا گوتراوە، ئەو کەسانەی کە خیانەت یان جینایەتیان کردووە یان بەتاوانی دزی و فەسادی ئەخلاقی لەحیزب دەرکراون ناتوانن بگەڕێنەوە نێو ریزەکانی حیزب.

هەروەها رێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەهەموو لاوە تێکۆشەر و شۆڕشگێڕەکان، چ ئەو کەسانەی کە لەنێوخۆی وڵات دان و چ ئەو کەسانەی کە بەناچار چوونەتە وڵاتانی دەرەوە داوادەکا بۆ بەهێزتر کردنی هەرچی زیاتری بزوتنەوەی میللی و دیموکراتی گەلی کورد و بزوتنەوەی سەرانسەری ئێران، ئەرکی شۆڕشگێڕانەی خۆیان بەرێوەبەرن و بێنە نێو ریزەکانی خەباتگێڕانی رێگای ئازادی و دیموکراسی لە کوردستانی ئێران دا و لەخەبات دژی رێژیمی کۆنەپەرست و دژی گەلی کۆماری ئیسلامی ئێران دا، یارمەتی پێشمەرگە قارەمانەکانی گەلی کورد بدەن.

**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**

**١٣٦٧/٣/١١**

رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ یەک دوو مانگی دوای هەڵوێست گرتن یەکێک لەکارەکانی بریتی بوو لە چارسەرکردنی گیروگرفتەکانی ئەداروکاتی و شوێنی ژیان و دابین کردنی پێویستییەکانی ژیانی ئەو ئەندام و کادر و پێشمەرگانە کە لەهەڵوێست گرتنەکە پشتیوانییان کردبوو. هەروەها رێکخستنی ئۆرگانەکانی حیزب و شی کردنەوەی سیاسەت و هەڵوێستەکانی رێبەرایەتی کە لەدەخاڵی بەیاننامەکەدا هاتبوون. دیارە رێبەرایەتی ئەرکی پێکهێنانی کۆنگرە یا کۆنفرانسێکیشی خستبووە بەر راوێژ و بەرنامەی کاری خۆی هێندێک لە ئەندامانی رێبەرایەتی و بەشێک لەکادر و پێشمەرگەکانی حیزب خوازیاری

پێک هاتنی کۆنگرە بوون و بەشێک داوای بەستنی کۆنفرانسیان دەکرد. دەلیلی خوازیارانی پێک هاتنی کۆنگرە ئەوەبوو کە پێش هەلوێست گرتن زۆربەی ئەندامانی حیزب داوای گرتنی کۆنگرەی نائاساییان کردووە، لەبەر ئەوە پێویستە کۆنگرە پێک بێ. بەشەکەی دیکە دەیانگوت کۆنفرانس بەپێچەوانەی کۆنگرە هاسانتر دەگیرێ و دەشتوانێ ئەو سەلاحیەتەی کە کۆنگرە هەیەتی ببێ.

ساغ بوونەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە دانرا بۆ دوای گرتنی کۆنفرانسی ئۆرگانەکان، کە پاشان زۆرایەتییەکی بەرچاو لە ئەندامان، کادر و پێشمەرگەکانی حیزب لەبڕیارنامەکانی خۆیاندا داوای گرتنی کۆنفرانسیان کرد هەر ئەوەش بوو بەبڕیار. وەدی هێنانی ئەو ویستەش هەر نیشاندەری بۆچوونی دێموکراتیکی رێبەرایەتی بوو.

پاش بەباس دانانی سیاسەتی پێشنیارکراوی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لەناو کادر و پێشمەرگە و هەموو ئۆرگانەکان، کۆنفرانسی ئۆرگانەکان بەڕێک و پێکی گیرا و لەگەڵ پشتیوانی دووبارە لەهەموو کۆنفرانسەکان دا لەسیاسەتی نوسولی و رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ و دانی پێشنیارە تازەکانیان و نووسین و ناردنی بڕیارنامەکانیان بۆ کومیتەی ئامادە کردن و ساغ بوونەوەی هەموو لایەک لەسەر پێویستی گرتنی کۆنفرانسی چوارەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە رۆژەکانی هەشتەم تا سێزدەهەمی پوشپەڕی ١٣٦٧ دا بەبەشداری ١١٣ کەس لەنوێنەرانی کومیتە شارستانەکان، هێزەکانی پێشمەرگە نوێنەرانی هەڵبژێردراوی کادرەکانی بنکەی ناوەندی حیزب، نوێنەرانی هەڵبژێدراوی ئەندامانی دانیشتووی حیزب لە شارەکانی کوردستانی عیراق، لە شاری رانیەی کوردستانی عیراق پێک هات. وەبیر خوێنەرانی بەڕێز دێنینەوە کە کۆنفرانسەکانی یەکەم و دووهەم و سێهەمیش لە ساڵەکانی ١٣٣٤ و ١٣٣٨ و ١٣٥٠دا هەر بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشە نێوخۆیەکانی حیزب پێک هاتوون و کەڵکی پێویستیان لی وەرگیراوە.

کاری رەسمی کۆنفرانس سەعاتی ٩ی بەیانی رۆژی هەشتی پوشپەڕ بە پەیامێکی کورتی بەتەمەنترین ئەندامی حیزب خوالێخۆشبوو عمولای مام سەعید کە وەک تەنیا میوانی کۆنفرانس بەشداری کردبوو دەستی پێ کرد بەدوای ئەودا راپۆرتی سیاسی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بە کۆنفرانس پێشکەش کرا.

ئەم کۆنفرانسە لەجەوێکی تەواو دێموکراتیکدا بەڕێوەچووە ئاکامەکانی شەش رۆژ کاری کۆنفرانس بریتی بوون لە:

پێداگرتن لەسەر خەباتی چەکدارانە دژی رێژیمی کۆماری ئیسلامی، پێداگرتن لەسەر

هەوڵ و تێکۆشان بۆ هاوکاری لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئۆپۆزسیۆن، پێداگرتن لەسەر پاراستنی ئەسڵی سانتراليزمی دیموکراتیک لەحیزبدا.

هەروەها لەبەرچاوگرتنی حەق و مافەکانی ئەندامان بۆ دەربڕینی بیروباوەڕ و ڕەخنە و هەڵبژاردن و هەڵبژێران، ڕاست کردنەوەی ئەو خاڵانەی بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆ کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەشەکەی دیکەی حیزب دەستکاری کرابوون تەئکیدیان لەسەر کرا.

هەڵبژاردنی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و جێگرەکانیش یەکێک لە ئەرکەکانی کۆنفرانس بوو. بڕیارنامەیەکی سیزدە خاڵیش لەکۆتایی کۆنفرانس لەلایەن بەشدارانی کۆنفرانس پەسەند کرا. لەسەر نێوی حیزبیش بەتێکڕای دەنگ ناوی داندراویان پەسەند کردەوە.

لە ژێرەوە چەند بەشی کورت و گرنگ لە ڕاپۆرتی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، بڕیارنامەی پەسەند کراوی کۆنفرانس و لیستی ئەندامان و جێگرەکانی کومیتەی ناوەندی، هەڵبژێردراوی کۆنفرانسی چوارەم دەکەوێتە بەرچاوتان.

لە پێشەکی ڕاپۆرت دا سەبارەت بەپشتیوانی کۆمەڵانی حیزبی و ڕێکخراوە خەباتگێڕەکان لە ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ هاتووە کە[٨] "پشتیوانی کۆمەڵانی حیزبی و تەئییدکردنی حەرەکەتی شۆڕشگێڕانەی ئێمە لەلایەن زۆربەی نزیک بەتەواوی ڕێکخراوە سیاسییەکان بەتایبەت لەو بارەوە زۆر گرینگە کە دوای بڵاوبوونەوەی هەڵوێستی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، لایەنی دیکە لە ڕاگەیەندراوێک دا داوای لە خەڵکی کوردستان، کادر و پێشمەرگەکان و کۆمەلانی حیزبی کرد کە ئەو ڕێبەرایەتییە بایکوت بکەن. بەڵام بەکردەوە هەموو شتێک بەپێچەوانەی چاوەڕوانی ئەوان کەوت، چونکە نەک هەر ڕێکخراوە سیاسییەکان و کۆمەڵانی حیزبی ئێمەیان بایکوت نەکرد، بەڵکو بەهۆی ئوسووڵی بوونی هەڵوێستەکانی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بەشێوەی جۆراوجۆر یارمەتییان کردین و پێوەندی خۆیان لەگەڵ حیزب زیاتر پەرە پێدا.

سەبارەت بەوەزعی نێو نەتەوەیی لە بەشێک دا هاتووە کە[٩] (لەحاڵێک دا ناگری شەڕە ڕزگاریخوازە نەتەوایەتییەکان لەزۆر بەشی ئەم جیهانەدا بڵێسەی بەرز دەبێتەوە و لەحاڵێکدا کە دوو وڵاتی هەرە بەهێزی جیهان بە گەورەترین قۆرخانەی چەکی ئەتۆمییەوە لەبەرامبەر یەکتردا ڕاوەستاون و مەترسی شەڕی ئەتۆمی هەڕەشە لەخەڵکی جیهان دەکا، چاوپێکەوتنی ڕێگان، سەرۆک کۆماری ئەمریکا و گۆرباچۆف، سکرتێری گشتیی حیزبی

٨- بەڵگەنامەکانی کۆنفرانسی چوارەمی ح. د. ک ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ.

٩- بەڵگەکانی کۆنفرانسی چوارەمی ح. د. ک. ا. ر.

کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەت لەمۆسکۆ دەتوانێ سەرەتایەکی باش بێ بۆ لەنێو بردنی چەکی ئەتۆمی، لابردنی شەڕی هەستەیی و وەدی هاتنی ئاشتی لە رادەی جیهانیدا... و کەم بوونەوەی ئالۆزبوونیش لەپێوەندییەکانی ئەم دوو وڵاتەدا دەتوانێ شەپۆلی نوێی دێموکراسی لە وڵاتانی سوسیالیستیدا زۆر بەهێز بکا.

لە راپۆرت دا سەبارەت بەوەزعی ئێران بەم جۆرە ئەتیجە گیری کراوە[١٠]:

لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا کە رێژیمی ویلایەتی فەقیە لەتەواوی بوارەکانی ژیانی خۆیدا لەگەڵ بن بەست و قەیرانی مەرگ هەمیشە رووبەڕوو بووە و لەحاڵێک دا کە رق و بێزاری کۆمەلانی ملیۆنی گەلانی ئێران لەم رێژیمە بەو پەڕی خۆی گەیشتووە، یەکیەتیی بە کردەوەی هەموو هێزە خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕەکان بۆ رووخاندنی رێژیمی سەدەکانی ئێودڕاستی کۆماری ئیسلامی و هێنانە سەرکاری رێژیمێکی دێموکراتی پێویستیەکی بێ ئەم لا و ئەولایە.

لە راپۆرت دا سەبارەت بەوەزعی کوردستان هاتووە کە:

بێ گومان چارەنووسی گەلی کورد لەهەر بەشێکی کوردستان بەهیچ جۆر لەچارەنووسی باقی گەلان و خەڵکەکانی دانیشتووی هەر کام لەو وڵاتانە جیاواز نییە. هەر بۆیەش خەبات لە رێگای وەدەست هێنانی مافی ئەتەوایەتیی گەلی کورد دەبێ بەهاوپێوەندی لەگەڵ گەلانی دیکەی ئەو وڵاتانە بەڕێوەبچێ. گەلی کورد دەتوانێ بەدابین کردنی مافی ئەتەوایەتی خۆی بەشێوەی خودموختاری لە یارمەتی زانستی و ئابووری گەلانی برای خۆی و هەروەها لە پشتیوانی ئەوان بەهرەمەندبێ.

چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لەهەر کام لە بەشەکانی کوردستان ئەگەر دابین کردنی مافی رەوای ئەم گەلەی لەگەڵ بێ، بەقازانجی ئەو وڵاتەش دەبێ. چونکە وەدی هاتنی ئەم مەسەلەیە بارێکی قورس لەسەرشانی دەوڵەتەکەش لادەباو عەلاقە و دڵبەندی خەڵکی کوردستانیش بەپتەوکردنی هەرچی زیاتری پێوەندی لەگەڵ ئەتەوەی فەرمانڕەوا و گەلانی دیکەی وڵاتەکەش بەهێزتر دەکا:

بڕیارنامەی کۆنفرانسی چوارەمی حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ[١١]

١- راپۆرتی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بۆ کۆنفرانس بەتێکڕای دەنگ پەسەندکرا.

---

١٠- هەمان سەرچاوە.

١١- رۆژنامەی کوردستان ژمارە/١ دەورەی سێهەم پوشپەڕی ١٣٦٧ .

٢- دەگەڵ تەنیدی ڕاگەیەندراوی دە ماددەیی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، داوا لە ڕێبەرایەتی داهاتوو دەکەین بۆ بەجێ گەیاندنی زیاتری خاڵەکانی ڕاگەیەندراو تێ بکۆشێ.
٣- بەلەبەرچاوگرتنی هەل و مەرجی گشتی لەئێران و لاوازیی ڕۆژ لەڕۆژ زیاتری ڕێژیم لەهەموو بوارەکانی ئابووری سیاسی و نیزامی وێڕای بەهێزتر کردنی خەباتی چەکدارانە بە دژی ڕێژیم، پتەوکردنی تەشکیلاتێکی شۆڕشگێڕانە کە وەڵامدەری ئەم هەل و مەرجە بێ پێویستییەکی بنەڕەتییە. بۆیە کۆنفرانس داوا دەکا، ڕێبەرایەتی هەڵبژێردراوی کۆنفرانس گرنگییەکی تەواو بدا بەتەشکیلات کە بتوانێ ئەرکەکانی خۆی لەهەموو کات و بوارێکدا بەتەواوی بەڕێوەبەرێ هەروەها کۆنفرانس ڕای دەربڕی کە پێویستە بەشی پەروەردە واتە (ئاموزش) لە پاڵ بەشی تەشکیلات بۆ پەروەردە کردنی کادر و پێشمەرگە و بەشی نهێنی تەشکیلات دابمەزرێ.
٤- بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردنی ژنان و لاوان لەنێو ریزەکانی پێشمەرگەدا کەمتەرخەمی زۆر کراوە. داوا دەکەین بەڕێوەبەری حیزب بۆ ئەو مەبەستە گرینگە بەرنامەی دروست و عەمەلی بۆ داهاتوو هەبێ.
٥- کۆنفرانس بڕیاری خائینانەی شەڕی براکوژی فراکسیۆنی شەرفکەندی- قاسملوو مەحکوم دەکا و داوا دەکا ڕێبەرایەتیی داهاتوو هەموو هەوڵ و تێکۆشانی خۆی لەدەردەوە و ناوەوەی وڵات بەکاربێنێ بۆ پێشگیری لەشەڕ، لەهەمان کاتدا کۆنفرانس ڕادەگەیەنێ بەرپرسیاریەتی هەر چەشنە ڕووداوێکی دڵتەزێن لەئەستۆی سەرانی فراکسیۆن و بەڕێوەبەرانیەتی و لەبەرامبەر مێژوو و گەلی کورد دا بەرپرسن.
٦- ڕێبەرایەتی داهاتووی حیزب پێویستە بەهاوکاری هەموو کادر و پێشمەرگەکان بەشێوەیەکی گونجاو هەوڵ بدا ئەو کادر و پێشمەرگانەی کە لەولا ماونەوە لەسەر سیاسەتە چەوتەکانی فراکسیۆن ڕوون بکاتەوە و داوایان لێ بکا بگەڕێنەوە نێو ریزی حیزبی دیموکراتی کوردستان، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ.
٧- کۆنفرانس ڕاگەیاندنی ئاگربەسی یەک لایەنەی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکرات لەگەڵ کۆمەڵە پەسەند دەکا و بە هەنگاوێکی دروست و بەقازانجی جووڵانەوەی میللی دیموکراتیکی گەلی کوردی دەزانێ.
٨- کۆنفرانس لەهەل و مەرجی ئێستادا ئیمکانی پێک هاتنی بەرەیەکی دیموکراتی دژی ئیمپریالیستی نابینێ، بۆیە حیزبی دیموکراتی کوردستان کە بۆ وەدەست هێنانی دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان خەبات دەکا، دەبێ تێبکۆشێ هەتا

پێک هاتنی زەمینەی بەرە دەگەڵ هەموو ئەو هێزانەی کە بۆ رووخاندنی رێژیمی کۆماری ئیسلامی و هێنانە سەرکاری رێژیمێکی دێموکراتی خەبات دەکەن، هاوکاری و یەکیەتی بەکردەوەی هەیێ.

٩- کۆنفرانس شەڕی کۆنەپەرستانەی ئێران و عێراق مەحکوم دەکا و رێژیمی کۆماری ئیسلامی بە بەرپرسی درێژەدانی ئەم شەڕە وێرانکەرە دەزانێ، هەروەها کۆنفرانس لە تێکۆشانی نێو نەتەوەیی و بڕیارنامەی ژمارە (٥٩٨)ی ئەنجوومەنی ئاسایش سەبارەت بەکۆتایی پێ هێنانی ئەم شەڕە پشتیوانی دەکا.

١٠- کۆنفرانس پشتیوانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ و گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە راپەڕینی گەلی فەلەستین لەخاکی داگیرکراو و جولانەوەی ئەم گەلە لە رێبەرایەتی رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین رادەگەیەنێ و کردەوەی سەرکوتکەرانەی رێژیمی ئیسرائیل بەتوندی مەحکوم دەکا.

١١- کۆنفرانس بە رێبەرایەتی داهاتووی حیزبی ئەسپارد بۆ ناساندنی جولانەوەی میللی دێموکراتی گەلی کورد بەگەلانی جیهان و راکێشانی سەرنج و پشتیوانی بیروڕای گشتی لەدەرەوەی وڵات بەپێی ئیمکان هەنگاو هەڵێنێ.

١٢- کۆنفرانس بەتێکڕای دەنگ بۆ هەنگاوی مێژوویی و تێکۆشانی تا ئێستای رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ رێزدادەنێ و درێژەدانی ئەم سیاسەتە دروستە بە رێبەرایەتی داهاتوو دەسپێرێ.

١٣- کۆنفرانس لەسەر بەڕێوەچوونی حیزب بەشێوەی سانترالیزمی دێموکراتیک پێ دادەگرێ و پەرەپێدانی دێموکراسی لەدەرەوەی حیزب تەوسیە دەکا.

لە کۆنفرانسی چواردا ئەو کەسانەی ژێرەوە بۆ ئەندامەتی کومیتەی ناوەندی و جێگری هەڵبژێردراون:

## ئەندامانی کومیتەی ناوەندی:

---

١- کاک جەلیل گادانی
٢- کاک حەسەن رستگار
٣- = هاشم کەریمی
٤- = فەتاح کاویان
٥- = سەید برایم کەریمی
٦- = حوسێن مەددەنی
٧- = عەلی کاشفپور
٨- = عوسمان رەحیمی
٩- = کەمال کەریمی
١٠- = شاپور فیروزی
١١- = صدیقی بابانی
١٢- = نەبی قادری
١٣- = عومەر شریف زادە
١٤- = نەبوبەکر راد
١٥- = سەرهەنگ قادری
١٦- = مظفر متران
١٧- = شاپور شجاعی فرد.

**جێگرەکان:**

١- کاک فەیسەڵ نیراندوست
٢- = رەحیم ساڵح زادە
٣- = محەممەد مرودتی
٤- = مەلا خدر عومەر زادە
٥- = مراد مهرەبان
٦- = ئەمیر قادری

بەدوای کۆنفرانسی چواردا رۆژی یازدەی پوشپەری ٦٧ یەکەمین پلینۆمی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ پێک هات کە لەودا نووسەری ئەم دێرانە بەتێکڕای دەنگ بەسکرتێری گشتی حیزب هەڵبژێردرا، هەروەها کاک حسن رەستگار وەک جێگری سکرتێر، کاک فەتاح کاویان، کاک حوسێن مدنی و کاک نەبی قادری بە ئەندامەتی دەفتەری سیاسی حیزب هەڵبژێردران. هەر لەم پلینۆمە دا کاک عوسمان فەتاحی، کاک رشاد حسینی کاک نجم الدین زۆر ئەسنا و کاک بهادر شکاک وەک ئەندامی موشاویری کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردران.

# بەشی سێهەم

لە ڕێکخستنی وەزعی حیزب پێش گرتنی کۆنفرانسی چوار و هەروەها دوای کۆنفرانسیش ئەو کۆمیسیۆنانە پێک هاتن و بە شێوەیەکی جیددی خەریکی کاروباری خۆیان بوون:

کۆمیسیۆنی تەشکیلات "ڕێکخستن" هاوڕێیان جەلیل گادانی، سەرهەنگ ئیرەج قادری، ئەبوبەکری راد، مەلا خدری عومەر زادە (دۆڵەگەرمی)...، کۆمیسیۆنی رادیۆ و چاپەمەنی هاوڕێیان فەتاح کاویان، هاشم کەریمی، حەسەن ئەیوب زادە (مامۆستا گۆران)، عوسمان ئیسماعیلی (مامۆستا عاشق)، مامۆستا بێبەش، کۆمیسیۆنی پێوەندییەکان کاک حسن رستگار، کەماڵ کەریمی، سەعید بیگزادە، حەمەخان مرودتی، کومیسیۆنی ماڵی کاک حسێن مەددنی، کاک ئەمیری قادری، کاک مستەفا قازی، کۆمیسیۆنی کۆمەڵایەتی کاک ئەبی قادری، مەلا محەممەد عوسمانی، سەید محەممەد کولیجی، جەعفەر مەنگوری.

هەروەها مەڵبەند و کۆمیتە شارستانەکان لە ساڵی ١٣٦٧دا بە شێوەی خوارەوە بوون:

مەڵبەندی سپی سەنگ کاک مراد مهربان و کاک خدر زارع مەسئولی پیرانشار و ئەندامی مەڵبەند و کاک حاجی گولاوی فەرماندەری هێز.

مەڵبەندی شیمالی کوردستان کاک عەلی کاشف پور و کاک عیصمت عبدی، کاک شاپور شجاعی فر و کاک بهادر و کاک سەعید کە مەسئولی نیزامی بوو

مەڵبەندی ١ی جنوبی کوردستان کاک شاپور فیروزی، کاک رشاد حوسێنی، کاک بورهان روحانی.

مەڵبەندی ٢ مام رئوف، سالح دیواندەرەیی...

کومیتەی شارستانی مهاباد کاک سەید برایم کەریمی، کاک رەحیم ساڵح زادە، کاک فەتاح رێحانی فەرماندەری هێز.

کومیتە شارستانی بانە کاک عوسمان فەتاحی و کاک ئەحمەد محەممەد نژاد، کاک فەتاح ئیلخانی زادە فەرماندەری هێز.

کومیته شارستانی شنۆ کاک مراد ئەحمەدی و کاک ک. ع، مام یوسف سولتانی فەرماندەی هێز.

کومیتەی بۆکان هاوڕێ حوسێن، کەریم بابەکری، حوسێن محەمەدی.

کومیته شارستانی هەورامان کاک موزەفەر میتران مەسئول، کاک فەیسەل نیراندوست، کاک نەجم الدین زورنەسنا.

کۆمیته شارستانی سەردەشت مەلا خدر عومەر زادە (دۆڵەگەرمی) کاک هاشم رۆستەمی و مەلا برایم دۆڵەگەرمی بەرپرسی نیزامی، عەزیز ئەحمەدی.

وەرزی کار و تێکۆشانی کادر و پێشمەرگەکانی حیزب لەناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان، دەستی پێ کرد، کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ کە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی شۆڕشگێرانەی خەباتی سیاسی نیزامی دژی ڕێژیمی دژیگەلی و کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامی خۆیان ئامادە کردبوو، لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان دا تێکۆشانی خۆیان دەست پێکرد و سەرەڕای بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان لەبواری سیاسی و تەشکیلاتی دا، زۆر زەبری گورچوبڕیشیان لەهێزە بەکرێگیراوەکانی ڕێژیم وەشاند. ئەوە لەحاڵێکدا بوو کە ئەفرادی بەشەکەی دیکەی حیزب بەردەوام پێشیان پێ دەگرتن و خەریکی پیلانگێڕان و لێدانی کادر و پێشمەرگەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بوون.

لە ئەنجامی ئەم پیلانانە و بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتانەیان دا بەدەستووری ڕێبەرایەتی بەشەکەی دیکەی حیزب ڕۆژی ٦٧/٦/٤ کادری دڵسۆز و لێهاتوو و ئەندامی کومیتەی شارستانی سەقزی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، کاک حەسەن ئیسلامی لەناوچەی خورخورەی سەقز بەدەستی ئەفرادی ئەوان دەگیرێ و زۆر ناجوامێرانە ئیعدامی دەکەن.

لەدرێژەی ئەم بۆچوون و دوژمنایەتییەدا لەکاتێکدا پێشمەرگەکانی هەردوو هێزی پێشەوا و بەیانی حیزبمان لەناوچەکانی مەهاباد و بۆکان قاردمانەتیان لەخۆنیشان دابوو چەند شەڕی قارەمانانەیان لەگەڵ بەکرێگیراوانی ڕێژیم کردبوو، ئیمکانات و تەقەمەنیان لێ برابوو و داوایان کردبوو کەل و پەلی پێویستیان بۆ بنێرین و لەم پێوەندییەدا دەستەیەکی کارنامە لەپێشمەرگەکانی مەڵبەندی سپی سەنگ بەرەو یارمەتی دانیان دەچوون لەناوچەی سنووری ئێران و عێراق هەر لەلایەن چەکدارەکانی بەشی دیکەی حیزب ڕێگرییەکی ئاشکرا بەرانبەر هاوڕێیانمان دەکەن کە دەبێتە هۆی ئەوە کە شەڕێکی خوێناوی

سازیێ. ڕۆژی ٦٧/٦/٢٤ کاک خدر زارع بەرپرسی کومیتەی شارستانی پیرانشار و ئەندامی مەڵبەندی سپی سەنگ لەکاتێکدا لەو ناوچەیە لەبنکەی هاوڕێیانی حیزبی شیوعی خەریکی پشوودان دەبێ دەکەوێتە بەر دەستڕێژی ئەفەرێکی بەشەکەی دیکەی حیزب و شەهید دەکرێ.

هەروەها ڕۆژی ٦٧/٦/٣٠ کاک بابەکر خضری ناسراو بە وشیار جێگری فەرماندەی لک لە هێزی قەندیل و کاک قادر خۆش نەمک پێشمەرگەی هێزی شەهید پێشەوا هەر لە درێژەی ئەو شەڕە سەپێندراوە دا شەهید دەکرێن.

ئەوە لەکاتێکدایە کە چەند کادری لێوەشاوە و فیداکاری حیزبمان بەناوەکانی عوسمان فەتاحی ئەندامی موشاویری کومیتەی ناوەندی، ڕەشید عوسمانیفەر، تاهیر غفوری و سەلیم کاویان و مستەفا مستەفایی لە ناوچەیەکی بانە، عەلی دەروێش، عەلی گۆمەڵیانی، جەلال کاکیلی و جەواد شێخ محەممەدی لەناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان لە شەڕی نابەرانبەر دەگەڵ بەکرێگیراوانی ڕێژیم گیانیان بەخت کردبوو.

سەرەڕای ئەوەش حیزبی ئێمە هەستی بە بەرپرسایەتی کرد و لە ڕێگەی ڕادیۆ دەنگی کوردستانەوە ڕادیۆی حیزبی دێموکرات ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕەوە خەڵکی کوردستانی لەم تاوانە ئاگادار کرد و بۆ تەواوبوونی شەڕ داوای هاوبیری و یارمەتی لی کردن. عەینی هەواڵەکان لە لاپەڕی ١٦ی ڕۆژنامەی ژمارە ٣ی کوردستان ئۆرگانی کومیتەی ناوەندی ح.د.ک.ر.ش دا چاپ کراون.

ماوەیەکی کورت پاش کۆنفرانسی چوارەم و بەدوای قەیرانەکانی قووڵی کۆمەلایەتی، سیاسی، ئابووری، لەژێر زەختی بیروڕای گشتی، سەرەنجام ناڵ و گۆڕێکی گرینگ لەوەزعی ئێران دا هاتە گۆڕێ. ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی بەناچاری ڕۆژی ٢٧ی پوشپەڕی ساڵی ١٣٦٧ بڕیارنامەی ٥٩٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی قەبووڵ کرد.

دەفتەری سیاسی لە ڕێکەوتی ١٥ی گەلاوێژی ٦٧ی هەتاوی دا بەم بۆنەیەوە ڕاگەیەندراوێکی بلاوکردەوە کە دەقەکەی بەشێوەی خوارەوەیە:

# «راگەیەندراوی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ[1]»

هاونیشتمانە بەڕێزەکان..

خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان:

ڕێژیمی دژی گەلی کۆماری ئیسلامی بەهۆی فشاری قەیرانە توندەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و ئیزامییەوە، سەرەنجام بڕیارنامەی ٥٩٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی قەبووڵ کرد و ڕۆژی دووشەممە ٢٧ی پووشپەڕی بەڕەسمی ڕاگەیاند. قەبووڵ کردنی ئاگربەس و ئیعتراف بەتێکشکان تەنانەت بۆ بەرپرسانی پلەی خوارووی ڕێژیم چاوەڕوان نەکراو بوو، کە لەو پێیەدا ئیعتراز و موخالەفەتیان کرد. ڕەفسەنجانی و دەست و پێوەندەکەی ناچار بوون وەک هەمیشە پەنا بۆ خومەینی بەرن و داوای یارمەتی لێ بکەن. لە ئاکام دا خومەینی، ڕۆژی چوارشەممە ٢٩ی پووشپەڕی ١٣٦٧ لەوپەڕی داماوی و پەریشانی دا قەبووڵ کردنی بڕیارنامەی ٥٩٨ی تەئیید کرد و بەشێوەی ئاسایی هۆی قەبووڵکردنی بڕیارنامەکەی بەخوانیسبەت دا. هەر لەو حاڵەدا خومەینی کە قەبووڵکردنی ئەو بڕیارنامەی تەنانەت لە خواردنەوەی ژەهر کوشندەتر لەقەڵەم دا، بە ئاشکرا هەڕەشەی کرد کە هیچ کەس مافی لێکۆڵینەوە و پرسیارکردنی لەو بارەوە نییە.

گەلی چەوساوەی کورد!

خەڵکی دڵ بریندار و ڕەنج دیتووی سەرانسەری ئێران!

ڕێژیمێک کە ماوەی ٩ ساڵ خەڵکی کوردستانی قەڵاچۆکردووە، ڕێژیمێک کە ماوەی ٨ ساڵ لاوەکانی وڵاتی ئێمەی لەشەڕی کۆنەپەرستانەی ئێران و عێراق دا بەکوشت داوە، ڕژێمێک کە ئابووری وڵاتی لەنێو بردووە، ڕێژیمێک کە زۆر زیانی قەرەبوو نەکراوەی بە فەرهەنگ و شارستانیەتی گەلانی ئێران گەیاندووە، ئێستا دەیەوێ بەتەبلیغاتی درۆ و فروفیشاڵ هەموو شکان و وێرانکارییەکانی داپۆشێ و خۆی لەرووخانی بێ ئەم لاونەولای ڕزگار بکا. ئامانجی ڕێژیم لەقەبووڵ کردنی ئاگربەس ڕێکخستنەوە و ڕێک و پێک کردنەوەی ئەرتەش و سوپای دژی خەڵکی پاسدارانە کە لەم دواییانەدا بەشێوەیەکی بەرچاو تووشی ئاڵۆزی بووە، تا بەم جۆرە بتوانێ بزوتنەوەی ڕەوای گەلی ئێمە سەرکوت بکا و گەلانی دیکەی ئێران لەزنجیری دیلی دا ڕابگرێ.

١- ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە/ ٢ دەورەی سێهەم گەلاوێژ و خەرمانانی ١٣٦٧.

لەوەزع و حالێکی ئەوتۆدا و بەسەرنج دان بەهەموو ئەو قەیرانانە کە سەرانسەری وجودی رێژیمیان داگرتووە، ئەرکی هەموو هێزە خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕەکانی کوردستان و سەرانسەری ئێران ئەوەیە کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ناکۆکییەکانی گرووهی و عەقیدەیی، وێڕای توند تر کردنی خەباتی چەکدارانە لەرێگای یەکیەتی کردەوە و پتەوکردنی هاوپێوەندی هەرچی زیاتردا هەنگاوی جیدی هەڵێننەوە.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بە لەبەرچاوگرتنی وەزعی ئێستا و سەرنج دان بە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی ئێران و کوردستان و بزوتنەوەی رەوای گەلی ئێمە دژی رێژیمی ستەمکاری کۆماری ئیسلامی لەهەموو هێزە خەباتگێڕ، دێموکرات و شۆڕشگێڕەکانی سەرانسەری ئێران بەگشتی و لەکۆڕ و رێکخراو و حیزب و شەخسیەتە خەباتگێڕەکانی کوردستان بەتایبەتی داوا دەکا کە بۆ گەیشتن بە یەکیەتی کردەوە هەنگاو هەڵێننەوە، حیزبی ئێمەش لەو بوارەدا نامادەی هەر چەشنە هاوکارییەکی پێویستە. هەروەها داوا لە فراکسیۆنی شەرفکەندی قاسملووش دەکەین دەست لەهەڕشە و چەک کێشان لە حیزب و رێکخراوەکانی دیکە هەڵگرن و لەرێگای قازانجەکانی خەڵکی کوردستان و بزوتنەوەی رەوای کوردستان دا هەنگاو هەڵێننەوە.

**دەفتەری سیاسی**

**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران،رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**

**١٥ی گەلاوێژی ١٣٦٧**

قەبووڵ کردنی ئاگربەس لەلایەن کۆماری ئیسلامییەوە بەمانای کۆتایی هاتن بەقەیرانەکانی زاڵ بەسەر ئێران دانەبوو، بەڵکو ئەو قەیرانانە رۆژ بەرۆژ توندتر دەبوون و کاربەدەستانی رێژیم لە رووخانی رێژیمەکەیان دەترسان. بۆیە بە رێنوێنی خومەینی لەهەموو لایەکەوە وەخۆ کەوتن تا بەپێک هێنانی فەزای ترس و نیگەرانی لەنێو خەڵکدا بەر بەپەرسەندنی رق و بێزاری خەڵک بگرن. رێژیم بۆ گەیشتن بەم مەبەستە بەهەموو هێزی خۆیەوە و لەسەرانسەری ئێران دا بەشێوەیەکی دڕندانە دەستی دایە کوشتاری بەکۆمەڵی زیندانییە سیاسییەکان.

جەلادەکانی رێژیم لەهەموو بەندیخانەکانی ئێران دا و تەنانەت لەمەیدان و شوێنە گشتییەکانی شارەکانیش دا سێدارەیان چەقاند و دەستە دەستە بەندییە سیاسییەکانیان ئێعدام کرد. زۆر لەو کەسانە کە وەبەر شەپۆلی ئەم ئێعدامانە کەوتن ئەوانە بوون کە

ماوەی مەحکومیەتیان تەواوببوو یان لەو کەسانە بوون کە پێشتر ئازاد کرابوون و دووبارە گرتبوویانەوە.

توندبوونی سەرکوت و زەبر و زەنگ و شەپۆلی ئیعدامەکان گەیشتە رادەیەک کە لە راگەیەنە گشتییەکانی جیهان و کۆڕ و کۆمەڵە ئینسان دۆستە نێونەتەوەییەکان دا بەشێوەیەکی بەربڵاو دەنگی دایەوە و بوو بەهۆی رەخنەو ئیعترازێکی زۆر و، رێژیم بەتوندی مەحکوم کرا، کوردستانیش وێڕای باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران کەوتە بەر ئەم پەلامارە دڕندانەیە و ژمارەیەکی بەرچاو لە رۆڵەکانی کوردستانیش لە زیندانەکان دا ئیعدام کران.

لەو وەزعە نوێیەدا کە دەبوو هەموو هێزە سیاسییەکانی ئۆپۆزسیۆن هەنگاوی جیددی بۆ هاوکاری بە کردەوە و خەباتی یەکگرتووانە دژی کۆماری ئیسلامی هەڵێننەوە، پاوانخوازانی بەشەکەی دیکەی حیزب دوور لە ئینساف و مەنتق هەروا درێژەیان بە ئاژاوە گێڕی و شەڕ پێ فرۆشتن بە پێشمەرگەکانی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ دەدا و هێرشیان دەبردەسەر ئێمە چەند کەسییەکانی کە لەناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان دا خەریکی تێکۆشانی سیاسی و نیزامی دژی رێژیم بوون.

بۆ نموونە لە ناوچەی بانە دوای ئەوەی هاورێیانی ئێمە بەدەسەڵاتی تەواوەوە واحیدێکی پێشمەرگەی ئەوان لەخەوی غەفڵەت هەڵدەستێنن و رەخنەیان لی دەگرن و پێیان دەڵێن عەیبە بۆ ئێشکتان نییە و هەمووتان خرپ لێی خەوتوون بەجێیان دێڵن[٢] دوایە هەر ئەم واحیدە فێڵ لە هاورێیانی ئێمە دەکەن گەمارۆیان دەدەن و هەموویان چەک دەکەن و تەنانەت پێیان دەڵێن نابی بچنەوە لای رێبەرایەتی دەبێ بچن خۆتان تەسلیمی حکوومەت بکەنەوە.

هەروەها لە بەندەنەکانی ناوچەی گەورکایەتی هێرش دەکەنە سەر هاورێیانمان و جگە لە شەهیدکردنی یەک دووکەس پێشمەرگەیەکی ئازاش بەناوی کامران جەمیانی کە بریندار دەبێ هەر لەوێ گوللە بارانی دەکەن. نموونەی دیکە لەم بابەتە زۆرن و لەشوێنی خۆی ناوی شەهیدەکانی تری ئەو شەڕە ناڕەوایە دەبەین.

---

٢- ئێمە کادر و پێشمەرگەی خۆمان تەوجیە کردبوو کە کە خۆ لەشەڕ و بەرخورد دەگەڵ ئەوان بپارێزن مەگەر هێرشیان بکرێتە سەر کە ئەودەم مافی دیفاعیان هەیە ئەوە لەحاڵێک دابوو کە پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ، رێبەرایەتی شۆرشگێر بەپێچەوانە، لەژێر رێنوێنی رێبەری حیزب دا بەرخوردی برایانەیان لەگەڵ ئەفرادی ئەوان هەبووە و تەنانەت لەچەند شوێن ئامۆژگارییان کردوون و یارمەتییان داون.

یەکێک لەو ئەرکانەی کە لە پلینۆمی دووهەمی دوای کۆنفرانسی چوار کەوتبووە سەر شانی ڕێبەرایەتی، گرنگی دان بەکاری تەشکیلاتی و پەروەردە کردنی کادر و پێشمەرگەکان و ئەندامانی حیزب بوو. بۆ ئەم مەبەستە لەهەر دەرفەتێکی لەباردا کلاسی ئاموزشی دادەندرا و بۆ ڕێکخستن و شانە بەندی ئەندامان و لایەنگرانی حیزب و نواندنی دەوری بەرچاو لەبوارە جۆراوجۆرەکانی خەباتی جەماوەری خەڵکی کوردستان دا هەوڵێکی زۆر درا و لەم پێناوەدا چەند کادری زانا و ڕۆڵەی تێکۆشەر و ئەمەگناسی گەلەکەمان شەهید کران. بۆ وێنە کاک ڕەشاد حوسێنی ئەندامی مشاویری کومیتەی ناوەندی کە دوای چەند مانگ کار و تێکۆشانی نازایانە لە شارەکانی جنوبی کوردستان بەتایبەت کرماشان و سنە، لە شاری سنە کەوتە داوی بەکرێگیراوانی ڕێژیم و دوای تەحەمولی ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆر لە زینداندا ئیعدام کرا. هەروەها مامۆستا عەلی ئیبراهیمی کادری بەوەج و تێکۆشەری کومیتەی شارستانی مەهاباد کە بەمەبەستی پێکهێنانی تەشکیلاتی ئەهێنی خەریکی تێکۆشان بوو لە شوێنێک بەناوی دەروازە هەڵکەوتوو لەبەینی دوو ناوچەی ئەڵێن و گەدەی لە بەشی مەنگوڕایەتی بەدەستی بەکرێگیراوانی کۆماری ئیسلامی شەهید کرا. هاوڕێ خالید خورشیدی یەکێدی لەو کادرە باشانەی کومیتەی مەهاباد بوو، هەر لەو پێناوەدا گیرا و پاش دوو ساڵ زیندان کێشان ئیعدام کرا.

ڕێکخستنەوەی ئەندامانی حیزب لە ئەورووپا کە بەنووسراوە و پەیام پشتیوانی خۆیان لەهەڵوێست گرتنی ڕێبەرایەتی دەربڕیبوو، دامەزراندنەوەیان بەشێوەی کومیتە لە وڵاتەکان، هەروەها دامەزراندنی دەفتەر و ناوەندێک لە پاریس بۆ چاوەدێری بەسەر کاروباری تەشکیلاتی و دیپلۆماسی بەشێکی تر لە ئەرکە پێ ئەسپێردراوەکان بوو کە پلینۆم تەئکیدی لەسەر کردبوو. بۆ ئەم مەبەستە یەکەم هەیئەت کە بریتی بوو لە کاک حەسەن ڕەستگار و کاک کەماڵ کەریمی بەرەو دەرەوە بەڕێ کرا کە پێوەندییان بە زۆر حیزب و کەسایەتی و لایەنی خاریجی و ئێرانی و کوردستانییەوە لە چەند وڵات گرت و هاوڕێیانی حیزبیان لەو شوێنانەی چوون سازمان دایەوە.

لە نێوەڕاستی مانگی خەرمانانی ٦٧ دا کومیتەی هاوپێوەندی لەگەڵ خەباتی دیموکراتیک لە ئێران دا پێک هات حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ وێڕای ئەنجوومەنی لایەنگرانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران لە پاریس (ئەنجوومەنی خوێندکارانی ئێران لە فەڕەنسا، لایەنگرانی ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران اقلیت) بۆڵتەنی پەنابەرەکان، ڕێکخراوی کرێکارانی شۆڕشگێڕی ئێران ڕاد

کارگەر واحیدی پاریس، کانوونی ئیبلاغی بیر و بڕوای شەریعەتی ئیرشاد، خوێندکارانی ئێران لە فەڕەنسا، لایەنگرانی پێشووی پەیکار، لایەنگرانی رێکخراوی وەحدەتی کۆمۆنیستی لە ئورووپا، لایەنگرانی موجاهیدین انقلابی، پشتیوانی خۆیان لە پێک هاتنی راگەیاند.

ئەو کومیتەیە خەبات دژی پاشماوەی رێژیمی پاشایەتی و رێژیمی کۆماری ئیسلامی کردۆتە بناغەی تێکۆشانی خۆی و لەگەڵ ئەو رێکخراوانەی کە بەکردەوە لەسەرکوت کردنی خەڵک و دژی مافە دیموکراتیکەکانی خەڵکی ئێران بەشدارییان کردووە، هاوکاری ناکا.

ئەم کومیتەیە راگەیەندراوێکی بڵاوکردەوە کە ئەم مەبەستانەی تێدابوو:

١- تێکۆشانی هەڵسووڕاوانە بەمەبەستی کۆتایی هاتنی هەرچی زووتری ئەو ئیعدام و گرتنانە کە ئێستا لە ئێران دا کۆماری ئیسلامی بەڕێوەیان دەبا و ئازادی هەموو زیندانییە سیاسییەکان.

٢- تێکۆشان بۆ بەرگری لەسەرکوت و زەبروزەنگی نیزامی سیاسی، ئیدئۆلۆژیک و ئابووری رێژیمی ئێران لە کوردستان دا و پشتیوانی لەمافی چارەنووسی گەلی کورد.

٣- هەوڵدان بۆ کۆتایی هێنان بە تەحویل دانەوە یا دەرکردنی پەنابەرەکان و ئەو ئێرانییانەی داوای پەنابەری دەکەن.

ئەو کومیتەیە لە یەکەمین هەنگاوی دا بۆ پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد و مەحکوم کردنی جینایەتەکانی رێژیمی کۆماری ئیسلامی لە کوردستان راگەیەندراوێکی بڵاوکردبۆوە کە ئەوەش کورتەیەک لە دەقەکەیەتی:

کوردستان گۆڕەپانی شەر، مەتەرێزی خەبات و ئازادی ماوەیەکی زۆر پێش دەسپێکردنی شەڕی ئێران و عێراق واتە لە یەکەمین بەهاری پاش رووخانی رێژیمی شادا کوردستان لەلایەن رێژیمی تازە بەدەسەڵات گەیشتووەوە بەخوێن سوور کرا.

گەلێکی قارەمان کە یەکگرتووانە بۆ وەدیهێنانی مافە سەرەتاییەکانی راپەڕیبوو لە لایەن رێژیمی تازەی جێنشینی شای دیکتاتۆر شەڕێکی خوێناویی بەسەردا سەپێنرا.

پیلانی ئەو رێژیمە لە کوردستاندا بەم چەشنەیە:

١- دامەزراندنی هەزاران بنکە و ناوەندی نیزامی و بڵاوکردنەوەی ٣٠٠ هەزار ئەرتەشی و پاسدار لە کوردستان.

٢- کوشتنی دەیان هەزار کەس لە خەڵکی ئاسایی، لەجەریانی هێرشی نیزامی رێژیم بۆ سەر کوردستان.

٣- کوشتاری بەکۆمەڵی هەزاران زیندانیی سیاسی و ئیعدامی پەیتا پەیتا و فشاری سیاسی، ئابووری فەرهەنگی و...
بەڵام بەربەرەکانی کۆمەڵانی زەحمەتکێش و ئەو ڕێکخراوانە کە هیچ کات لەخەبات دژی ڕێژیم ئەوەستاون و هەروەها پەرە گرتنی خەباتی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵانی خەڵک و خەباتی چەکدارانەی پێشمەرگەکان، کوردستانیان کردە سەنگەری خەبات و ئازادی.
با ڕێگا نەدەین ڕێژیم شەڕی خۆی لەگەڵ گەلی کورد درێژە بدا و بە کۆکردنەوەی هێزی ئیزامی و فشاری کۆمەڵایەتی و ئابووری زەبروزەنگی خۆی لە کوردستان زیاتر بکا. با لە داخوازە ڕەواکانی گەلی کورد پشتیوانی بکەین.

**کۆمیتەی هاوپێوەندی لەگەڵ خەباتی دێموکراتیک لە ئێران**
**ئەوەی یەکەمی سێپتامبری ١٩٨٨**

کاری دیپلۆماتیک بەمەبەستی پەرەپێدانی پێوەندی نێوان حیزب و ڕێکخراوەکانی ئەورووپایی و لەقاودانی جینایەتەکانی کۆماری ئیسلامی یەکێک لەو بوارانەیە کە لەحیزبی ئێمە دا گرینگی تایبەتی پێ درابوو و ناردنی هەیئەتی نوێنەرایەتی بۆ دەرەوەی وڵات و پێک هێنانی پێوەندی ڕۆژانە دەگەڵ هاوڕێیان لە وڵاتانی ئەورووپایی درێژەی هەبوو.
هەر بۆیە لەماوەیەکی کەم دا نەتەنیا کومیتەکانی حیزبی لە وڵاتانی وەک فەڕەنسا، ئوتریش، ئەلمان، سوئید، هولەند.. پێک هاتەوە بەڵکو لە پاریسی پایتەختی فەڕەنساش دەفتەرێکی ناوەندی بۆ کۆنترۆل و بەڕێوەبردنی کارەکان پێک هات کە سەرەڕای کەم ئیمکانی بەهەوڵی خۆیان توانیان بۆشاییەکان پڕکەنەوە.
ئەوانەی ئەو کات دەفتەری پاریسیان بەڕێوەدەبرد بریتی بوون لە: کاک ڕەحمان کریم زادە، کاک کاوە مەدەنی، کاک سمایل ماملی، کاک تاهیر ئەقشی، خوشکە ژیلا بەتحایی. بەشێکی بەرچاو لەهاوڕێیانی دیکەش وەک ئەمیر ئیزەدپەناو خەلیل پێشنماز و ئیقباڵ محەمەدی کارەکانی کومیتە و ڕێکخراوەیی حیزبیان بەڕێوە دەبرد. تێکۆشان بەرادەیەک

بەرچاوبوو کە لەماوەیەکی کورت دا حیزبەکەمان لە زۆربەی ولاتانی ئەورووپا جگە لە ئەندام و لایەنگرانی کورد لەنێو شەخسیەت و هێزە سیاسییەکانیش دا حیسابی بۆ دەکرا.

جارێک بابەکی ئەمیر خوسرەوی لە وتووێژێک بۆ رۆژنامەکەیان دەگەڵ کاک دوکتور قاسملوو لێی پرسیبوو سەبەب چییە "ئێوە بەم جیابۆوانە لە حیزب هەر دەڵێن بەزیووتە زیون، لەحاڵێک دا ئەوەی ئێمە لێرە دەیبینین زۆربەی ئەندامانی حیزب لایەنگری زۆر لەئەوان دەکەن و گەلێک لە ئەوانەی ئێوە تێکۆشەرترن.

جێگەی خۆیەتی سوپاسی زەحمەتی ئەو کەسانە لەو چەند ولاتە بکەین کە لە سەرەتای هەڵوێست گرتنەوە کۆمیتەیان پێک هێناوەتەوە و تێکۆشاون. هولەند کەریم کاشفپوور، کەریم کاکە سووری، رەحمان ئەقشی، ئالمان کامەران و کەژاڵ کولیجی، جەمال کەریمی، ناسر ئێرانپور، دانمارک، رەحمان خوش ابرو، عیزت پیرانی، عەباس شەریفی، سوئید رەحیم محەممەد زادە، سەلاح گادانی، محەممەد ئەمین رەشیدی، رووپاک مراد رەسولی، نوتریش قادر رەسولیان، عەلی مازوجی، تاهیر ئەردەلان، خوسرەو حەسەن خالی. بەریتانیا ئیسماعیل بایزیدی، مەولود سوارە، فەرانسە، رەحمان کەریم زادە، کاوە و سەلاح مەددنی، ئیقبال محەممەدی، تاهیر ئەقشی و ئەمیر ئیزەدپەنا و خانەو سمایلی ماملی.

بێگومان ئەو کارە زۆرە پێویستی بەهاوکاریی هەموو هاورێیانی دیکە لەم ولاتانە هەبووە کە بەگشتی زەحمەتەکانیان جێگەی پێزانینە بەڵام ئەگەر ناوم نەهێناون لەبەر ئەوەیە شتەکە دوور و درێژ نەبێتەوە. دەنا خوا هەڵناگرێ ماڵ و ژیانی زۆربەیان لە ئیختیاری حیزب دابووە.

کارێکی دیکەی کە حیزبی ئێمە بەحەق بۆی چوو، وەک ئەرکێک بۆ جێبەجێ کردنی هەوڵی دا، پێ راگەیشتن بە بنەماڵە ئاوارەکانی کادر و پێشمەرگە و بەتایبەت بەکەم ئەندامەکان بوو.

کەم ئەندامەکان بەر لە هەڵوێست گرتن لە شوێنێک بەنێوی ئاسایشگا، وەک پەککەوتە چاویان لی دەکرا و هیچ کار و ئیشێکی ئەوتۆیان نەبوو. لە ئاکام دا تووشی چەشنە شکستێکی نەفسی و رووحی دەبوون کە وردە وردە بێ کاری و بێ سەرگەرمی شوێنەواری لەسەر ئەعسابیان دادەنا و وەڕەز دەبوون. بۆیە لەم بارەوە رێبەری بڕیاری دا هیچ کەمئەندامێکیش نابێ بێکار بێ و پێویستە بەگوێرەی وەزعی خۆیان کاریان بۆ بدۆزرێتەوە و مەشغوول بن تا هەست بەکەسایەتی خۆیان وەک پێشمەرگەی کار لێهاتوو بکەن. جگە

لەوش قەرار درابوو بەپێی توانا هەوڵ بۆ بەڕێ کردنیان بۆ دەرەوە و وڵاتەکانی ئەورووپایی بدرێت تا بتوانن خۆیان عیلاج کەن و بەردەو چاک بوونەوە بچن و بۆ حیزبیش بەکەڵک بن.

هەروەها سەبارەت بە بنەماڵەکان بڕیار درا کە لەو حاڵەتە سەرگەردانییە دەرخرێن و بۆ ئەوەی شوێنەواری مەنفی لەسەر کاری حیزبی دانەنێن و هەم منداڵەکانیان بۆ دواڕۆژی کوردستان پێ بگەن بەپێی توانا بنێردرێنە دەرەوە. بۆ ئەوەی ئەو هێزە ئینسانییە دەست و پێ گیر و مەسرەفکەرە، هەلومەرجی ژیانیان بگۆڕدرێ و لە دەرەوەش بەپێی توانای خۆیان کاری حیزبی بکەن. لەم بوارەش دا سەرکەوتنێکی بەرچاو هەبوو، لەماوەی دوو ساڵ دا زیاتر لە ٥٠ بنەماڵە کە زۆربەیان هی کەم ئەندامەکان بوون بەڕێ کران.

یەکیەتی لاوان لەسەر ئەزەری ڕێبەرایەتی دامەزرایەوە و زۆریش تێدەکۆشان و کاریان بەرچاو بوو ژنانیش بۆ کار و خەبات هان دران بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکی تەشکیلاتی شانەبەندی کران و بۆ خوێندنیش هەوڵیان بۆ درا لە یەکەم مانگەکانی دوای هەڵوێست گرتن دا کلاسیان بۆ داندرا و زۆربەی نەخوێندەوارەکان خوێندەوار کران.

کۆڕی پەروەردە و فێرکردن لە پەروەردە کردنی لاو و قوتابییەکان دا هەروەها بۆ خوێندەوار کردنی پێشمەرگەی کەم سەواد یا بێ سەواد دەوری گرینگی بینی. بۆ پەروەردە کردنی پێشمەرگەی تازە هاتووش بەشێک بەنێوی پەزیرش کرایەوە کە دوای لێ پرسین و موتمانە پێکردنیان دەچوونە ژێر تەعلیمی سیاسی و نیزامی و ماوەی دوو مانگ خەریکی فێربوونی دەرسی سیاسی و ئەرکی نیزامی دەبوون و دوایە دەدران بەناوەندەکان.

سەرەڕای دوژمنایەتی کردنی ناڕەوا و دوور لە ئینسانی بەشەکەی دیکەی حیزب، بەپێچەوانەی ئەو هەموو هێرشانەی لە شوێنەکانی جۆراوجۆر دەیانکردە سەر پێشمەرگە و کادرەکانی حیزبمان، ورەی پۆڵایینی هاوڕێیانمان زیاتر دەبوو، تێکۆشان و چالاکی کادر و پێشمەرگە قارەمانەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ هەروا بەردەوام بوو و لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان زەبری گورچوبڕیان لەدژی گەلییەکان دەوەشاند.

تا سەرەتای ساڵی ٦٨ واتە لەماوەی ساڵێک دا لە ئەنجامی ئەم چالاکییانە دا ژمارەیەک لە باشترین کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ گیانی خۆیان بەختی ئازادی و ڕزگاری گەلە چەوساوەکەیان کرد کە بریتین لە:

١- کاک عەلی دەروێش　　جێگر لک لەهێزی قەندیل
٢- عوسمان فەتاحی　　ئەندامی مشاوری کومیتەی ناوەندی
٣- سەلیم کاویان　　بەرپرسی کومیتەی شارستانی رەبەت
٤- تاهیر غەفوری　　ئەندامی کومیتەی شارستانی بانە و بەرپرسی ناوچەکانی حەوتەوانە مەیدانان.
٥- رەشید عوسمانی فر　　= = = = = = =
٦- مستەفا مستەفایی　　کادری کومیتەی ناوچەکانی حەوتەوانە و مەیدانان.
٧- جەلال کاکیلی　　پێشمەرگەی هێزی شەهید پێشەوا
٨- جەواد شێخ محەمەدی　　کادری کۆمیتەی ناوچەی گەورکی یەکی مهاباد.
٩- علی گۆملیانی　　پێشمەرگەی هێزی قەندیل.
١٠- فەرەیدون میرزایی　　مەڵبەندی شیمالی کوردستان.

هەر لەو ماوەدا بەداخی گرانەوە چوار کادر و پێشمەرگەی تێکۆشەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بەهۆی پیلانگێڕی و هێرشی دوژمنانەی ئەفرادی بەشەکەی دیکەی حیزب شەهید کران کە بریتین لە:

١- حەسەن ئیسلامی　　ئەندامی کومیتەی شارستانی سقز.
٢- خدر زارع　　بەرپرسی کومیتەی شارستانی پیرانشار و ئەندامی ناوەندی سپی سەنگ.
٣- بابەکر خزری　　جێگری لک لە هێزی قەندیل.
٤- قادر خوشنمک　　پێشمەرگەی هێزی شەهید پێشەوا.
٥- موتەڵلیب ئەبیزادە　　کادری کۆمیتەی مهاباد.

رۆژی چواردەی جۆزەردانی ١٣٦٨[٣] خومەینی پاش دە ساڵ حکومەتی زاڵمانە بەسەر ئێران و هەوڵ و تەقەللا بۆ سەقامگیر کردنی یەکێک لە کۆنە پەرست ترین رێژیمەکانی ئەم سەردەمە مرد.[٤] مردنی خومەینی بوو هۆی خۆشحاڵی گەلانی چەوساوەی

---

٣- خومەینی رۆژی ١٣ مردووە، ناخوندەکان بۆ ئەوەی نحوسەتی سێزدەی (بەقەولی خەڵکی دیکە) پێوە دیارنەبێ کردوویانەتە چاردە و رەسمییەتیان داوەتێ.

٤- خومەینی پاش ئەو هەموو زیانەی لەگەلانی ئێرانی دا و ئەو کوشتارە بێ وێنە و ئەم دوژمنایەتییە گەورەی دەگەڵ کورد کردی مردا

ئێران و هەموو ئەو ئازادیخواز و تێکۆشەرانەی کە ئەویان وەک سەمبولی جینایەت و کۆنەپەرستی دەهاتە پێش چاو. بێ شک ئەو جینایەتانەی خومەینی بەتێکڕا لە ئێران و بەتایبەتی سەبارەت بە کوردستان کردوویەتی، هەڵدەگرێ چەند کتێبی لەسەر بنووسرێ تا خەڵکی دنیا و ئێران لەڕادەی کۆنەپەرستی، خوێنڕێژی و دژی گەلیبوونی حاڵی بن.

ڕۆژی ۲۲ی پوشپەڕی ئەو ساڵە دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو سکرتێری بەشەکەی دیکەی حیزب و کاک عەبدوڵلا قادری ئەندامی کومیتەی ناوەندی و فازل ڕەسوڵ لە شاری ویەن پێتەختی ئوتریش لەسەر مێزی وتوویژ لەگەڵ دیپلۆماتە تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران بەناوەکانی صحرارودی، حاجی مستەفەوی و بزرگیان تیرۆر کران.

دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لە ڕاگەیەندراوی ڕۆژی ٢٤ی پوشپەڕی خۆی بەم بۆنەوە وێڕای مەحکوم کردنی جیددیی کۆماری ئیسلامی، داوای لە دەوڵەتی ئوتریش کرد کە لێپرسراوان بۆ دۆزینەوە و سزادانی بەڕێوەبەرانی ئەو جینایەتە سامناکە هەنگاوی جیددی و خێرا هەڵێنێتەوە لە کۆڕ و کۆمەڵە نێو ئەتەوەییەکانیشی داوا کرد هەرچی زیاتر سیاسەتی تیرۆریستی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران لەقاوبدەن و مەحکومی بکەن.

لەم ڕاگەیەندراوە دا ئەم تیرۆرە وەک ناکامی سیاسەتی وتوویژخوازانە لەگەڵ ڕێژیمێک کە ناوەڕۆکی جینایەتکارانەی بۆ هەموو کەس ئاشکرا بووە، هەڵسەنگێندرابوو. بەداخەوە پێ داگرتن لەسەر ئەم سیاسەتە هەڵەیە و هەڵبژاردنی ڕێگەی وتوویژ خوازی دەگەڵ ڕێژیمێک کە ئیمامەکەی بە ئاشکرا چەند جار درۆی لەگەڵ کوردان کردبوو، بوو بەهۆی ئەوە کە ڕێژیمی کۆنەپەرست و دژی گەلی کۆماری ئیسلامی ئێران زەبری ئاوا دڵتەزێن لە بزوتنەوە ڕەواکەمان بوەشێنێ و خەم و پەژارەیەکی زۆر کوردستان و گەلی کورد دابگرێ و کەسایەتییەکی ئاوا ناسراو و زانا و بەئەزموون لەناو بچێ.

نزیک بەدوو ساڵ لەتێکۆشانی بێ وچانی کادر و پێشمەرگەکان کە بەکورتی ڕیزی کاردکان لەلاپەڕەی پێشوودا پێشکەش کرابوو، بە پێی ئوسووڵ باسێکی سیاسی تێروتەسەلی لەهەموو بوارەکان دا لەسەر کرا و پوختەی ئەو باسە پیادەکرا و وەک ئەزەری سیاسی ڕێبەرایەتی خرایە بەرچاوی کادر و پێشمەرگەکان و بۆ هاوڕێیانی دەرەوەی کوردستانیش ئێردرا، لەهەموو ئۆرگانەکان بەشێوەی فەردی یا جەمعی خوێندرابۆوە و هەر کەس و هەر کام لەواحیدە گچکەکانیش و تەنانەت هەر کەسێکی خاوەن ئەزەری تایبەتی خۆشی بووە، بۆچوونەکانی خۆیان لە کۆنفرانسەکان دا باس کردبوو، هەر کۆنفرانسێک

راوبۆچوونی گشتی نەفەراتی خۆی وەک پێشنیار لەبڕیارنامەیەک دا گونجاندبوو دابوویان بەنوێنەرانی هەڵبژێردراوی خۆیان بۆ کۆنگرە، وێنەیەکیش بۆ جەمع بەندی پێش کۆنگرە درابۆوە بەکومیتەی ئامادەکردنی کۆنگرە. کۆنفرانسەکان زۆر زیندوو گیرابوون و بەشداری چالاکانەیان لەسەر نەزاردتی سیاسی و پێشنیاردکانی ڕێبەری حیزب کردبوو، بیروڕای خۆشیان بەڕوونی دەربڕیبوو.

پاش ئەوەی هاوڕێیانی دانیشتووی ولاتانی دەرەوەش نوێنەرانی خۆیان دیاری کرد و لە ئامادەگی خۆیان بۆ هاتنەوە ئاگاداریان کردینەوە، ڕێگە و شوێنی گەڕانەوە بۆ کوردستانیان بۆ دیاری کرا، یەک یەک و دوو دوو گەیشتنەوە و خۆیان بەکومیتەی ئامادەکردنی کۆنگرە ناساند. ڕاپۆرتی کومیتەی ناوەندیش ئامادەکرابوو، نوێنەرانی هێز و ڕێکخراوەکان ئامادەبوون. زەمینە بۆ بەڕێوەچوونی کۆنگرە بەتەواوی خۆشکرابوو.

# بەشی چوارەم

لە رۆژی ۲۱ی گەلاوێژی ساڵی ۱۳٦۹ ی هەتاوی لە گوندی قەڵا سەیدەی دۆڵی شاورێ کە ناوچەیەکی دڵگیری سەر بەشاری رانیە بوو، کۆنگرەی نۆهەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ دەستی بەکاری خۆی کرد و لە ۲۸ی مانگ دا کۆتایی بەکارەکانی خۆی هێنا.

لەو کۆنگرەیەدا کە نوێنەرانی هەڵبژێردراوی ئۆرگانەکان و رێکخراوەکانی حیزب لە کوردستان و هەروەها بە پێچەوانەی کۆنفرانسی چوار کە بەهۆی گیروگرفتی هاتوچۆ نوێنەرانی دەرەوەی وڵات تێدا بەشدار نەبوون، نوێنەرانی هەڵبژێردراوی چەند وڵاتی ئەورووپاییش تێدا بەشداربوون. دوای رێ و رەسمی سەرەتایی وەک خوێندنەوەی سروودی میللی و بێدەنگی بۆ شەهیدان، کردنەوەی کۆنگرە و پێشکەش کردنی راپۆرتی کومیتەی ئامادەکردن: راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرە کە دوایە بەنێوی بەڵگەکانی کۆنگرە چاپ و بڵاوکرایەوە لەلایەن منەوە وەک سکرتێری حیزب پێشکەشی بەشداران کرا و خوێندرایەوە.

لەم راپۆرتەدا لێکدانەوەیەک لەسەر وەزعی جیهان بەتایبەتی ئاڵ و گۆڕەکانی ئەو دواییانە لە وڵاتی سۆڤیەت و وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات و، رۆژهەڵاتی نێوەڕاست کرابوو. هەروەها هەل و مەرجی ئەو کاتی ئێران و کوردستان و تێکۆشانی حیزب (دەستنیشان کردنی خاڵە لاواز و بەهێزەکانی) لەنێوان کۆنفرانسی چوارەم تا ئەو کات، خرابووە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەو راپۆرتە پاش ئەوەی چەند سەعاتی لەسەر دوان، بەهێندێک تێبینییەوە بەتێکڕای دەنگ لەلایەن کۆنگرەوە پەسەند کرا.

بەشەکانی دیکەی کاری کۆنگرە بریتی بوون لە باس کردن لەسەر ناڵ و گۆڕە پێشنیار کراوەکان لەلایەن کومیتەی پێڕەو و پرۆگرام، پەسەند کردنی بڕیارنامەی پێشنیار کراوی کومیتەی بڕیارنامە و هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەسڵی و جێگرەکانی کومیتەی ناوەندی.

وەک پێشتر باس کرا بەشێک لەم راپۆرتەی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرە لەپێوەندی دەگەڵ ئەو گۆڕانەدا بوون کە لەیەکیەتی سۆڤیەت و ولاتانی ئەورووپای رۆژهەلات هاتوونە پێش. لەم بەشەدا هاتووە.[1]

"وەلاتانی دیمۆکراتیسم لەزۆربەی کاروباری بەڕێوەبردنی ولات، لەژێر پێنانی شێوە هەڵبژاردنی ئازادانە و داسەپاندنی ئەفرادی بێ سەلاحیەت بەسەر ئۆرگانە جۆراوجۆرەکانی دەولەتی و نێو دەولەتی دا، پەرەپێدانی بوروکراسی و دانی زۆر ئیمتیازی نابەجێ بە رێبەرانی حیزبی و دەولەتی، بەڕێوەبردنی بەرنامەی نادروستی کاربەدەستانی دەولەت و بەرپرسانی حیزبی کۆمۆنیست هەم لەباری سیاسی و کۆمەلایەتی و هەم لەباری پێویستییەکانی ژیانەوە، بلاوکردنەوەی ئاماری ناڕاست سەبارەت بە دەستکەوتەکان لەهەموو بارێکەوە و پەنابردن بۆ تەبلیغات و - لەهەمووی ئەوانەش گرینگتر جێبەجێ نەکردنی مەسەلەی میللی گەلانی یەکیەتی سۆڤیەت بەو جورەی کە لە ئوسوولی سۆسیالیزم و یاسای ولات داهاتووە - هەروەها خەرجی زۆر قورسی نیزامی کە ئەوانی کێشابووە کێبەرکێیەکی سەیر و سەمەرەی تەسلیحاتی بەتایبەتی لە بواری فەزاییدا دەگەڵ ولاتێکی دەولەمەندی وەکوو ئەمریکا و بلووکی غەرب بەتێکرا.

ئەوانەی باس کران و زۆر هۆی گەورە و بچووکی دیکە دەستیان دایە دەستی یەک و ولاتی یەکیەتی سۆڤیەتیان بەرەو گیروگرفت و قەیران راکێشا."

راپۆرت لە لێکدانەوەی وەزعی ئێران بەمردنی خومەینییەوە دەست پێدەکا و دەڵێ:

"خومەینی دوای دە ساڵ جینایەت و کوشت و کوشتار و بێ ئەوەی لەشەڕی کۆنەپەرستانە و لە (صدور انقلاب)ەکەی دا سەرکەوتنی وەدەست هێنابێ مرد و رێژیمەکەی بەدنیایەک گیروگرفت و ولاتەکەمانی بەنیوە وێرانی و بێ سەر و سامانی و گەلانی ئێرانی بە برسییەتی و بێ دەردەتانی بەجێ هێشت.

بێجگە لە ١.٥ تا ٣ ملیۆن پەنابەری ئەفغانی رادەی پێنج ملیۆن کەس ئێرانی بێکارن، رۆژنامەی کیهانی رێکەوتی ٦٨/٣/١٨ لە قەولی مهندس محلوجی وەزیری معادن و فلزاتەوە دەنووسێ ٪ ٨٠ خەلک لەژێر خەتی فەقر دا دەژین.

---

١- بەلگەکانی کۆنگرەی نۆهەمی ح.د.ک.ریبەرایەتی شۆڕشگێڕ ٢١ تا ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٦٩.

هەمان رۆژنامە لەرێکەوتی ٦٨/٥/١٥ نووسیویەتی سێ ملیۆن لە منداڵانی ٥ تا ١٤ ساڵە لە ساڵەکانی ٦٧، ٦٨ دا نەیاتوانیوە بچنە قوتابخانە.

رۆژنامەی کیهان لە رۆژی ٦٨/٥/١٦ دا نووسیویە: " پێنج ملیۆن نەفەر رۆژانە تەنیا ٦ تمەن داهاتیان هەیە، سێ ملیۆن بنەماڵە جێگای ژیانی باشیان نییە و سێ لەیەکێ حەشیمەتی تاران لەخراپترین وەزع لەباری مەسکەنەوە دەژین.

رێژیم جگە لەو چەند ملیاردەی کە قەرزدارە کیسەی بۆ وەرگرتنی ٣٨ ملیار دۆلار قەرزی دیکە لەدەولەتان هەڵدرووە.

زۆربەی وڵاتان بەتایبەت وڵاتانی ئیمپریالیستی وایان دەزانی کە بەهاتنە سەرکاری رەفسەنجانی و بوونی بە سەرۆک کۆمار سیاسەتی زەبر و زەنگ تەواو دەبێ و رێژیم بەرەو نەرمتر بوون هەنگاو دەنێ یان هەر نەبێ دەستدرێژی بۆ سەر ژیانی (خصوصی) ئەفراد کەم دەبێتەوە و لە ئاکام دا دەتوانن بەبوونی ئەمنیەت لە ئێراندا سەرمایە گوزاری بکەن!"

کەچی دوای مردنی خومەینی، ئاخوندەکان بەداپۆشینی ئەو گیروگرفتانەی کە وەک میراتێکی شووم بۆیان بەجێ ماوە و بۆ ئەوەی کە پێش بەجم و جۆڵی خەڵک بگرن، سیاسەتی کوشت و بڕ و زەبروزەنگ، کە دوای قەبووڵ کردنی ئاگربەس و پاش مەرگی خومەینی دەستیان پێکردبوو، درێژەیان داو بگرە زۆریش توندوتیژییان کرد. ئیعدامی بەکۆمەڵی بەندییە سیاسییەکان لەهەموو بەندیخانەکانی سەرانسەری وڵات بەرهەمی ئەم سیاسەتە بوو".

راپۆرت دوای روون کردنەوەی وەزعی نالەباری رێژیم لەهەموو بوارەکان دا روو لە ئۆپۆزسیۆن دەکا و دەڵێ:

هۆیەکی دیکەی کە بەمانەوەی رێژیم یارمەتی دەدا، هەبوونی ناکۆکی و دژایەتی لەنێو ئۆپۆزسیۆن بەگشتی و و ئۆپۆزسیۆنی شۆڕشگێڕ بەتایبەتییە. لەحاڵێک دا کۆنەپەرستانی حاکم لەکاتی حستەم و پڕ مەترسیدا، وەختێک مەسەلەی مان و نەمانی رێژیمەکەیان دێتە گۆڕێ، تێکڕا پشتی یەک دەگرن و بەهەموویانەوە بەرهەڵستی دوژمنانی خۆیان دەبنەوە، حیزب و رێکخراوە خەباتکار و شۆڕشگێڕەکان هەتا ئێستا نەیانتوانیوە لەسەر بەرنامەیەکی هاوبەش بۆ رووخانی رێژیم رێک کەون و ئەوەش شتێکە کە هەتا ئەمڕۆ کۆنە پەرستی بەقازانجی خۆی کەڵکی لی وەرگرتووە."

راپۆرت لەو بەشەدا جارێکی دی پێ لەسەر پێویستی هاوکاری بەکردەوەی هێزە خەباتکار و دێموکرات و شۆڕشگێڕەکان لەچوارچێوەی کوردستان و لەرادەی ئێران دادەگرێ

و ئەم کارە بە پێویستییەکی بێ ئەملاو ئەولا دەزانێ و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە (هەر جۆرە دەمار گرژییەکی بۆ ئەم یا ئەو بیروباوەڕی تایبەتی) لەدژی بەرژەوەندی گەلەکەمان هەڵدەسەنگێنێ. پێوانەش بۆ ئەم هاوکاری و دۆستایەتییە بڕوای تەواو بەدێموکراسی و مافی گەلان و بەڕەوا زانینی ماف و خەباتی گەلی کوردە.

راپۆرت لەسەر کوردستان بەر لەهەموو شت باسی زیانی شەڕی ناوخۆیی دەکا کە بەخۆشییەوە دەگەڵ کۆمەڵە تەواو بووە، بەڵام شەڕفرۆشی و توندوتیژی لایەنەکەی دیکە هەر ماوە و تائێستاش خاو نەبوونەوە و هەروا خوازیاری شەڕن. راپۆرت ئەو چەند پاراگرافەی ژێرەوە زیاد دەکا کە هەر کام بەمەبەستێک هاتوون.[2]

لە سالی رابردوو و بەهاری ئەمساڵ دا لەلایەن دۆستانی گەلی کورد و جولانەوە هێندێک هەولی خێرخوازانە بۆ تەواو کردنی شەڕ و لێک نزیک بوونەوەی حیزبی ئێمە و فراکسیۆن درا، بەڵام بەداخەوە لەبەرخۆ بەزل زانینی سەرکردەکانی ئەو جەماعەتە و بەهۆی بۆچوونە چەوتەکانیان ئەو هەولانە بێ ناکام مانەوە.

سیاسەتی نوسولی حیزبی ئێمە هەروەکو لە کۆنفرانسی چوارەمدا دەستنیشان کراوە هاوکاری بەکردەوە لەگەڵ هەموو هێزە خەباتکار و دیموکرات و شۆڕشگێڕەکانە لەچوارچێوەی کوردستان و لەڕادەی ئێران دا. بۆیە سیاسەتی نالەباری ئەو جەماعەتە نایێ کار بکاتە سەر سیاسەتی نووسولی حیزبەکەمان و بەڕووداوی ناخۆش هەرچەند دڵتەزێنیش بێ دەست لەو شێوە پەسەندە هەلگرین.

حیزبی ئێمە پێویستە هەموو هەولی خۆی بدا، هەروەکو تا ئێستا هەولی داوە شەڕ و کێشە و ناکۆکی نێو لایەنەکانی بزوتنەوە لە رێگەی هێمنانەوە چارسەر بکا. بۆ لێک نزیک بوونەوەی هێز و رێکخراوە کوردستانییەکانی ئێران تێبکۆشێ و بۆ یەکیەتی بەکردەوە و بۆ لێک نزیک کردنەوەی حیزب و رێکخراوە ئێرانییەکان هەوڵ بدا.

حیزبی ئێمە سەرەڕای ئەوە کە بەخەباتی چەکدارانە درێژە دەدا، ئەم خەباتە بەتەنیا شێوەی خەبات نازانێ و بۆیە تێدەکۆشێ زیاتر لەجاران دەگەڵ شێوەکانی دیکەی خەبات لێکیان گرێ بدا.

حیزبی ئێمە لە پێوەندی دەگەڵ هەر هێزێکی سیاسی ئێرانی کە بەکردەوە بیروبڕوای بە دێموکراسی هەبێ و بڕوای بەدیاریکردنی مافی چارەنووسی گەلان بەشێوەیەک لەشێوەکان هەبێ، وەک دۆستی ستراتیژێکی خۆی چاوی لێ دەکا.

۲- راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی نۆهەمی ح.د.ک.ر.

بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە ئەو جەماعەتە لە دوایین پلینۆمی خۆیان دا کە لەمانگی خاکە لێوەی ئەمساڵ دا گیراوە ئاشکرا تر لە جاران سیاسەتە چەوتەکانی خۆیان دەرخستووە، حیزبی ئێمە وەک هەمیشە لەتەواوی ئەو هێز و شەخسیەتانە کە کورد یا دۆست و دڵسۆزی کوردن داواکارە بۆ مەحکوم کردنی کردەوەی شەڕخوازانەی ئەوان و تەواو کردنی شەڕی خۆماڵی شێلگیرانە هەوڵبدەن.

لە کۆتاییدا جێگای خۆیەتی کە جارێکی دیکەش دەگەڵ شەهیدانی سوور خەڵاتی حیزب و گەلەکەمان، دەگەڵ بنەماڵەی شەهیدان و کۆمەڵانی ئەمەگناسی گەلی کورد پەیمان و بەڵێنی خۆمان تازە کەینەوە کە هەتا وەدی هێنانی ئامانجی پیرۆزی حیزب و گەلە ستەم لێکراوەکەمان هەروا شێلگیرانە بەخەباتی حەقخوازانەی خۆمان درێژە بدەین).

بەر لەوەی بچینە سەر بڕیارنامەی پەسەندکراوی کۆنگرەی ٩ روون کردنەوەی مەسەلەیەک بەپێویست دەزانم وەک لە پێشتردا ئاماژەی پێ کرابوو، وەک سکرتێری گشتی حیزب لە ساڵی ٦٨ دا سەفەرێکی دەرەوەی کوردستانم کرد بەمەبەستی درێژەدانی کاری دیپلۆماسی، ناساندنی زیاتری حیزب و گەلی کورد، هەروەها پتەوکردنی پایەی رێکخراوی حیزب لە ئەورووپا و راکێشانی سەرنجی حیزب و کەسایەتییەکانی کورد لەدەرەوەی وڵات.

دیارە مەبەست لەم کارانە پتەوکردنی ریزی خەباتکاران بوو بەقازانجی بزوتنەوە و روون کردنەوەی زەینی ئەورووپاییەکان بوو بۆ گرینگی دان بەمەسەلەی کورد و باشتر ناسینی رێژیم بەتاییەت رەفسەنجانی کە ئەو کات تازە ببووە سەرۆک کۆمار و توانیبووی بەوەعدە و وەعید و قسەی خۆش تاڕادەیەکی زۆر لەنێو ئەندامانی حکومەتەکان و بەشێکی بەرچاو لەحیزبەکان جێگەی خۆی بکاتەوە و بەپێچەوانەی واقعیەت بەکابرایەکی ئەهلی کردەوە و لە زۆر شوێنیش بەلیبرالیان دەزانی.

لەم سەفەرەدا کە پێنج مانگ و نیوی خایاندبوو، ١٠ وڵات گەڕا بووم کە لەسەریەک پتر لە ١٢٠ چاوپێکەوتنی سیاسی و ٣٥ وتووێژی رادیۆیی و چاپەمەنیم کردبوو. ئەگەر پێویست بوو کورتەیەک لە راپۆرتەکە لە ئاخری دا دێنم.[٣]

لە سەرجەمی چاوپێکەوتنی دیپلۆمات و رۆژنامەوان و بەرپرسانی حیزب و هێز و

٣- وڵاتەکان بریتی بوون لە عێراق، فەرەنسا، ئەڵمان، چەکوسلوفاکی، سویسرا، ئوتریش، هولەندا، سوئید، دانیمارک و تونس. بەپێی پێویست بۆ هێندێک لەم وڵاتانە هەر لەو ماوەدا دوو سێ جار هاتووچۆم کردبوو. تەواوی خەرج و زەحمەتیان لەسەر هاوڕێیانی حیزبی و بنەماڵەکانیان بوو.

گرووپە سیاسییەکان بۆم دەرکەوت کە بەتێکڕا داخوازییەکی هاوبەشیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کوردەکان بیروباوەڕی خۆیان لێک نزیک کەنەوە و هەوڵبدەن لێژنەیەکی نوێنەرایەتی هاوبەشیان هەبێ کە بتوانێ دەگەڵ دنیای دەرەوە بدوێ و هەموو گیروگرفت و غەدرێک کە لەهەر بەشێک لەکوردستان لەلایەن دەسەڵاتدارانی داگیرکەر و زۆردار و دیکتاتۆرەوە دەکرێ لەقاوبدرێ و ئەم دەزگایە بگاتە جێگایەک کە وەک نوێنەری نەتەوەی کورد بەگشتی بتوانێ لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش دا دەنگ و ڕەنگی هەبێ.

ئەو راستییەم لە کۆنگرەدا جیا لە راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ بەشدارانی کۆنگرە باس کرد و پێشنیارم کرد کە ئەو شتە پێویستییەکی مێژووییە و دەبێ هەوڵی بۆ بدەین و تا زووتر پێک بێ دەرەنگە. بەخۆشییەوە پێشنیارەکەم پەسەند کرا و بوو بەیەکێک لەمادەکانی بڕیارنامەی کۆنگرەی ٩ کە بە لەبەر چاوگرتنی باسی دوور و درێژ لەسەر مەسەلە جۆراوجۆرەکان و هەل و مەرجی تایبەتی ئەو کات لە ٨ خاڵ دا بەتێکڕای دەنگ پەسەند کرا و لەژێرەوە دەقی هەشت خاڵەکە دەخرێتە بەرچاوتان.

## خاڵەکانی بڕیارنامەی پەسندکراوی کۆنگرەی نۆهەم بەم شێوەیە بوو:

١- بەشدارانی کۆنگرە بە تێکڕایی دەنگ و بە دەستنیشانکردنی چەند تێبینی راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەیان پەسند کرد.

٢- ڕێبەرایەتی داهاتوو پێویستە پێوەندی نێوخۆیی و دەرەوەی خۆی بە پێی ئەو ئەسلەی خوارەوە تەنزیم بکا. بزووتنەوەی میللی دیموکراتیکی کوردستان گوڕ و تینی خۆی لە دەریای بێ پایانی هێزی کۆمەڵانی خەڵک وەردەگرێ، هێزە شۆڕشگێڕەکان لە کوردستان هاوپەیمانانی سروشتی گەلی کوردن و گەلانی ژێردەستە و چەوساوەی ئێران و هەموو ڕێکخراوە پێشکەوتنخواز و شۆڕشگێڕەکان پالپشتی "بالقوە" و "بالفعل"ی ئەو بزووتنەوەن، وڵاتانی سوسیالیستی و ئەو وڵاتانەی باوەڕیان بە مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلانی ژێر دەستە هەیە، هەروەها بزوتنەوە رزگاریخوازەکانی نەتەوایەتی و جوولانەوە کرێکارییەکان و حیزب و ڕێکخراوە پێشکەوتنخواز و دیموکراتەکان و ئەو شەخسیەتانەی کە لایەنگری مافی مرۆڤن وەک دۆستان و یاریدەدەرانی بزوتنەوەی گەلی کورد دەژمێردرێن.

٣- ئەزموونی یازدە ساڵ تەمەنی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی نیشانی داوە کە ماهییەتی دژی گەلیی ئەو ڕێژیمە نەگۆڕدراوە و ناگۆڕێ. هەر بۆیە دروشمی رووخانی ئەو

ڕێژیه لەجێی خۆیەتی و ڕێبەری داهاتوو بە یەکیەتی بەکردەوە لەگەڵ هێزە خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕەکان پێویستە لەو بوارەدا هەنگاو هەڵبێنێتەوە.

٤- یەکیەتی بەکردەوەی هەموو ڕێکخراوە خەباتگێڕ و دێموکراتە ئێرانی و کوردستانییەکان بۆ ڕووخاندنی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی و وەدیهێنانی ئامانجەکانی گەلانی ئێران زەروورەتی مێژووییە. وێڕای تەئییدی تێکۆشانی تا ئێستای حیزب لەو ماوەیەدا، پێشنیار دەکرێ ڕێبەرایەتی داهاتوو لەمەو دواش بەوپەڕی تواناوە لەڕێگای یەکیەتی و لێک نزیک کردنەوەی ئەو هێزانە هەنگاوی جیددی هەڵبگرێ و بە کومیتەی ناوەندیی داهاتوو سەلاحییەت دەدرێ ئەگەر زەمینەی پێکهاتنی بەرە ڕەخسا، هەنگاوی پێویستی بۆ هەڵبێنێتەوە. لەو ڕابیتەیەش دا لەگەڵ ئەو ڕێکخراوانەدا کە پێوەندی نییە، بەو مەرجەی کە باوەڕیان بە دێموکراسی و مافی نەتەوایەتی گەلی کورد هەبێ، پێوەندییان لەگەڵ بگرێ.(٤)

٥- بە سەرنج دان بەو ئەسڵە کە پێویستە مەسەلەی کورد هەرچی زیاتر لە رادەی جیهانی دا بێتە گۆڕێ، پێویستە ڕێبەرایەتی داهاتووی حیزب لە پێوەندی لەگەڵ ئەو مەسەلە هەوڵی زیاتر بدات و بە پەرەپێدان و بەهێزکردنی تەشکیلات و تەبلیغاتی حیزب لە دەرەوەی وڵات و بە پێوەندی گرتن لەگەڵ ڕێکخراوە پێشکەوتنخوازەکان و کۆڕ و کۆمەڵە بەشەر دۆستەکان بزوتنەوەکەمان بە بیر و ڕای گشتی جیهانی زیاتر بناسێنێ.

٦- ئاڵ و گۆڕی بەرچاوی سیاسی لە جیهان دا بەتایبەتی چلۆنایەتی هەلومەرجی خەبات لە کوردستان دا و ئەزموونی خەباتی دوور و درێژی گەلەکەمان ئەو زەروورەتە نیشان دەدا کە پێویستە هێزە کوردستانییەکان تێکۆشانی خۆیان بۆ ناساندنی مەسەلەی کورد بە بیر و ڕای گشتی جیهان پەرە پێ بدەن، ڕێبەرایەتی داهاتووی حیزب دەبێ لەم بارەوە هەوڵی پێویست بۆ نزیکایەتی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوانە بدا و بۆ پێکهێنانی ئۆرگانیزمێکی کوردی لە دەرەوەی وڵات هەنگاو هەڵبگرێ.

٧- سیاسەتی تا ئێستای ڕێبەرایەتی لەبەرامبەر جەماعەتی شەڕەفکەندی تەئیید دەکرێ و پێویستە ڕێبەرایەتی داهاتوو بۆ کۆتایی پێ هێنانی شەڕی خۆماڵی لەسەر ئەو سیاسەتە بڕوا و هەوڵی زیاتر بدا و هەروەها لەو بوارەشدا هەوڵ بدرێ پشتیوانیی ڕێکخراوەکان بۆ هەڵوێستی حیزب جەلب بکرێ.

---

(٤) بەڵگەکانی کۆنگرەی نۆهەمی ح.د.ک.ئێران / ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ ، لاپەڕەکانی ١٠٥ تا ١٠٧.

٨- ڕێبەرایەتی داهاتووی حیزب بە لەبەر چاوگرتنی هەلومەرجی ئێستای وڵات دەبێ لە هەموو شێوەکانی خەبات وەک خەباتی چەکداری و سیاسی و دیپلۆماسی و جەماوەری کەڵک وەرگرێ.

## ئەندامان و جێگرەکانی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی نۆهەم بریتین لە :

ئەندامانی کومیتەی ناوەندی :

١- جەلیل گادانی.
٢- هاشم کەریمی.
٣- فەیسەڵ ایراندوست.
٤- حەسەن رستگار.
٥- شاپور فیروزی.
٦- کەمال کەریمی.
٧- نەبی قادری.
٨- سەرهەنگ قادری.
٩- نەبوبەکر راد.
١٠- فەتاح کاویان.
١١- عوسمان رەحیمی.
١٢- حوسێن مەدەنی.
١٣- خالد حەسەن پور.
١٤- مزەفەر میتران.
١٥- سەعید بیگزادە.

## ئەندامانی جێگری کومیتەی ناوەندی:

١- مەلا خدر عومەرزادە.
٢- محەمەد مروتی.
٣- فەتاح ریحانی.
٤- هاشم رۆستەمی.

ژمارەیەکی بەرچاو لە حیزب و ڕێکخراو و شەخسیەتە سیاسییەکان پەیامیان بۆ کۆنگرەی نۆهەمی حیزبەکەمان ناردبوو کە ئەو پەیامانەی تا دوایی هاتنی کاری کۆنگرە گەیشتن لە دەرفەتی لەبار لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەدا خوێندرانەوە و کەڵکیان لێ وەرگیرا. پەیامەکان هی ئەو ڕێکخراو و کەسایەتییانەی ژێرەوە بوون:

- هەیئەتی ئیجرائی سازمانی موجاهیدینی خەڵکی ئێران، دەفتەری سیاسی ڕێکخراوی کرێکارە شۆڕشگێڕەکانی ئێران(راه کارگر)، کومیتەی ناوەندی ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران، هەیئەتی ئیجرائی سازمانی فیدائی، دەفتەری سیاسی حیزبی رەنجبەرانی کوردستان، ڕێکخراوی خەباتی نەتەوایەتی و ئیسلامی کوردستانی ئێران، پارتیا هیزا وڵات پارێزا کوردستان، بزوتنەوەی ئازادی بەخشی ئیشتمانی فەلەستین،

کۆمەڵەی خوێندکارانی کۆمونیستی نوتریش، مەلا شێخ عزالدین حسینی، کاک موکری کەسایەتی ناودار و زانای کورد، دوکتور هانس فیشر ڕەنیسی فراکسیۆنی پارلەمانی سوسیالیستەکان و کاک عەلی کاشف پور (ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزب کە بۆ کاری حیزبی لە تورکیا بوو و بەداخەوە لە ڕێکەوتی ٢٤/٥/٦٩ هەر لەوێ شەهید کرا).

دیارە کۆنگرەش ناردنەوەی وەڵامی ئەو پەیامانە و سوپاسنامەی پێویستی خستە سەر شانی ڕێبەری تازە و هەروەها بە ناوی کۆنگرەش پەیامی بۆ گەلانی ئێران، بۆ خەڵکی کوردستان، بۆ ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئێرانی و کوردستانی، بۆ بنەماڵە و کەسوکاری شەهیدانی کوردستانی ئێران، بۆ کادر و پێشمەرگە و ئەندامانی حیزب و، بۆ بەندییە سیاسییەکان نارد.

بەداخەوە هێشتا کۆنگرە تەواو نەبیوو و هەڵبژاردن نەکرابوو، کە هەواڵی شەهید بوونی کاک عەلی کاشفپور بەدەستی تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی بە دەستمان گەیشت.

یەکەمین پلینۆمی کومیتەی ناوەندی دوای کۆنگرەی نۆهەم لە ڕۆژی ٣ی خەرمانانی ساڵی ١٣٦٩ دا پێک هات. لەو پلینۆمەدا کاک جلیل گادانی وەک سکرتێری حیزب و کاک حەسەن ڕەستگار بە جێگری سکرتێر و کاک هاشم کەریمی، کاک فەتاح کاویان و کاک نەبی قادری بە ئەندامەتی دەفتەری سیاسی هەڵبژێردران.

هەروەها چوار کەس وەک موشاویری کومیتەی ناوەندی لەم پلینۆمەدا هەڵبژێردران کە بریتی بوون لە:

١- کاک ئەمیر قادری. ٢- حاجی گولاوی.
٣- کاک سیروان حەفیدی. ٤- مراد ئەحمەدی

هەروەها لە پلێنۆمی دواتردا کاک سەید برایم کەریمیش کە لە سەفەری دەرەوە گەرابۆوە بە ئەندامی مشاویری کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا.

هەر لەم پلینۆمەدا گەلێک باس کران و زۆر مەسەلە هاتنە گۆڕێ، کە دوایە بە کردەوە ڕاستی مەسەلەکان دەرکەوت و زۆربەی پێشبینییەکان وەدی هاتن.

هەر لەو پلینۆمەدا سازماندەهی پێشوومان گۆڕی و کوردستان بە سێ ناوەند بەش کرا کە تەرکیبەکەیان بە شێوەی خوارەوەیە:

ناوەندی ١ی کوردستان کاک سەدیق بابایی، کاک فەتاح ڕیحانی بەرپرسی نیزامی، حاجی گولاوی، مام یوسف، محەمەد ئەمین کرێت.

ناوەندی ٢ی کوردستان کاک ئەبوبەکری راد، کاک سەید برایم کەریمی ئەندامی ناوەند، کاک شاپوری فیروزی بەرپرسی نیزامی.
ناوەندی ٣ی کوردستان کاک عوسمان رەحیمی، کاک سدیق شۆیی جێگری هێز، ئەحمەد محمد نژاد، محەمەد شکوهی.
دواتریش ئاڵوگۆڕی زۆر لە نێو بەرپرسان و ئۆرگانەکان دا پێک هات، لەبەر ئەوەی بەشێک لە بەڵگەکانی پەیوەندی دار بە سازماندەهی ئەوکات لەبەر دەست دا نەماوەن وێڕای داوای لێبووردن لەو کەسانەی ناو و بەرپرسایەتییەکەیان نەهاتووە سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەین کە لەوبڕگە لە خەبات و تێکۆشان دا کۆڵنەدەرانە بەرپرسایەتییان هەبووە و ئەرکی خۆیان بەسەر راستی بەڕێوە بردووە.
ساڵی ١٣٦٩ ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست شاهیدی رووداوێکی گرینگ بوو. شەوی یازدەی گەلاوێژ هێزەکانی عێراق چوونە نێو خاکی کویت و پێتەختی ئەو ئەمیرنشینەیان بەبێ ئەوەی بەربەرەکانیی جیددییان لە بەرامبەردا بکرێ، گرت و ئەمیری کویت و بنەماڵەکەی رایانکرد بۆ عەرەبستانی سعوودی. ئەم رووداوە بووە هۆی پێکهاتنی قەیرانێکی قووڵی سیاسی لە ناوچەکەدا و حکوومەتی ئەمریکا بۆ حوزوور لە ناوچەی کەنداوی فارس و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لەم بەشە لە جیهان دا لە دەرفەتێکی ئەوتۆ دەگەڕا.
دوای تێپەڕبوونی چەند مانگ بەسەر ئەم قەیرانەدا و دابەزینی هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە وڵاتی سعوودی و جێگیربوونی هێزەکانی هەوایی و دەریایی ئەو دەوڵەتانە لە ناوچەکەداو دوای ئەوەی گشت هەوڵ و تێکۆشانی کۆمەڵە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتانی بێ لایەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، واتە چۆڵکردنی کویت لەلایەن عێراقەوە، بێ ئاکام مایەوە، سەرەنجام لەرۆژی ٢٧ی بەفرانباری ١٣٦٩ بەرامبەر بە ١٧ی ژانویەی ١٩٩١ دا، هێزەکانی هاوبەشی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی هێرشێکی بەربڵاویان بۆ سەر شوێنە نیزامییەکان و بنکە و بنیاتە ئابووری و سنعەتییەکانی عێراق و هێزە نیزامییەکانی ئەم دەوڵەتە لە کویت دەست پێکرد.
لەم شەڕەدا کە لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی هەتا ئێستا وێنەی نەدیتراوە و بگرە لەباری گەلە کۆمەکی، تکنۆلۆژیی سەیر و سەمەرەی هاوپەیمانەکان، رادەی عەمەلیاتی فڕۆکەکان و چۆنیەتی بۆمب و مووشەکەکان و رادەی وێرانکارییان، گەلێک گرینگتر لەشەڕی دووهەمی جیهانیشە، کوژران و برینداربوونی هەزاران پیاو و ژن و منداڵ،

ویرانی هەزاران ساختومان و بنکە و دامەزراوی سنعەتی، زیانێکی بێ سنووری لە وڵاتانی ناوچەی شەر بە تایبەتی لە عێراق دا.
رۆژی دواتر واتە ٢٨ی بەفرانبار دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆرشگێڕ بەم بۆنەوە راگەیەندراوێکی بڵاوکردەوەکە تێدا سەرەڕای ئیشارە بە هۆیەکانی هەڵگیرسانی ئەم شەڕە سامناکە و بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی، زیانەکانی ئەم شەڕە ماڵوێرانکەرەی دەست نیشان کردووە و وێڕای مەحکووم کردنی شەڕ لە هەموو کوڕ و کۆمەڵە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتانی جیهان داوا دەکا بۆ کۆتایی پێ هێنان بەم شەڕە و پێک هێنانی کۆنفرانسێکی بەرین بۆ چارەسەری هێمنانە و عادلانەی هەموو گیر و گرفتەکانی ناوچەی رۆژهەلاتی نێوەڕاست تێبکۆشن.
ئەمەش دەقی راگەیەندراوەکەیە:

## راگەیەندراوی دەفتەری سیاسی بە بۆنەی دەست پێکردنی شەر لە ناوچە:

**هاونیشتمانە بەرێزەکان!**
**خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!**
**ئەندامان، کادر و پێشمەرگە دلێرەکانی حیزب!**

هەروەک بێگومان ئاگادارن دوای تێپەڕبوونی چەند مانگ لە قەیرانی کەنداوی فارس و دابمەزینی هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە وڵاتی سعوودی و جێگیر بوونی هێزەکانی دەریایی و هەوایی ئەو دەوڵەتانە لە ناوچەی خەلیج دا و، دوای ئەوە کە گشت هەوڵ و تێکۆشانی کوڕ و کۆمەڵە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتانی بێ لایەن بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە بێ ئاکام مایەوە، سەرەنجام لە بەرەبەیانی رۆژی پێنج شەممە رێکەوتی ٢٧ی بەفرانباردا، هێزەکانی هاوبەشی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی هێرشی بەربڵاوی خۆیان بۆ سەر دامەزراوە نیزامی و بنکە و بنیاتە ئابووری و سنعەتییەکانی عێراق و هێزە نیزامییەکانی لە کویت دەست پێکرد و، بەم جۆرە ئاگری شەڕێکی توند و تیژ و سامناک هەڵایسا. شەڕێک کە لەودا بێجگە لە وێرانی و لە نێو چوونی سەرچاوە ئابووری و سنعەتییەکان و کوژرانی دەیان و بگرە سەدان هەزار ئینسان، زۆر وێ دەچێ ناوچەی رۆژهەلاتی نێوەڕاست و تەنانەت وڵاتانی دوورتریش بگرێتەوە.
بێگومان ئەم رووداوە سامناکە هەروا کتوپڕ و لە خۆڕا نەهاتۆتە پێش، بەڵکو ریشەی

نەسلّی و هۆکارە سەرەکییەکانی لەلایەک دەگەڕێتەوە بۆ سەر سیاسەتی " ئیستیعماری نوێ"ی ولاتانی ئیمپریالیستی کە لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی لە پێکهاتن و دروست بوونی وەزعی جوغرافیایی سیاسی ئەم ناوچەیە ئەخشی سەرەکیی بووە و دووهەم لە دروست بوونی دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر خاکی فەلەستین و دەرکران و ئاوارەبوونی زیاتر لە دوو میلیۆن خەڵکی فەلەستین لە ئیشتمانی داگیرکراویان، بێجگە لەوانەش مەسەلەیەکی دی کە لە هەڵایساندنی ئاگری ئەم شەڕەدا ئەخشێکی بێ ئەملاوئەولای بووە، قازانج و بەرژەوەندیی ولاتانی سەرمایەداری و لە سەرووی هەموویانەوە ئیمپریالیزمی ئەمریکا لە ناوچەی خەلیجی فارسە. قازانجێک کە ولاتانی ئیمپریالیستی بەهەر نرخێک پارێزگاری لێ دەکەن. بەلاّم ئەگەر بیانووی دەوڵەتی ئەمریکا بۆ هێرش کردنە سەر عێراق ئەوە بووە کە ئەم دەوڵەتە بڕیارەکانی شوورای ئەمنییەتی بە هێند ئەگرتووە، خۆ ئیسرائیل هەتا ئێستا تەنانەت تاقە بڕیارێکی لە بڕیارەکانی ئەو شوورایەی سەبارەت بە گەلی فەلستین و مافی ئینسانی ئەو گەلە جێ بەجێ ئەکردووە، هیچ دەوڵەتێکیش ئەبووە کە بۆ دیفاع لە مافی پێشێل کراوی فەلەستینییەکان هەنگاوێک هەڵێنێتەوە.

به بڕوای ئێمە ئەم شەڕەکە دوو ڕۆژە دەستی پێکردووە و هەروا درێژەی هەیە بە قازانجی هەر لایەک و بە زیانی هەر کام تەواو بێ، ناتوانێ لەم ڕاستییەدا هیچ ئاڵوگۆڕێک پێک بێنێ کە:

یەکەم پەنابردن بۆ شەڕ و خوێنڕشتن ناتوانێ گیر و گرفتی ئەم ناوچەیە چارسەر بکا و لە باشترین حاڵەت دا ڕەنگە بتوانێ تەنیا بۆ ماوەیەک سەرپۆش لەسەر ئەم گیر و گرفتانە دانێ. بۆیە بێگومان دوای ماوەیەک ناکۆکییەکان سەرهەڵدەدەنەوە، ئاوری دژایەتییەکان سەر لە نوێ دەگەشێتەوە و شەڕ و خوێنڕشتن سەر لە نوێ دەست پێ دەکاتەوە. دووهەم تا ئەو کاتەی مافی گەلانی ژێر دەست و زوڵم لێکراو لە سەرانسەری جیهان بەگشتی و لە ناوچەی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست بەتایبەتی دابین نەکرێ، مەترسیی شەڕ لەسەر ئەم ناوچەیە و گشت ناوچەکانی دیکەی جیهان وەلا ناچێ.

لە ڕووناکایی ئەم ڕاستییانەدایە کە حیزبی ئێمە وەک حیزبێکی بەرپرس و دیموکرات هەلاّیسان و درێژەی ئەم شەڕە مەحکووم دەکا و لە هەمان کات دا لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتانی جیهان داوا دەکا بۆ کۆتایی پێ هێنانی شەڕەکە و پێک هێنانی کۆنفرانسێکی بەرین بۆ چارەسەرکردنی هێمنانە و عادلانەی هەموو گیرو گرفتەکانی ناوچەی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست، یەک لەوان کێشەی فەلەستین تێبکۆشن.

بەو هیوایەی کە هەرچی زووتر ئاگری ئەم شەڕە خوێناوی و پڕ کارساتە دامرکێتەوە و ئاسایش و هێمنایەتی بگەڕێتەوە بۆ ناوچە.

**دەفتەری سیاسی**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**۲۸ی بەفرانباری ۱۳٦۹**

سەرەنجام لە دانیشتنێکی ناسایی ئەنجوومەنی ئاسایش دا کە چەندین سەعات درێژەی کێشا، بڕیارنامەی ۹۸٦ پەسندکرا. لەو بڕیارنامەیەدا ڕاگەیاندنی بەتاڵ بوونەوەی ئیدیعای ئەرزی بەسەر کوێت دا، قەرەبوو کردنەوەی زیانەکان، ئازادکردنی هەموو دیلەکانی هاوپەیمانەکان، ڕاگرتنی هێرشی مووشەکی بۆ سەر هاوپەیمانەکان، دانی نەخشە و زانیاری سەبارەت بە مەیدانەکانی مین و کارخانەکانی مەوادی شیمیایی، درێژەدانی گەمارۆی ئابووری دژی عێراق و گێڕانەوەی هەموو کوێتییە گیراوەکان کە بۆ عێراق ڕاگوێزراون و... داواکراوە. سەرەنجام بەو مەرجانە، دەوڵەتی عێراق ناچاربووهەموو بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش قەبووڵ بکا. لە ڕێکەوتی ۱۳٦۹/۱۲/۷ دا ئاگربەسی کاتی لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە پەسندکرا و ڕۆژی دوازدەهەم دوای ئەوەی وەزیری دەرەوەی عێراق، قەبووڵ کردنی تەواوی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش و مەرجەکانی هاوپەیمانەکانی لە نامەیەک دا بە "پریز دێکوئیار" ڕاگەیاند، ئاگربەسی کاتی قەبووڵ کرا.

پێکهاتنی ئەم وەزعیەتە و شەڕی کەنداو هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ ڕاپەڕینی خەڵکی کورد لە کوردستانی عێراق و شیعەکان لە باشووری ئەم وڵاتە دژی حکوومەتی ناوەندی. ڕۆژی ۱۹۹۱/۳/۵ ڕاپەڕینی خەڵک لە کوردستانی عێراق دەستی پێکرد و لەماوەی چەند ڕۆژدا زۆربەی شار و شارۆچکەکان و بەشێکی زۆر لە خاکی کوردستانی عێراق تەنانەت شاری کەرکووکیش کەوتنە بەر دەستی خەڵک. بەڵام دوای ئاگربەس ئەمریکا کە پێی وابوو بەرژەوەندییەکانی ئەو دابین بوون، مەسەلەی کوردستانی وەک ڕووداوێکی ناوخۆیی قەبڵاند و ئیزنی فڕینی هێلیکۆپتەر و هێرشی بۆ سەر کوردستان دا. بۆیە چەند حەوتوویەک دوای ئەم ڕاپەڕینەی گەلی کورد، حکوومەتی ناوەندی هێرشی خۆی بۆگرتنەوەی ئەم شوێنانە دەست پێکرد کە لە سەرەتاکانی ساڵی ۱۳۷۰ دا بووە هۆی

گەورەترین کۆچی بە کۆمەڵی خەڵک لە جیهاندا و نێزیک بە دوو میلیۆن کەس لە خەڵکی کوردستانی عێراق بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا وەڕێ کەوتن. ئەم کارساتە تاڵ و دڵتەزێنە لەو وەرزە سارددە دا و بەهۆی سەرما و برسییەتی و ماندوویەتی، لە مێژووی ئەم سەردەمەدا کەم وێنە بوو. ئەم مەسەلەیە لە جیهاندا وەک ترلژیدییەک دەنگی دایەوە. بەشێکی بەرچاو لەوانە چوونە کوردستانی ئێران و لەوێ لەلایەن خوشک و برا کوردەکانیانەوە بەگەرمی پێشوازییان لێ کرا و بە هانایانەوە چوون. حیزبی ئێمە لەو سەردەمەدا بە بڵاوکردنەوەی وتار و کاری تەبلیغی لە نێو خەڵکی کوردستانی ئێران دا هەروەها بە هۆی پەیامێکی تایبەتی سکرتێری حیزب لە ڕێگەی رادیۆ دەنگی کوردستانی ئێرانەوە، داوای یارمەتیدان و بەهاناوە چوونی ئەم پەنابەرانەی کرد. لە بەشێک لەم وتارەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ دا کە بەم بۆنەیەوە نووسراوە هاتووە :

«داواشمان لە هەموو ڕێکخراوەکانی کوردستانی بەتایبەتی ئۆپۆزیسیۆنی خەباتگێڕی ئێرانی بە گشتی ئەوەیە کە لەگەڵ خۆیاراستن لە هەر چەشنە دەست تێوەردانێک لە کار و باری عێراق دا ئەوەندەی دەتوانن لەڕێی تەشکیلاتەکانی خۆیانەوە داوا لە خەڵکی ئێران بە گشتی و خەڵکی کوردستان بەتایبەتی بکەن، کە وەکو تا ئێستا پیشانیان داوە، لەمەش بە دواوە تا ئەو کاتەی ڕێگە چارەیەکی ئوسوولی بۆ وەزعی پەنابەرە کوردەکان دەدۆزرێتەوە لە هیچ کۆمەک و یارمەتییەکی ماددی و مەعنەوی بەوان دریخی نەکەن، بۆ ئەوەی هەم پڕوپاگەندەی بەدرۆی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی پووچەڵ بکرێتەوە و هەم پەنابەرەکان لە چنگ برسییەتی و نەخۆشی رزگاریان ببێ و ئۆپۆزیسیۆنی خەباتگێڕی ئێرانیش لەو ڕێگەوە توانیبێتیان ئەرکی شۆڕشگێڕانە و ئینسانی خۆیان بەجێ گەیاندبێ».

خەڵکی کوردستان چ لە رۆژهەڵات و چ لە باکووری کوردستان ئەوپەڕی یارمەتییان گەیاندە خوشک و برا لێقەوماوەکانیان. ئەم هاوکاری و هاودەردییە بەڕادەیەک بوو کە خەڵکی ئاوارەی کوردستانی عێراق تاڕادەیەک خەمی دەربەدەری و لێقەومانیان لە بیر چووبۆوە. پاشان بە هۆی دەربڕینی رەخنە و ئیعتیرازی جیهانی بەشێکی بەرچاو لە ئاوارەکان بەرەبەرە دوای چەند مانگ گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان و دەستیان دایە ئاوەدانکردنەوەی گوند و مووچە و مەزرا و شوێنی ژیانیان. کاروباری ئەو بەشە لە کوردستانیش کە کەوتبووە بەر دەست خەڵکی کورد، لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە

بەرێوەدەچوو. ئەم بەرەیە پێش راپەڕین و لەساڵی ١٩٨٨ ی زایینی لەلایەن چەند هێزی سەرەکی کوردستانی عێراقەوە پێک هاتبوو کە بریتی بوون لە:

یەکیەتیی نیشتمانی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، حیزبی سوسیالیستی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق، لقی کوردستان.

بەدوای راپەڕینی گەلی کورد لە باشووری کوردستان و وەدەست هێنانی ئازادی لەو بەشەدا کە بێگومان لە ئاکامی یەک گرتنی هێزەکان لە یەک بەرەدا و هیوا بەخشین بە گەلی ستەم لێکراو و چەند جار ئەنفالکراو و بەزۆر کۆچدراو دا سەری هەڵدابوو، هەروەها بەدوای هەڵسەنگاندنی زیانێکی قەرەبوو نەکراوی کە لەشەڕی براکوژی و ناوخۆیی دا هاتبووە گۆڕێ، حیزبی ئێمە، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لە پلینۆمی خۆی دا بڕیاری دا کە بە مەبەستی پتەوکردنی دۆستایەتی لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی حازر لە کوردستانی عێراق هەوڵێکی زیاتر لە جاران بدا.

هەر لەم پلینۆمەدا بەو ئاکامە گەیشتین کە بەتایبەتی بۆ هەڵگرتنی ئاکۆکی و ئەمانی ئەو دووبەرەکایەتی و ئاتەباییە زیانبارەی کە لە نێو هێزەکانی کوردستانی ئێران دا هەیە هەوڵ بدرێ. لەم زەمینەیەدا بە وەرگرتنی ئەتیجەیەکی باش کە لەتەواوکردنی شەڕ لەگەڵ کۆمەڵە و راگەیاندنی ئاگربەسی یەک لایەنە و پێشوازی ئەوان لەم مەسەلە وەرمانگرتبوو پلینۆم هاتە سەر ئەو باوەڕە کە بە جیددی بۆ چارەسەری کێشەی ئێمە دەگەڵ بەشەکەی دیکەی حیزب گەلاڵەیەک دابڕێژێ و بەشێک لە تێکۆشانی خۆمانی بۆ تەرخان بکەین، بەڵکو هەوڵ بدەین دەگەڵ هەموو حیزب و رێکخراوە سیاسییەکان و کەسایەتییە خێرخواز و نیشتمانپەروەرەکان باسی لەسەر بکەین. بە کردنەوەی ئەم دەرگایە جارێکی دی هەموو دڵسۆزێکی کورد لە نییەتپاکی و بڕوای خۆمان بە ئوسووڵی دیموکراتیک ئاگادارکەینەوە و بەرەو ئاشتییەکی هەمە لایەنە بچین.

بەخۆشییەوە هەر لەم پلینۆمەدا هەینەتێک بۆ ئامادەکردنی گەلاڵەکە دیاریکرا کە بەزووترین کات ئەرکی خۆیان بەرێوەبرد. دوای پێداچوونەوە و گونجاندنی بۆچوونی پلینۆم، ئەو گەلاڵە پەسندکرا ئەمەش دەقەکەیەتی :

«ئێمە حازرین بەبەشداری و ئەزاردتی لایەنێکی دیکە بێ قەید و شەرت لەگەڵیان دانیشین».

**قۆناغی یەکەم، راگرتنی شەڕ:**

ئەلف: لە بەیاننامەیەکی هاوبەش، یا جیاوازدا هەردوولا تێکهەڵچوونی نیزامی رابردوو مەحکووم بکەین و بەوە ئیعتیراف بکەین کە شەڕی نێوخۆیی چەند ساڵەی رابردوو زیانێکی گەورەی بەبزووتنەوەی کوردستان گەیاندووە، بە وەبەرچاوگرتنی ئەم واقیعیەتە بەڵێن بدەین شەڕی نێوخۆیی دووپات نەکرێتەوە و لەمەودوا گیر و گرفتەکان لە رێگەی سیاسی و وتووێژەوە چارەسەربکەین.

ب: وەک دوو جەرەیانی سیاسی لەسەر بنەمای ئیحتیرامی متقابل پێوەندیان هەبێ.

**قۆناغی دووهەم، هاوکاری یەکرەوە لە ژێر سێبەری:**

ئەلف: «تطبیق"ی دێموکراسی واقیعی لەسەر بنەمای رێزگرتن لە بیر و رای کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان.

ب: ئازادی تێکۆشانی هەمە لایەنەی هێزە رەسمن و خەباتگێڕەکان لە کوردستان دا.

**قۆناغی سێهەم، یەک گرتن:**

ئەلف: بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە پێشێل کردنی پێڕەوی نێوخۆی حیزب لەلایەک و پێشێل کردنی دێموکراسیی دەرەوەی حیزبی لەلایەکی دیکەوە هۆی سەرەکی ناتەبایی و لێک جیابوونەوەی حیزب بوون، جێگرکردنی بەکردەوەی ئەم مەبەستە ئەساسییە و خاڵەکانی ژێرەوە دەتوانن زەمینە خۆشکەری یەکگرتنەوەمان بن.

ب: شەڕی نێوخۆیی لە بزووتنەوەدا بەگشتی مەحکووم بکرێ و دان بەوەدا بنرێ کە شەڕی نێوخۆیی چەندساڵەی رابردوو زیانێکی زۆر گەورەی بە بزووتنەوە و قازانجی بە دوژمنانی گەلەکەمان گەیاندووە. بە وەبەرچاوگرتنی ئەم راستییە بەڵێن بدرێ شەڕی نێوخۆیی دووپات نەکرێتەوە و گیروگرفتەکان لە رێگەی سیاسی و وتووێژەوە چارسەر بکەین.

ج. مەحکووم کردنی سیاسەتی دژی گەلیی کۆماری ئیسلامی ئێران و پێ داگرتن لەسەر دروشمی رووخانی رێژیم و تێکۆشان بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی دێوکراتیک.

د. وازهێنان لەهەر چەشنە بەرخوردی غەیرە ئوسووڵی و دوژمنانە لەگەڵ هێزە ئێرانی و کوردستانییەکان و هەوڵدان بۆ نێزیک بوونەوە بەمەبەستی پێک هێنانی بەرەی کوردستانی و ئێرانی.

هـ. پێوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ دەوڵەت و کۆڕ و کۆمەڵەکان لەسەر ئەم ئەساسە بێ کە

کێ بەکردەوە بۆ مافی گەلی کورد هەوڵ دەدا.

و. هەوڵ دانی بێ پاوانخوازی بۆ دامەزراندنی ئۆرگانیزمێکی گشتی کوردستانی.

ز. وێڕای درێژە دان بە کـار و تێکۆشـانی شـان بەشـانی ئۆرگـانەکـانی هەردوولا بۆ ئامادەکردنی زەمینەی گرتنی کۆنگرە هەولی جیددی بدرێ.

ح. پێک هێنانی کـۆنگرەی هاوبەش بۆ دیاریکردنی بەرنامـە و پێـڕەوی نێـوخـۆ و ئۆرگانیزمی حیزب.

ئەم گـەلاڵە لەماوەیەکی یەک دوو مـانگی دا لەگـەڵ زۆربەی هێـزەکـان هاتە گـۆڕ و هەموویان پێشـوازییەکی باشـیان لێکرد. لە راسـتی دا وەک بەلگەیەکی تازە بیووە باسی رۆژ و گـەلێکمـان سـوود لێ وەرگـرت. ئەگـەر پێش دانی ئەو گـەلاڵە هێندێک کـەس، یا هێندێک حـیـزب لە نیـیـەت پاکی ئێـمـە شـارەزا نەبوون، ئەو باسـە بوو بە هۆی روون بوونەوەیان و شوێنەواری بەرچاوی لەسەر خۆشەویستی حیزبەکەمان لە روانگەی خەلکەوە دانا. زۆر حـیـزب و کـەسـایەتیش بۆ جـێـبـەجێ بوون و بە نـاکـام گـەیشـتنی هەولی دڵسۆزانەیان دا و بۆ چارەسەری گیر و گرفتەکان خۆیان ماندوو کرد.

هەرچەند گەلێک جار وەلامی مەنفیـمـان لەلایەنی دیکە دەبیسـتـەوە، بەلام سەرەڕای ئەوەش خێرخوازان ئێمەیان بۆ سوور بوون لەسەر رێی ئاشتی و دێموکراسی هان دەدا.

لە پێـوەندی لەگـەڵ ئامـادەبوونی فـەزایەکی هێـمـن و ئارام لە کـوردسـتـان دا کـە پێویسـتییەکی بێ ئەملا و ئەولا بۆ درێژەدانی خەبات و کەلک وەرگرتن لەم دەرفەتە بوو کە پێک هاتبوو، حیزبی ئێمە چالاکانە هەولی دەدا. سەرەڕای تێکۆشانی هەمە لایەنەی کادر و پێشـمەرگەکان کە تاڕادەیەکی بەرچاو لەم پێناوەدا بوو، کۆمیـسـیۆنی تەبلیغات و چاپەمەنی حیزب دەورێکی بەرچاوی لەم بوارەدا هەبوو. ئەو وتار و بابەتانەی کە لە رادیۆ بلاوەدەکـرانەوە، یا لە رۆژنامـەی کـوردسـتـان و گـۆڤـاری ٢٦ ی سـەرمـاوەز و باقی راگـەیەندراوەکـان چاپ و بلاوەدەکـرانەوە، بە زۆری پێ لەسـەر ئەوە دادەگـیـرا کـەشـەڕی ناوخۆیی بە زیانی بزووتنەوەی گەلەکەمانە و تەنیا لە بەرژەوەندی دوژمنانی نەتەوەکەمان دایە.

هەر لە پێناو ئەم ئەرکە گرینگەش دابوو، کـاتێک لە ناکامی دەست تێوەردانی رێژیمی کـۆمـاری ئیسـلامی لە کـار و باری کـوردسـتـان، کۆمـاری ئیسـلامی هێـزێکی زۆری بە کەمەدستەی ئیزامی و ماشێن و قەفەس و..... هێنایە ناوچە سنوورییەکان و پەلاماری

برده سەر موجاهیدین و یەکێک لە ئامانجە چەپەڵەکانیشی سازکردنی شەڕ بوو لە نێوان کورد و موجاهیدین دا، بەداخەوە بە مەرامی خۆشی گەیشت و شەری لە بەینی ئەو دوانەدا سازکرد. سەرەڕای ئەوەی چەند حیزب و ڕێکخراو بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕەکە هەوڵیان دا بە نەتیجە نەگەیشتن، حیزبی ئێمە بەو ئەرکە هەستا و بە پێوەندی گرتن دەگەڵ یەکیەتی نیشتمانی و پارتی بەتایبەتی شەخسی کاک مەسعود بارزانی لە مەسیف و فەرەیدون عبدالقادر لە سلێمانی لەلایەک و دەگەڵ سازمانی موجاهیدین لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی عێراق لەلایەکی ترەوە، بە قەبووڵی سەفەری پڕ لە مەترسی چەند هاوڕێی ڕێبەری و هەوڵ و کۆششێکی چەند شەو و ڕۆژی و ئاڵوگۆڕی دەیان پەیام و نامە توانی بەو شەڕە داسەپاوە کە تەنیا ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی خوازیاری بوو کۆتایی بێنێ و ئەو بەلایە لەسەر دۆستانی خۆی و بەتایبەتی هاونیشتمانانی بەرێزی ناوچەکانی کفری و کەلار و خانەقین دوورکاتەوە. هەر بە مەبەستی پێکهێنانی تەفاهوم لە نێو هێزەکان دا بوو کە لە بەهاری ساڵی ١٣٧٠ دا نامیلکەیەک لە ژێر سەردێری "هاوکاری هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن پێویستییەکی مێژووییە" لەلایەن حیزبی ئێمەوە بڵاوکرایەوە کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

## هاوکاری هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن پێویستییەکی مێژوویی

لە هەل و مەرجی تایبەتی ژیانی هەر کەسێک، یا هەر نەتەوەیەکدا هێندێک ئەرکی گەورە دەکەوێتە سەر شانی ئەو کەسە، یا ئەو نەتەوەیە. ڕەنگە بەڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکانە لە کاتی دیاریکراودا زۆر ئاڵوگۆڕی گرینگ پێک بێن و شوێنی ڕاستەوخۆ لە سەر چوونە پێشی ژیان دابنێن.

بێگومان هەر هەڵوێست گرتنێکی بەجێ ئەگەر لە سەرەتاوە بەو چەشنەی کە پێویستە هەڵنەسەنگێندرێ و بەرژەوەندییەکانی بە ووردی نەیەتە بەر لێکۆڵینەوە و بە باشی لێی حاڵی نەبن، ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویستییە مێژوویییەکەی دێتە بەر باس و ئەو کاتە هەموو کەس تەنییدی دەکا.

یەکێک لە دەلیلە روونەکانی هەڵوێست گرتنی ئێمە لە ١ی خاکەلێوەی ١٣٦٧ دا نەبوونی دێموکراسی ناوخۆیی لە حیزب دا و لە ژێرپێنانی مافەکانی ئەندامانی حیزب و کادرەکان و نەبوونی فەزای دیوکراتیک بۆ تێکۆشانی هێزەکانی دیکەی کوردستان بوو،

نەتەنیا ئەو جەوە بە جارێک لە گۆڕێ نەمابوو، بەڵکو هێندێک کات دەبووە هۆی تێکهەڵچوونی چەکدارانە و بە داخەوە لەم پێناوەدا خوێنی سەدان رۆڵەی ئازای کورد بە دەستی هاوسەنگەرەکانیان رژا سەر خاکی کوردستان.

ئێمە هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەو باوەڕە بووین کە شەڕ و شەڕخوازی و کێشەی ناوخۆیی زیانێکی گەورەمان پێ دەگەیەنن و، ئێمە بەڕێگایەک دا دەبا کە دوای سەرکەوتن بەسەر دوژمنانیش دا نەتوانین رووی خۆشی و ئاسایش ببینین و هەروەک لوبنانییەکان نیشتمانی خۆمان دەکەینە دۆزەخ و یەکتر لەناو دەبەین.

لەتەواوی خەباتی چەند ساڵەی رابردوودا ئێمە بڕوای خۆمان لەسەر پێکهێنانی کەش و هەوایەکی دیموکراتیک و پێکهێنانی دۆستایەتی لە نێو هەموو هێزەکان دا بە شێوەی جۆراوجۆر دەربڕیوە. بەتایبەتی لە سێ چوار ساڵی رابردوودا دەیان جار لە هەر شوێنێک بووزی خواردبێ لەڕێگەی رادیۆ و وتوێژ دەگەڵ خەڵک و لەڕێگەی چاپەمەنییەکانی حیزبی ئەو بڕوایەی خۆمان بە ئاشکرا باس کردووە.

رەنگە هێندێک کەس وا بیرکەنەوە کە ئەو قسە و نووسینانە لەبەر کەم هێزی نیزامی، یا سیاسی ئێمە دێنە گۆڕێ. لە حاڵێکدا نەتەنیا لەبەر ئەوە نەبووە، بەڵکو لەسەر بنەمای فکری و پێویستییەکی مێژوویی بووە کە ئێمە خۆمان بڕوامان پێیەتی، لە کاتێک دا بۆ یەکجاریش بەرامبەر بە رێژیم و هێزەکانی شتێکی وا لەلای ئێمەوە باس نەکراوە و بە شێوەیەکی وا لێبڕاوانە جوولاینەوە کە قەتی لێ پەشیمان نین.

خەڵکی بەشەرەفی کوردستان و هەموو هێزە شۆڕشگێڕەکان لەم وەزعە ئاگادارن و ئەگەر کەسێک، یا هێزێک بە مەسڵەحەت نەزانێ کە ئەو راستییە بڵێ، جگە لە شاردنەوەی راستییەکان ناتوانێ نێوێکی دیکەی لێ بنێن.

ئێمە لە ماددە پێنجی هەڵوێستی "١"ی خاکەلێوەی ١٣٦٧ دا بە ئاشکرا ئامادەمان بەشەڕی ناوخۆیی کردووە و لەسەر پێکهێنانی کەش و هەوای هێمنانە لە نێوان هێزەکانی سیاسی دواوین. هەر بەو مەبەستە لەسەر بنەمای هەست بە بەرپرسایەتی کردن لەبەرامبەر گەل و نیشتمان دا لە سەرەتای بانەمەڕی ١٣٦٧ دا یەک لایەنە دەگەڵ کۆمەڵە ئاگربەسمان راگەیاند. لەو کاتەوە تا ئێستا بێ ئەوەی هیچ تێکهەڵچوونێکمان لە نێو دا بووبێ، سەرەڕای جیاوازی بیر و رای سیاسی لە زۆر بارەوە دۆستانە جولاینەوە،، وەزعێکی ئاوا و پێکەوە ژیانی بە تەفاهومەوە لە پێویستییە بۆ ئەملا و ئەولاکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسییە.

له بەڵگەنامەکانی کۆنفرانسی چوارەمی حیزب دا کە لە پووشپەڕی ساڵی ١٣٦٧ دا گیرا لە پاراگرافی " ٢ و ٣ " لەلاپەڕە "٩٠"ی مەتنی کوردی بە روونی لەم بابەتەوە بڕوای خۆمان دەربڕیوە و گوتوومانە کە پێکهێنانی رووحی برایەتی و لە ناو بردنی هەر چەشنە دوژمنایەتییەک دەبێتە رەمزی سەرکەوتن بەسەر زۆرداران و رێژیم دا.

لە رۆژنامەی ژمارە "١"ی کوردستان ئۆرگانی کومیتەی مەرکەزی لە مەقالەی هەڵوێستی رێکخراوە ئێرانی و کوردستانییەکان دا بە درێژی لەلاپەڕەکانی "١١ 12- ١٣- ١٤- ١٥ و ١٦ " دا باس لەسەر ئەم مەسەلە کراوە و لە بڕیارنامەی کۆنفرانسی چواریش دا لە بەندەکانی "٥ و ٨"دا لەم بارەوە دواوین.

لەچەند ساڵی رابردوودا کە رۆژنامەی کوردستان بەرێک و پێکی دەرچووە لە زۆربەی هەرە زۆری ژمارەکان دا لەم بارەوە نووسیومانە، ژمارەکانی"٢-٨- ١٠- ١١-١٣- ١٥- ٢٠- ٢٣- ٢٤- ٢٥- ٢٧ و ٣٠"شاهیدی روونی ئەو هەڵوێستە راست و دروستەی ئێمەن.

هەر وەک هاونیشتمانانی بەرێز ئاگادارن ئێمە لە گەلاوێژی ساڵی رابردوودا (١٣٦٩) کۆنگرەی ئۆهەممان گرت. یەکێک لە باسە گرینگەکانی کۆنگرە پێویستی کۆتایی هێنان بە دوژمنایەتی و شەڕی براکوژی بوو. دیارە ناکامی تاڵی شەڕی ناوخۆیی لە دەساڵی رابردوودا لەبەشی زۆری کوردستانەکان ئێمەی هێنابووە سەر ئەو باوەڕە. ئەو مەسەلە لە بەندەکانی "٤ و ٧"ی بڕیارنامەی کۆنگرەی ئۆش دا رەنگی داوەتەوە کە نیشانەی روونی ئیمانی ئێمە بەم بۆچوونەیە.

جگە لەنووسراوەی رۆژنامەکانی کوردستان و باسی ئەو مەسەلە لە کۆنفرانس و کۆنگرەدا لە رادیۆش لەرێگەی وتووێژ دەگەڵ بەرپرسان و کادر و پێشمەرگەکان هەر لە سکرتێری حیزبەوە تا پێشمەرگەی سادە زۆر جار ئەم باسە هاتۆتە گۆڕ و بە باوەڕەوە وەدوای کەوتووین، لە زۆربەی ئەوانەدا لەسەر یەکیەتی و یەکگرتوویی قسەکراوە و هەموو لایەکمان هەستی پاکی خۆمان نیشان داوە.

گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و بەشی هەرە زۆری رێکخراوە کوردستانی و ئێرانییەکان و بەشێکی زۆر لە خەڵکی نیشتمانپەروەر لەو ماوەدا رای خۆیان دەربڕیوە و هەستی پاکی خۆیان نیشان داوە و بۆچوون و رەوشتی ئێمە لەلایەن خەڵکەوە تەئییدکراوە و جێگەی تایبەتی لە دڵی خەڵک دا کردۆتەوە. ئێستا هیچ کەس نییە کە شەڕی خۆماڵی پێ زۆر خراپ نەبێ. بەڵام جێگەی داخە کە تا ئێرەش کەسانێک هەن کە خۆ لە

قەبوولکردنی ئەو واقیعیەتە دەبوێرن و بەدژی ڕەوتی مێژوو دەجولێنەوە.

ئێمە جگە لەوەی شێلگیرانە تر لە ڕابردوو بە ئیمان بە ڕەوابوونی بۆچوونەکانمان و کردەوەکانی تا ئێستامان، بەهەموو توانامانەوە هەوڵ دەدەین کە بۆ هەمیشە کۆتایی بەشەڕی براکوژی بێنین. هەر هەوڵێکی لەم بوارەدا لەلایەن خەڵکەوە بدرێ وەک کردەوەیەکی ئینسانی شۆڕشگێڕانە سەیری دەکەین. هەروەها لە هێزە سیاسییەکانی کوردستانی و ئێرانی داوادەکەین بۆ هەڵگرتنی ئاڵۆزییەکان هەنگاوی پێویست هەڵگرن و باقی کۆمەڵانی گەلی کوردیش دەبێ بە واقیعبینی و بە دوورلەهەر بەرچاوتەنگییەک لە هەڵوێستی ڕاست و دروست لایەنگری بکەن و لە ناکاری بێ هەڵوێست و بێ تەفاوەتی دەست بەردار بن. ئەوانیش دەبێ زەخت بخەنە سەر هەموو لایەک و بەتایبەتی لایەنەکانی کە قسە و کردەوەیان دژایەتی دەگەڵ یەکتر هەیە و لە هەڵوێستی دروست خۆ دەبوێرن ناچارکەن لەو هەموو تەجرەبە تاڵانەی ساڵەکانی پێشوو بیربکەنەوە، ئەگەر لە ڕابردوودا بە ئاشکرا شەڕیان سازکردووە و شەڕیان بە ئێمە فرۆشتووە و بێنە سەر ئەوقەناعەتە کە شەڕی خۆماڵی مەحکووم کەن و لەبەرامبەر گەلی فیداکاری کورددا بەڵێن بدەن کە هیچ کات ڕووداوە خوێناوییەکانی پێشوو دووپات نەکەنەوە.

وێدەچێ لەم بابەتەوە قەول و قەرارێک درابێ کە جێگەی خۆشحاڵییە. بەڵام ڕاگەیاندنی ئەو مەسەلە بە شێوەی ڕەسمی و نووسراوە هیوایەکی تازە دەخاتە دڵ و دەروونی خەڵکی کوردستانەوە. بەو هیوایەی کە وەعدەکان بەکردەوە بێنەجێ و، بە هیممەت و هوشیاری ئەتەوەی کوردبەتایبەتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و سووربوونی خەڵک لەسەر خۆپارێزی لەشەڕی براکوژی کە لە ڕۆژی یەکەمەوە بنەمای فکری و سیاسی ئێمە بووە، ڕووحی تەفاهوم و دۆستی جێگەی هەموو ناتەبایی و ئاڵۆزی و دوژمنایەتییەک بگرێتەوە.

دەبا هەموو کەس بزانێ کە ئەگەر بۆخۆشمان لەم بابەتەوە دڵسۆزی نیشان نەدەین و لەو ئەسڵە گرینگە کە پرەنسیپی دیموکراتییەتە و هۆیەکی بنەڕەتی ڕزگاری گەل و نیشتمانەکەمانە، سەرەنجام داخوازی خەڵک و شەقی زەمانە دەمان هێنێتە ئەو جێگایەی کە ڕاستییەکانی مێژوو بسەلمێنین. بەڵام هەر هێزێکی هەست بە بەرپرسایەتی بکا بێگومان وەدوای چارەی ئەو دەردە دەکەوێ بە تایبەتی ئەوانەی کە خۆیان بە پێشڕەوی خەڵک دەزانن دەبێ لەکاتی خۆیدا خەریکی بەرنامەڕێژی هاوبەش و هاوئاهەنگ کراوی بیر و ڕای مەنتیقی بن. بە قەزا و قەدەر ئەسپاردنی چارەنووسی خەڵک بە هیچ شێوەیەک

و لەهیچ هەل و مەرجێک دا ڕەوا نییە و خەڵک ناتوانن بۆ هەمیشە بێدەنگ بێننەوە.

بۆ هەموو هاونیشتمانانی بەڕێز ڕوونە کە لەو ڕۆژانەی دواییدا چەند کۆبوونەوەیەک لە نێوان هێزە سیاسییەکان دا کراوە لەوانە دانیشتنی چەند جارەی ئێمە و کۆمەڵەیە کەلەودا باس و خواسی زۆری سیاسی کراوە. جگە لە دانیشتنی ئێمە و کۆمەڵە دەگەڵ لایەنی دیکەش کۆبوونەوە کراوە، بەڵام تا ئەو جێگایەی ئێمە ئاگادارین لەو کۆبوونەوانەدا بڕیاری روون و دیار نەدراون کـــە چاوەڕوانی ئەوەی لێ بکرێ بەم زووانە بەیەک بگەین و یەکگرتنەوەی تەواو بێتەدی. بەڵام هەر ئەوەی کەش و هەوای ئەوساڵ هێمنانەتر لە ساڵی پێشوو بووە، خۆی جێگەی هیوایە. دیارە ئەوەندە بەهیچ شێوەیەک کافی نییە.

گەلی فیداکار و لەخۆ بردوومان لەلایەک و کادر و پێشمەرگە دڵسۆزەکان لەلایەکی تردوە دەبێ ئەو هەستە بەهێزتر کەن و ڕێبەرانی حیزبەکان رازی بکەن کە بەرەو تێک گەیشتن و پێک گەیشتن هەنگاو هەڵگرن تا پێشمەرگە دلێرەکانمان بتوانن بەدوور لەهەر دوژمنایەتی و تێکهەڵچوونێکی ناوخۆیی ئەرکی خۆیان لە نێو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە شار و دێ بەڕێوەبەرن و هێدی هێدی ڕێگای دۆستی هەمیشەیی خۆش کەن و ناتەبایییەکانی رابردوو لە بیر بەرنەوە و بە هاوکاری و پشتیوانی خەڵک و هاوکاری یەکتر خەباتی خۆیان دژی دوژمن درێژە بدەن. لە دنیای ئەمڕۆدا ملهوڕی و توند و تیژی لە ڕەواج کەوتووە و بێگومان سیاسەتی غەیرە ئوسووڵی و پڕ لە زیانی رابردوو ناتوانێ لایەنگری هەبێ.

ئێمە هەموو کات بۆ خۆ پاراستن لە شەڕ دەگەڵ بەشەکەی دیکەی حیزب هەوڵمان داوە و ئەو پەڕی نییەت پاکی و تەفاهومی خۆمان نواندووە، هەر وەک پێشتر باس کراوە بە بۆنەی شەهید بوونی دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوو و عەبدوڵڵا قادری بەرپرسی دەفتەری پاریس ئێمە ڕاگەیاندراومان بڵاوکردەوە و داخ و کەسەری خۆمان دەربڕی و ئەو جینایەتەمان مەحکوم کرد.[5] مامۆستا سیروان بەرپرسی پێوەندییەکانی حیزب لە سلێمانی و کاک مستەفا قازی وەک کادری ئەوکاتی حیزب لە پرسەی شەهید دوکتور دا

5- هەرچەند جاری سەفەری دەرەوە کردبی و چووبە ئوتریش دەگەڵ بەرپرسانی ئەو وڵاتە زۆر بە ئاشکرا باسی ئەو مەسەلەم کردووە و گلەیی و گازەندەی خۆمان لە بی مویالاتی بەو مەسەلە گرینگە و لێپرسینەوەی خوێنی ئەو شەهیدانە دەربڕیوە و داوای مەحکووم کردنی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی و موحاکمەی قاتیلەکان و ئەو کەسانەم کردەوە کە ڕێگەی هەڵاتنی قاتڵەکانیان بۆ تاران خۆش کرد و بە رەسمی بەڕێیان کردنەوە.

لەو شارە بەشدارییان کرد.

هەروەها پاش سێ ساڵ تێپەڕ بوون لەو کارەساتە زۆر بەداخەوە دوکتور سادقی شەرەفکەندیش سکرتێری بەشەکەی دیکەی حیزب لە خەرمانانی ١٣٧١ی هەتاوی دەگەڵ لێپرسراوانی حیزب لە دەرەوەی وڵات کاک فەتتاح عەبدولی و کاک هومایوون ئەردەلان و دۆستی حیزب حوسێن دەهکردی بە پیلانێک لە کافە رەستوورانی میکنووسی برلین شەهید کران.

بەو بۆنەشەوە راگەیەندراوێکی تایبەتیمان نووسی کە لەو دا وێڕای مەحکووم کردنی ئەو جینایەتە سامناکەی کە لەلایەن رێژیمی کۆماری ئیسلامییەوە بەڕێوە چووبوو کەسەری خۆمان دەربڕیبوو کە دەقی راگەیەندراوەکە لەگەڵ بەڵگەکان دەکەوێتە بەر دەستتان. جگە لەوش هەیئەتێکی پایەبەرزی رێبەرایەتی حیزبیشمان بە سەرۆکایەتی کاک حوسێن مەددەنی ئەندامی دەفتەری سیاسی بۆ بەشداری لە پرسەی ئەو شەهیدانە دا ناردە شاری رانییە.

زۆر بە داخەوە ئەو هەموو نییەت پاکی و تەفاهوم نیشاندانەی ئێمە تا چەند ساڵ دواتریش شوێنی لەسەر ئەو برادەرانە دانەنا و دەستی دۆستایەتییان بۆ درێژ نەکردین و لەسەر هەڕەشە و گوڕەشە و هێرش کردنە سەرمان هەر بەردەوام بوون و ئەو بۆچوونە تا کۆنگرەی دەهەمیان درێژەی هەبوو.

هەل و مەرجێکی باشتر خولقا بوو، جێگەی خۆی بوو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێر زیاتر لەجاران هەوڵ بدا. دەتوانین بڵێین لەبەینی کۆنگرەی نۆ و دە دا رادەی تێکۆشانی هاوڕێیان لە هەموو ئۆرگانەکان دا بەتایبەتی لە بواری تەبلیغاتی و دیپلۆماسییەوە زیاتر و سوود بەخش تر بوو.

درێژەدانی چاپی رۆژنامەی کوردستان، چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤاری ئەدەبی ـ سیاسی ٢٦ی سەرماوەز، چاپ و بڵاوکردنەوەی روانگەی لاوان ئۆرگانی یەکیەتی لاوان و زۆر نامیلکەی دیکە بەشێک لە ئەرکەکانیان بوو. بەشێکی بەرچاو لە کادرەکانی نووسەر و وەرگێڕ لەم بوارەدا شەو و رۆژ زەحمەتیان دەکێشا، بەتایبەتی هەوڵەکانی چەند کادری فەننی وەک عەلی سووسەنی، قاسم سوڵتانی کەماڵ رستگار و... جێگای سوپاسە. چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی شەهیدانی حیزب و گەل کە بەهەوڵی سکرتێری گشتی و زەحمەتی زۆری هاوڕێیانی حیزبی لە پاریس و بەتایبەتی کاک رەحمانی کریم زادە، کاک سمایلی ماملی و خزمەکانی چاپ کرا کە بەشێکی بەرچاو لە وێنە و کورتەی ژیاننامەی چەند هەزار شەهیدی حیزبی دێموکراتی کوردستانە لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا کاتی

دەرچوونی کتێبی ناوبراو.

چاپی ئەو کـتێبـە جگە لەوەی بوو بە هۆی دڵخۆشی بنەماڵەی شەهیـدان و دڵگەرمی کادر و پێشـمەرگـەکانی حیـزب، دوای ئەوەی گەیشـتەوە کـوردسـتـان و وەک دیارییـەکی نایاب بۆ کـتێبخانە گشـتییـەکان بۆ حیزبەکان و کەسایەتییـەکان نێردراوە کە لە وڵام دا دەیان نامەی سوپاس بۆ حیزب نووسراوە کە یەکەم حیزبی کوردستانی بووە کارێکی ئاوای بۆ شەهیدان کردووە.

وەک پێشـتـر ئاماژەی بۆ کرا رادیۆی حیـزبمان هەر بە نێـوی دەنگی کـوردسـتـانی ئێـران (چل رۆژ دوای هەڵوێست گرتن سەرەتا بە ئیمکاناتێکی زۆر کەمەوە لە رێکەوتی پانزدەی بانەمـەڕی ١٣٦٧ بەرانبـەر بە یەکی ئەیار رۆژی جیـهـانی کرێکار بە هیـمـەتی دۆسـتـانی حیـزب و کۆششی فەننی برا و هاورێی فیداکاری خوالێخۆشبوومان کاک خەلیل گادانی و گەلێک کەسی وەک مامۆستا بێ بەش، تاهیـرە سوور، مامۆسـتا عاشق، جەمال کەریمی، خەجـیج سوارە، عـەولاحیـجاب و عەزیـز رەمەزانی، دەسـتی بە کار کـردووە و بە هەوڵ و تێکۆشانی باقی هاوکاران کە بەڕاستی هەر کەس لەم بابەتە چی لە دەست هاتبایە دریغی نەدەکـرد، هەمـوو رۆژێ بەرنامـە جۆراوجـۆرەکـانی خـۆی بۆ مـاوەی یەک سـەعـات و نیـو، سەعاتێک بە کوردی و نیو سەعات بە فارسی بڵاو دەکردەوە).

بەرنامەکانی بریتی بوون لە:

١- هەواڵ و رووداوەکان کە هەواڵەکانی جیهان و ئێران بەتایبەتی کوردستانی دەگرتەوە.

٢- تەفسیری سیاسی رۆژ لەسەر گرینگترین مەسەلەکانی رۆژ

٣- راگەیەنە گشتییەکان کە باسی نووسراوەی چاپەمەنییەکانی دەکرد.

٤- رێبازی خەبات لەسەر چلۆنایەتی خەباتکردن لەو هەل و مەرجە دەدوا.

٥- ناوێنەی راسـتـییـەکان، بیرەوەرییـەکانی ئێـو ژیان و خەباتی تێکۆشەرانی دێموکرات و خەڵکی خەباتگێڕی کوردستانی بڵاو دەکردەوە.

٦- ئەدەب و هونەر، باسی شـاعیـر و نووسەرانی دەکرد و لە راسـتی دا مێژووی ئەدەبیـاتی کورد بوو کە لەلایەن مامۆستا عـاشق و خوشکە خەجیج سوارە، مامۆسـتا بێ بەش و مەنسوور حەدادەوە بەڕێوە دەچوو.

٧- ئێمە و گوێگرەکان لە پێوەندی دەگەڵ نامەی کەسانێک بوو کە پرسیاریان دەکرد.

٨- جگە لەوانە بەرنامـەی تایبـەتیش جار جـار بۆگوێگرەکـان لە زەمینەی جۆراوجۆردا بڵاو دەکرایەوە. رێ و رەسـمـەکـانی حیزبیش بەشێک لەو بەرنامـانەبوون کەبێ دواکەوتن بە

گوێی بیسەران دەگەیشت. جێگەی خۆیەتی لە پیوەندی دەگەڵ رادیۆدا یاد لە کاک فەتاح کاویان، کاک هاشم کەریمی و کاک عوسمان رەحیمی و کاک سەعید بەگزادە و کاک فەیسەڵ ئیراندوستیش بکەم کە بۆ ئامادەکردنی وتاری سیاسی، زەحمەتی زۆریان کێشا.

لە مەودای نێوان دوو کۆنگرەی نۆهەم و دەهەمی حیزبەکەمان، کادر و پێشمەرگە فیداکارەکانی ناوەند و کومیتە شارستانەکان، چالاکی بەرچاویان لەناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان نواند، لەم ماوەیەدا سەرەڕای میلیتاریزە بوونی تەواو عەیاری کوردستان و تەنینی سنوورەکان بە هێزی بەکرێگیراوی ئیزامی و مین رێژکردنی رێگەکانی هاتوچۆ و زۆر کەند و کۆسپی دیکە، تیمە ئیزامی و تەشکیلاتییەکانی حیزبی خۆیان گەیاندەوە قوولای خاکی کوردستان و ئەرکی شۆڕشگێڕانەی خۆیان بەرێوەبردووە. لەم ماوەیەدا ژمارەیەک چالاکی بەرچاو کراوە، دەگەڵ وەشاندنی زەبری کاری لە هێزەکانی رێژیم چەندین کادر و پێشمەرگەی قارەمانی حیزب هەر لەو ماوەدا گیانی خۆیان فیدای ئامانجی گەل کرد کە بریتین لە شەهیدان:

محەمەد رەحمانی - مەجید کەریمی - دیار جەناح - لقمان سدر - سیاوەشی بابا میری - سەعید غولامی - سابیر ئیبراهیم نژاد-عومەر بژی - کەریم بەیرەمی- جەمال شەریفی - سەمەد چیر- عەلی خاریجی- عەلی سهرابی- خالید بیابانی - قادر عەبدوڵلا پور- سلێمان حەسەن پور- رەسول ئەندام- عومەر عەباسی - مەلا خدر عەسکەردوست- حەسەن خالد اقدم-بایز مەلانیا- نجم الدین مرادی- کامران شیخ الاسلامی- پەروین رووحی- عەباس چریک - سلیمان سلیمانپور- خالد سنجاخی- حەسەن خضری- سەید ناصر حوسێنی- خالد جۆخۆر- حسن رشادتی- حوسێن رەحمانی (ئاسۆ)- یوسف سولتانی- جلال دریازی-رەحیم کۆلەسەیی، محەمەد هەرکی- محەمەد ئەمین بایزیدی- ئەبوبەکر گومانی - محەمەد علوی (رێبوار)، حەسەن رەحیم پور (گلۆلانی)، عەلی بێستوونی کە بە ئەخۆشی لە تورکیا فەوتی کرد و چەند کەسی دیکە کە بەداخەوە ناوەکانیانمان لەبەر دەست دا نییە.

هەروەها لە مانگی پوشپەری ۱۳۷۱ لە ناوەندی یەک لە بنکەی هەڵەبجە بەشێک لە پێشمەرگەکانمان دەرمان داوکران کە چوار کەس لەوان بەم ئاوانەی ژێرەوە عیلاجیان نەهات و شەهید بوون عەلی تاتورە- هادی مەحمودی- بەختیار مرادی - سالار ساعدنیا.

لە نێوان کۆنگرەی ۹و۱۰دا ئەو کەسانەش کە لە خشتەی دواتر دا ناویان هاتووە لەلایەن تیرۆریستانی کۆماری ئیسلامییەوە شەهید کراون:

ڕێژێکی دژی گەلی سەرەڕای ئەو جینایەتانەش بۆ زەبروەشاندن لە بزوتنەوەی گەلەکەمان و لە چوارچێوەی سیاسەتی تیرۆریستی خۆیان دا بە هەموو شێوەیەک خەریکی پیلانگێڕان بوون و لە ڕێگەی بەکرێگیراوانی خۆیانەوە بەرنامەی تیرۆریان بەڕێوە دەبرد.

لە شەوی ٢٤ی گەلاوێژی ١٩٩٠ هاوڕێ کاک عەلی کاشف پور ئەندامی کومیتەی ناوەندی کە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکی حیزبی چووبوو بۆ تورکیا لە شاری قونیە لە ماڵی خۆی لەلایەن تیرۆریستەکانەوە کە لە بەرگی پۆلیسی تورکیادا دەبن دەرفێندرێ و ڕۆژی دواتر جەنازەی ئێعدام کراوی لە بەینی قونیە و ئانکارادا دەدۆزرێتەوە. شەوی ١٠ی جۆزەردانی ١٣٧١ هاوڕێی تێکۆشەر کاک شاپوور فیروزی ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزب لە یەکێک لە بنکەکانی حیزب لە ماڵی خۆی و لە کاتی نووسینی بیرەوەرییەکانی شەهید کرا. ڕۆژی ١٤ی بەفرانباری ١٣٧٢ هاوڕێ تەها کرمانج لە شاری چورمی تورکیا بە دەستی جینایەت کارەکانی سەر بە ڕێژیم شەهید کرا. هەر لەو ماوەیەدا، سەید جەلال حوسێنی، کامەران شافعی، محەمەد فاتی، سەعدون عەباسی، جەمال نامی، دوکتۆر بارام، عەبدوڵلا بیژن فر، حەیدر خەسروی، مەحموود موجاهیدی، ڕەحیم چەنگاڵی و چەند کەسی دیکە وەک کادر و پێشمەرگە و ئەندام یا لایەنگری حیزب لە شارەکانی کوردستانی عێراق تیرۆر کراون و بەدەستی بەکرێگیراوانی ڕێژیم شەهید بوون.

دیارە هێزی پێشمەرگەش بە تۆڵەی ئەم کردەوە ناجوامێرانەی دوژمن دەیان عەمەلیاتی نیزامی بەڕێوە بردووە و سەدان کەسی لە دوژمن کوشت و دەیان کەسی لێ بە دیل گرتووە و ئیمکاناتێکی زۆری نیزامی وەدەست کەوتووە یا ئاوری تێبەرداوە و نابوودی کردووە کە لە ئاخری کتێبەکە دا جەدوەلی بەشێکی کە لە دەستمان دابوو وەک نموونە زەمیمە دەکرێ.

کاری تەشکیلاتی لەناوخۆ تایبەتمەندی خۆی پێ درا و ئیمکاناتێکی موناسبی بۆ تەرخان کراوە، دەکرێ بڵێین بۆ یەکەم جار بوو کە حیزبی دیموکرات بایخی ڕاستەقینەی خۆی بەم بەشەدا. بۆ ئەم بەشە لە دەرەوەی وڵاتیش مایە داندرا و هاوڕێیانی حیزبی و لایەنگران لە زۆربەی وڵاتەکان دڵگەرمتر لە جاران خەریکی تێکۆشان بوون، هاتنەوەی نوێنەرەکان بۆ کۆنگرە شوێنی تایبەتی خۆی دانابوو. کومیتەکان لە کۆنفرانسەکان دا تەرمیم کرابوونەوە. کارەکانیان بە شێوەیەکی ئوسوولی لەنێو خۆیان دا دابەش کردبوو، هەم کاری دیپلۆماسی و هەم تەشکیلات و تەبلیغات لێک جیا کرابوونەوە، هەوڵی دڵسۆزانەیان دەدا و پەیوەندی باشیان دەگەڵ حیزبەکان و شەخسیاتی کۆمەلایەتی و سیاسی وڵاتەکان دامەزراندبوو. لە زۆر شوێن دەگەڵ ئۆرگانەکانی حکوومەتیش ئاشنایەتییان پەیدا کردبوو

بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان ئەزمێکی نوێ و خێراتری بە خۆوە گرتبوو.

جگە لەوەی بۆ خۆیان هەوڵیان دەدا کارەکانیان جێبەجێ دەکرد، هاوڕێیانی ڕێبەری حیزب بەتایبەت بۆ خۆم وەک سکرتێری گشتی هەر نەبا بە یەک دووساڵ جارێک سەرم دەدان و یارمەتی فکریم دەکردن و دۆستایەتییەکانم دەگەڵ ئەحزاب و ئەفراد بۆ تازە و گەرمتر دەکردن و هێندێک پەیوەندی تازەشمان دەگرت و بەمەشوەرەت و هاوفکری هاوڕێیانی کومیتە لە هەروڵاتێک بەرنامەی کارمان دادەرشت و هێندێک چاوپێکەوتن و ئیقدامی پێویستمان دەکرد. بەتایبەتی ئەو سیمینارانەی کە بۆ گشت دانیشتوانی ئەو شارولاتانەمان پێک دینا گەلێک بەکەلک بوون. هەم خەلکەکە زوو زوو لە وەزعی کوردستان و ئیران ئاگادار دەبوون هەم ئێمە لەپێشنیارە بە فایدەکانی بەشداران کەلکمان وەردەگرت. دەراستیدا ئەوە شتێکی تازە بوو کە بۆ یەکەم جار ئێمە دەستمان پێ کرد و تائێستاش زۆر جار دووپات دەبێتەوە. باشیی کار لەوەدابوو دوای هەر سەفەرێک ئاکامی گشتی سەفەرەکەم و هێندێک جار زۆر بەووردی، هەروەها بڕوای خەلک و پێشنیاری هاوڕێیانم بۆ دەفتەری سیاسی و دوایەش بۆ کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی باس دەکرد تا ئەوانیش هەلسەنگاندنی خۆیانی لەسەر بکەن و بە تێکرا کەلکیان لێ وەرگرین: ئەوەش ئموونەی ڕاپۆرتێک لەم بابەتە بۆ کومیتەی ناوەندی:

**زۆر بەرێز کومیتەی ناوەندی:**

بە سلاوێکی گەرمەوە بە پێویست دەزانم ڕاپۆرتی کار و تێکۆشانی سەفەری دوایيم بۆ دەرەوەی ولات کەسەرجەم سێ مانگ و دوو ڕۆژی کێشاوە هەر چەند بە کورتی بەلام بە تێکرا و بە شێوەی خواردوە پێشکەش بکەم. بۆ ئاگاداریتان پێشتر بە شێوەی شفاهی ڕاپۆرتم پێشکەشی دەفتەری سیاسی کردووە و پێشتریش لە جەریانی سەفەرەکەم دا هەر دە پازدە ڕۆژ جارێک هەول و تێکۆشانی خۆم لە ڕێگەی فاکس بۆ هاوڕێیانی دەفتەری سیاسی بەرێ کردووە.

١- هەروەک لە وتووێژی ڕادیۆیی دەنگی کوردستانی ئێران دا باسم کرد لەم ماوەیەدا سەرم لە نۆ ولاتی فەڕەنسا، ئەلمان، دانمارک، هولەندا، ئەرویژ، سوئید، بریتانیا، ئوتریش و سویس داوە، بۆ هێندێک لەم ولاتانە وەک فەرەنسا، ئەلمان، هولەندا دووجار چووم چونکە لە کاتی خۆی دا بەرنامەکەیان ڕێک و پێک نەبووە و دیدارەکانمان بۆ نەکراوە. جگە لە سویس لەباقی شوێنەکان کۆنفرانسی حیزبی گیراوە،

هەم کومیتە هەڵبژێردراوەتەوە و هەم نوێنەر بۆ کۆنگرە.
٢- لە نەرویژ، سوێد و هولەندا کۆنفرانس یا سیمینارم بۆ کوردەکانی دانیشتووی ئەم شوێنانە داوە و لەسەر وەزعی کوردستان بە گشتی و وەزعی ئێران و جیهان و چلۆنایەتیی هەل و مەرج بە درێژی باس کراوە و بەتەواوی وڵامی پرسیارەکانیان دراوەتەوە. لانی کەم هەر یەک لەم سیمینارانە سێ سەعاتی کێشاوە. نەوار و فیلمەکانیان لە دەرەوە هەمن رەنگە هێندێکیش لەلای من هەبن یا درابن بە ئارشیو.
٣- دیدارە دیپلۆماسییەکان لە ئەحزاب و بەرپرسانی حکوومەتی و شەخسیاتی خارجی لە فەڕەنسا ٧جار، لە دانمارک ٥جار، لە ئەڵمان ١٢جار، لە ئینگلستان ٤جار، لە هولەندا ٣جار، لە نوتریش ٨جار، لە سویس ٢جار.
سەرجەم ٤١دیدار کە زۆربەیان هەیئەت بوون و ئێمەش وەک هەیئەتی حیزبی بەشداربووین.
٤- چاوپێکەوتنی کەسایەتییەکان و هێزە کوردستانییەکان (فەڕەنسا ٦جار، ئەڵمان ٥جار، دانمارک ١جار، نەرویژ ٣جار، سوێد ٧جار، بریتانیا ٥جار، هۆڵەندا ٣ جار، نوتریش ٣جار، سویس ٣جار، کۆ ٣٥جەلسە).
٥- چاوپێکەوتن دەگەڵ شەخسیاتی حیزبی و ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی، شورا ٢جار، مریم رجوی جارێک، باقر مونمینی جارێک، رادکارگر جارێک، راه فدائی جارێک، چریکی ئەقەلیەت جارێک، چریکی مهدی سامع جارێک، تغازنو جارێک، سەرجەم نۆ دیدار.
٦- لەم ماوەیەدا سێ وتووێژی رادیۆییم لە سوێد، دوو لە بەریتانیا، لە فەڕەنسا دووجار، دووجار لە نوتریش هەبووە. سەرجەم ٩ وتوێژی رادیۆییم هەبووە.
٧- دەگەڵ رۆژنامەوانان و تلویزیۆن لە پاریس ١ جار دەگەڵ ئێران زەمین و پروگرێس لە لیۆن، لە ئەڵمان دەگەڵ رۆژنامەی برلینا، لەهولەندا دەگەڵ پیت مولیروا کوردستان کوریە و، هەروەها دەگەڵ گۆڤاری ئاوارە و رۆژنامەی رەسمی فولکس کران. لە سوێد دەگەڵ ئامانج و میدیا، لە ئینگلیس دەگەڵ کوردستان فۆکۆیس هەروەها دەگەڵ ٥ پێنج رۆژنامە لە وتووێژی چاپەمەنی لە نوتریش، سەرجەم ١٤ وتووێژی رۆژنامەیی.
٨- لەم ماوەدا جگە لە نامەیەکی گشتی بۆ ملاقاتەکان، نیزیکەی دە نامەشم لە پێوەندی لەگەڵ پەنابەرەکان بۆ UN لە تورکیا و ژنێڤ و نوتریش و وەزارەتی کشوەری فەرانسا، وەزیری کشوەری نوتریش، انترناسیونالی سۆسیالیست و هەروەها نامەم بۆ پتروس غالی سەبارەت بە تێرۆریزمی رێژیم تەحویل دانەوەی قاتلەکانی شەهید تەها کرمانج لەلایەن تورکیاوە نووسیوە.

بەم پێیە لە ماوەی ئەم سێ مانگە زیاتر لە (١١٠) کۆنفرانس و سیمینار و دیداری سیاسی و وتووێژی رادیۆیی و رۆژنامەنووسیم هەبووە بە تێکرا دەگەڵ ئەوەش کە دوو تەحتیلی کریسمس و ژانویەی تێدا بووە و، پانزە رۆژیش پاسم نەبووە، بۆ خۆم لە سەفەرەکەم رازیم و پێم وایە ئەوەی لە توانام دابووە کردوومە. بە پێویست دەزانم سوپاسی هەموو ئەو هاورێیانە بکەم کە بۆ بەرنامەرێژی هاوکارییان کردووم و لە هەموو شوێنەکان وەک هەیئەت دەگەڵم بوون، هەروەها بەجێ دەزانم سوپاسی کاک عوسمان رەحیمی کە لە ئاڵمان و هوڵەندا دەگەڵم بووە، سوپاسی کاک ئەبی کە لە دانمارک و سوئید دەگەڵم بووە و هەروەها سوپاسی کاک سەعید بیگ زادە بکەم کە بەشێک لە ئەرووێژ و تەواوی سەفەرەکەم لە سوئید دەگەڵم بووە، بکەم. بێ شک هاوکاری هەمە لایەنە لە سەرکەوتنی سەفەرەکەم دا زۆر بە کەڵک بووە، هەروەها کاک عەلی قازی لە ئەڵمان هاوکاری بەرچاوی کردووم. بە کوردی هەوڵم داوە لەم سەفەرە دا هەرچی رۆژێک کوردایەتی کردبێ کەڵکی لێ وەرگرم. بۆ ئاگاداریتان دەگەڵ ئوێنەرانی ئەسڵی پارتی و یەکیەتیش پێوەندیی رۆژانە و حەوتووانەم هەبووە.

حەز دەکەم عەرزتان بکەم کە ئەو سەفەرەی من بۆ حیزب بە (٢٥٦٠) دۆلار و (٥٣٦٦) فرانک کەوتووە کە هەر لەم سەفەرەدا ١٨٤٦ دۆلار و ١٩٦٦ فرانکم وەک یارمەتی لە هاورێیان و لایەنگرانی حیزب وەرگرتۆتەوەو دەگەڵ کۆمیسیۆنی ماڵی بەحیساب گیراوە. قەرارە بۆ یەکەم جار ناوی ئەو کەسانەی یارمەتییان داوە لە رۆژنامە دا بنووسرێ. خراپ نییە بزانن کە لە هەمووی ئەو دیدارانەدا بەتایبەتی لە دیدارە سیاسییەکان دا بە دوور و درێژی باسی مەسەلەی کورد بە گشتی و کوردستانی ئێران و وەزعی حیزبمان بەتایبەتی کردووە، لەسەر ماهییەت و وەزعی رێژیمیش ئەوەی بۆمان کراوە کردوومانە گوتوومانە. لەسەر هەل و مەرج و وەزع ئەزەر خوازی کراوە و سەبارەت بە رێژیم و کورد بۆچوونیان پرسراوە کە بە پێویست دەزانم لەچەند خاڵی خوارەوەدا خولاسەیان کەمەوە:

١- هەموو وڵاتە ئوروپاییەکان و ئەمریکا مەسڵەحەتی خۆیان لەسەرەوەی هەموو شت دادەنێن. ناتەبایی نێوخۆیان لەسەر زۆر مەسەلە بەرچاوە و نایێ وا بزانین وڵاتانی ئوروپایی گوێڕایەڵی سیاسەتی ئەمریکان و هێندێک وەخت کە باسی ئەمریکا دەکرێ، هێندێکیش حەساسییەت نیشان دەدەن و پێیان خۆش نییە ئەمریکا بەیەکەم دەسەڵات و ئەربابی وانیش بناسرێ.

٢- زۆربەی بەرپرسان لەسەر مەسەلەی کورد بە پێچەوانەی جاران شارەزاییان زۆرە و

پێشیان وایە گەلێکی ستەم لێکراوە، بەڵام هیچ کامیان دانی خێریەیەک پارچەبوون و یەکگرتنەوەی کورد لەم هەل و مەرجەدا ناهێنن و زۆریش پێیان وایە کە جارێ ئەم مەجالە نییە باس لە کوردستانی گەورە بکرێ. بۆ مافی مرۆڤ و تەتبیقی لە کوردستان، ئەوپەڕەکەی تا سەرحەدی ئوتونۆمی و فیدراڵی ئاشکرا دەکەن.

٣- هێندێک بەڕاشکاوی دەڵێن وریا بن، دوور نییە ئەگەر ئاڵوگۆڕی ئاسالم بکرێ ئەمجاریش فیداتان کەن.

٤- کارەکانی ئەم دواییانەی PKK شوێنەواری مەنفیی لەسەر زوربەی بەرپرسان داناوە و لە زۆر جێگە بە توورەیی باسیان دەکەن و تەنانەت هێندێک تێکیشی دەخەنەوە و لەسەر هەموو کوردی حیساب دەکەن.

٥- بڕوای هێندێک لە زانایان وایە کە ئێمە دەبێ لە وڵاتانی سۆسیالیستی پێشوو، هەروەها لە وڵاتانی ئاسیای نێوەڕاست کەڵک وەرگرین، پێیان وایە ئێستا ئەوان بۆ یارمەتی و پشتیوانی لە کورد ئامادەگیان زۆرتر لە جارانە و هەرواشە.

٦- لەزۆر جێگایان کە باسی ئۆرگانیزمی هاوبەشی کورد لەدەرەوەی وڵات دێتە گۆڕێ بە هەنگاوێکی بەنرخ و گرینگی دادەنێن، بەڵام کە ناتەبایی و ناکۆکییەکەی ناو هێندێک لە هێزەکانی کوردستان دەبینن پێیان وایە وازوو سەر ناگرێ و کاری زۆر دەوێ. دیارە بە کردەوەش هەروایە.

٧- لەسەر ڕێژیم بە تێکڕا تەنانەت ئەڵمانی و فەرەنساوییەکانیش کە ئێستا معامەلەیان دەگەڵ دەکەن لەسەر ئەو باوەڕەن کە ڕێژیم هی ئەو دنیایە نییە و زۆربەیان لەسەر ئەو باوەڕەن ئیسلاح نابێ و ماکەی بنیادگەرایی و تیرۆریزمە، بەڵام نەبوونی ئیتیفاق لە نێو دەوڵەتەکان دا کە بەشێکی سەرچاوەی ماددی و ئابووری هەیە بۆتە هۆی ئەوە کە جارێ بڕیارێکی هاوبەشیان نەبێ و لە زۆر شوێن لەگەڵ ئەزەرەکانی ئێمە بەتایبەتی دەگەڵ ئەوەی کە دەمگوت ئەوە غوودەیەکی سەرەتانییە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و خەریکە هەڕەشە لە دنیاش دەکا، موافق بوون و پێیان وابوو دەبێ لە فکری چارەسەرکردنی دا بن.

٨- بە تێکڕا پێیان وایە کورد دەبێ دەنێوخۆی دا تەبابێ، یەک بگرێ و هەروەها لە ئێران بەرەیەکی وەسیع بە پێویست دەزانن. لەلای زۆر لایەن سەمپاشی دژی شورا و موجاهیدین کراوە. ئاشکرایە کە ڕێژیم هێندێک عەناسوری شەرقناسی کڕیوە و کاریان بۆ دەکەن و لەزۆر جێگا دژی موجاهیدین و ئۆپۆزیسیۆن دەدوێن. لەم سەفەرەدا و بەتایبەتی لە وتووێژەکانی رادیۆ تەلەڤزیۆنی دا بۆم دەرکەوت کە خەڵک ئاگاهانە و

ناناگاهانە، کە شکم لەوەدا نییە ڕێژیم هەوڵێکی زۆری بۆ ئەوە داوە، دژایەتییەکی بەهێز دژی موجاهیدین و شورا دەکەن. بەتایبەت لە سوئید و ئەڵمان ئەم مەسەلە بەرچاوترە.

٩- هاتنە پێشی وەزعی کورد و مانەوەی حکومەتی هەرێم تەنسیری موسبەتی لەسەر وردی خەڵک کردووە، ئێستا کوردی دەرەوە زیاتر لەجاران خۆ لێ دەدەن. هەر بەم پێیە هاوڕێیانی ئێمەش ئێستا دوای چوونە دەر هەم زیاتر بوون و هەم تێکۆشانیان بەرچاوترە. ئەگەر هێندێک ئەزم هەبێ و شتەکانمان بەوەختت بگەن و بڵاو بنەوە، زۆر لەمەش زیاتر ئەقشمان دەبێ و بەتایبەتی ئەگەر ئیمکاناتی مالی تاڕادەیەک دابین بکرێ دەبینە یەکەم هێزی کوردستانی ئێران.

هەرچەند ئەو جەماعەتە بەهەموو توانای خۆیان و ویشک و برینگی تایبەتییان دژمان بوون و هەن لە زۆر جێگە مانعی چوونی ئێمە بۆ هێندێک کۆڕ و کۆمەڵ بوون، بەڵام بەهۆی مەنتیقی بوونی سیاسەت و ڕەفتاری ئینسانی هاوڕێکانمان لەزۆر جێگا ئەم مانعە هەڵگیراوە و دەبێ هەوڵ بدەین لەهەر شوێنێکیش مابێ بە بەحس و ئیقناع قەناعەت بەوانە بێنین کە سیاسەتەکەیان غەڵەتە. بەداخەوە بۆ خۆشیان ئەوەندە عاقڵ نین بتوانن پێش بەم شتە نادروستانە بگرن و گەلێک جار بە ئەهاتنی خۆیان مەیدان بۆ ئێمە ئاواڵەتر دەکەن کەدەبێ بیقۆزینەوە تا جێگەی کوردی ئێران خالی نەبێ.

پێویستە بگوترێ کاری کاک عوسمان هەرچەند لەم ماوەدا جگە لە دووسێ مانگ هەر لە کەمپ ژیاوە و زۆر مەحدوود بووە لە پێوەندی لەگەڵ کاری ئەورووپادا بەکەڵک و بەسوود بووە و زەحمەتەکانی لەلایەک و مایەدانان لەباری ماددییەوە لەخۆی جێگەی سوپاسە. گەڕانەوەی کاک عوسمان و کاک خالید لەکاتی خۆیدا جێگای خۆشحاڵییە و پێشی هێندێک ورتە ورتی بەجێ و بێجێ دەگرێ و تەنسیری تایبەتی خۆی هەیە.

بۆ ئاگادارێتان بە پێشنیاری کاک عوسمان و موافەقەتی من و کاک نەبی و کاک سەعید کە لە نزیکەوە کاک ڕەحیم دەناسین، سەرەڕای کەم و کوڕییەکانی هاوڕێیەکی دڵسۆز و زەحمەتکێشە جارێ وەک بەرپرسی کاتی ئەورووپا دیاری کراوە. بەرپرسی چاپەمەنی حیزبیش جارێ هەر ئەوە و ئەم بەشەش کەموکوڕی هەیە، بەڵام لەیەک دوو سالی پێشوو باشترە. ئێستا لەچەند کومیتە فاکس هەیە و دەتوانن زۆر خێرا ئیعلامیە و خەبەر بەیەکتر بگەیەنن. کومیتەی ئوتریشیش توانیویانە دام و دەزگایەکی کامپیوتەری بۆ چاپ ئامادەکەن کە ئێستا لە زۆر بارەوە کەڵکی لێ وەردەگرن.

# چەند پێشنیار

پێم وایە بۆ باشتر بەڕێوەبردنی کارەکان لەدەرەوە و گەشەپێدانی کاری دیپلۆماسی و پێکهێنانی پێوەندی جیددی لەبەینی ئێرە و ئەوێ دا دەبێ ئەم کارانەی ژێرەوە بەپێی ئیمکان ئەنجام بدەین :

١- ئەگەر دەمانەوێ کارەکان باش بچنە پێش دەبێ بێ ترس لە لۆمە و تانەیەک دوو نەفەری سابتی کار لێهاتوومان تەنانەت لە سەتحی ڕەهبەری لە دەرێ هەبێ.

٢- ئەوکارانەی کراون و ئەم پێوەندییە دیپلۆماسییەی پێک هاتووە لەلایەن ئەوانەوە پشتگیری بکرێ و ئەپسێتەوە و هەموو سالێ ریسەکەمان لێ ئەبێتەوە خوری.

٣- بەهەر چەشنێک بێ دەبێ ئیمکاناتێکی ماددی بۆ کارەکانی دەرەوە دابین بکرێ و لەم پێناوەدا بەشێکی بخرێتە سەرشانی ئەندامان و لایەنگران. بە بڕوای من لانی کەمی ئیمکان بۆ وێ ئێستا کە کامپیوتیرمان هەیە دوو هەزار دۆلار لە مانگ دایە.

٤- لە هێندێک ئینسانی خاوەن زانست و لێزان وەک مشاوری جەنبی بۆ پەرەگرتنی کاری دیپلۆماسی لە وڵاتەکان کەڵک وەرگرین و لێیان غافڵ نەبێن و کاریان پێ بسپێرین.

٥- پێم وایە دەبێ پێوەندی تەشکیلاتی لە هێندێک وڵاتی دیکەش وەک کانادا، ئیسپانیا، ئەمریکا و ئیتالیا کە کەم و زۆر نەفەری جێ باوەڕیان لێیە دابمەزرێنین و لەڕێگەی ئەوانەوە کەم کەم وەک حیزب لەم شوێنانە خۆ مەتردح کەین و سمینار و کۆبوونەوان پێک بێنین و بەم شێوە کاری دیپلۆماسیش لەم وڵاتانەدا دەست پێ بکەین، ئەگەر ئێستاش یەک دا بەدوو کەڵکی تایبەتی و بەرچاوی نەبێ، بۆ داهاتووی حیزب و گەل زۆر بە سوودن.

٦- بە بڕوای من دەبێ بۆ تەقویەتی وەزعی ماددی حیزب دوو ئەرک بۆ ئەندامان دابندرێ، یەک هێندێک جار هەردووەز بکەن بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی. هەرکام لە

خۆشیان لانیکەم مانگێ معادلی ١٠ دۆلار راستەوخۆ بۆ نێرە دەنەزەر بگرن و لەیەک دوو وەعدەدا بۆ دەفتەری سیاسی بنێرن.

٧- دەزگایەکی کامپیوتەری لەوانەی دەرەوە بێننەوە نێرە و لە یەکێک لە شارەکان بەبەرقی سابیت و سەرتاسەری کاری پێ بکەین با لەم وەزعە نالەبارە نەجاتمان بێ.

٨- بۆ ئەوەی نەشریاتمان بەوەخت بگا، هەم لە پۆستی بەغداد و مسافر، هەم لە موجاهیدان، هەم لە پۆستی تازە دامەزراوی هەولێر و زاخۆ کەڵک وەرگرین.

٩- درێژەدانی پێوەندی دەگەڵ ناوەندە حکومەتییەکانی ئەورووپا و ئەمریکا و هەروەها هێندێک وڵاتی عەرەبی و تورکیا تا گەیشتن بە کاناڵی کاریگەر و راستەوخۆ بە ئەمریکی ئەساسی دەزانم و دەبێ زۆری هەوڵ بۆ بدەین و ماندوو نەبین.

١٠- بە پێویست دەزانم لە داهاتوودا دەگەڵ رووسیا و چەکسلواکی بە هەردوو بەشییەوە پێوەندی بگیرێ. هەروەها دەگەڵ ئەرمەنستان و کوردەکانی هەردوولا پێوەندی گەلێک پێویستە. وڵاتانی دیکەش کە فەرهەنگیان لێمان دوورنییە و کوردیشیان تێدایە بە پێی ئیمکان خراپ نییە پێوەندییان دەگەڵ بەرقەرار بکرێ.

دیارە لە سەرەوەی هەمووی ئەو خاڵانە بەهێزکردنی پێوەندی خۆمان و هاوڕێیانمان و کۆمیتەکان لەدەردەوەیە، چونکو دارێژەری ئەسڵی بەرنامەکان دەبێ هەر ئەوان بن.

# بەشی پێنجەم

بەگوێرەی پێڕەوی نێوخۆی حیزب وەختی بەستنی کۆنگرە نیزیک ببۆوە، وەزعی سیاسی و ئاڵوگۆڕەکانی دنیا بەتێکڕا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەل و مەرجی تایبەتی کوردستان بەتایبەتی حوکمی دەکرد لە فکردابین و لەکاتی خۆیدا واتە لە بەهاری ٧٣ دا کۆنگرە بگرین. بۆیە لە مانگی خاکە لێوەدا دەست بە گرتنی کۆنفرانسەکان کرا و لەماوەی یەک دوو حەوتوودا نوێنەران هەڵبژێردران و بڕیارنامەکانی کۆنفرانسەکان ئامادەکران. پلینۆم بەسترا و ئاکامی موتاڵی ڕاپۆرتی لە پێشدا گەڵاڵە کرا و لەلایەن هاوڕێیانی ڕێبەری هەڵسەنگێندرا و بەهێندێک ئاڵ و گۆڕ ئامادەی پێشکەش کردن بە کۆنگرە بوو.

کۆنگرەی دەهەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ ڕۆژی یازدەی بانەمەڕی ساڵی١٣٧٢ بە بەشداری نوێنەرانی هەڵبژێراوی ئۆرگانەکان پێکهات و پێش نیوەڕۆی ڕۆژی یازدەی بانەمەڕ سەرکەوتووانە بەڵام تێکەڵاو دەگەڵ داخ و کەسەرێکی زۆر دوایی هات.[1]

لەم کۆنگرەدا دوای پێشکەش کردنی ڕاپۆرتی کومیتەی ناوەندی لەلایەن سکرتێری گشتیی حیزب، ڕاپۆرت بە قووڵی کەوتە بەر باس و بە گونجاندنی هێندێک تێبینیی بەشداراتی کۆنگرەوە پەسند کرا.

بەشی دیکەی کاری کۆنگرە واتە پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنەوەی پەیڕەو و پرۆگرامی حیزب بۆ پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە هێندێک لە خاڵەکانی کە لەلایەن کومیتەی

---

١- بەداخەوە لە ڕێکەوتی ٧٣/٢/١١ لەحاڵێکدا ئێمە بەگەرمی خەریکی بەڕێوەبردنی بەرنامەکانی کۆنگرەی دەهەم بووین. شەڕی براکوژی بەینی یەکیەتی و پارتی دەستی پێکرد. ئێمە بەحوکمی ئەرکی کوردایەتی کاری کۆنگرەمان وەدوا خست و کەوتینە تێکۆشان بۆ بەرگری لە پەرەساندنی شەڕ و، یەکەم حیزب بووین کەلەلایەک دەگەڵ بەرپرسانی ڕانیە و قەڵادزێی هەردوولا دەدواین و لەلایەکی دیکەوە، دەگەڵ کاک مەسعود و مەکتەبە سیاسییەکانی پارتی و یەکیەتی کەوتینە پەیام ناردن و ڕەجا کردن بۆ پێشگیری لەپەرەساندنی ئەو شەڕە شوومە و چەندین پەیامان ئاڵوگۆڕ کرد کە بەداخەوە سەرەڕای ئەوەی هەردوولا بەڵێنیان دا شەڕەکە تەواوکەن، ئەوانەی سازیان کردبوو تێنیان دە شەڕەکە دەکرد و نەکوژایەوەو ئەو خەسارە گەورە کە بەهیچ شێوەیەک قەرەبوو ناکرێتەوە بەسەر گەلی کورد دا سەپا و دوژمنانیش بەهرەی خۆیان لێ وەرگرت.

تایبەتی ئەم بەشە پێشنیار کرابوو، دەستی پێکرد. لەم بەشەدا بوو کە دروشمی لە مێژینەی حیزب "دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان "گۆڕدرا و بوو بە" دیموکراسی بۆ ئێران و دیاری کردنی مافی چارەنووس بۆ کوردستان".

پەسندکردنی بڕیارنامە بەشی سێهەمی کاری کۆنگرە بوو کە لە شوێنی خۆیدا دەخرێتە بەرچاوتان. بەدوای ئەو بەشەدا هەڵبژاردنی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و جێگرەکان بەڕێوەچوو. لەماوەی نێوان بەشەکانی کاری کۆنگرەدا، هەرکات دەرفەتێک هەبا یەک یا چەند پەیام لەو پەیامانەی لەلایەن حیزب و ڕێکخراوو کەسایەتییە سیاسییەکان را هاتبوون دەخوێندرانەوە.

راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی دەهەم، یەکێک لە وردترین و هەمە لایەنەترین راپۆرتەکان بوود کە پێشکەش بە کۆنگرەکانی حیزب کراون.

لەم راپۆرتەدا سەبارەت بەوەزعی جیهان هاتووە کە:

" لەمەودای نێوان دوو کۆنگرەی نۆهەم و دەهەم دا ئاڵوگۆڕێکی قووڵ و هەمە لایەنەی ئەوتۆ لەرادەی جیهان دا روویداوە کە هەتا چەند ساڵ لەمەو پێش بە فکر و بیری کەم کەس دا دەهات، لە پێشەوەی گشت ئەو ئاڵوگۆڕانە، ئەوەی کەوەک گرینگترین رووداوی ئەم چەرخە دەژمێردرێ، هەڵوەشانی فیدراسیۆنی گەورەی یەکیەتی سۆڤیەت، بەسەربەخۆیی گەیشتنی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەراست و قەفقاز و کۆمارەکانی رۆخی دەریای باڵتیک و وەلاچوونی گەورە هێزی رۆژهەڵات لەسەر بەرزەکی رقە بەریی جیهانییە.

یەکەمین ئاکامی ئەم رووداوە گەورەیە لەرادەی جیهانی دا مانەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک بەتواناترین دەوڵەتی جیهانە کە دەکرێ بڵێین بەرهەڵستکارییەکی ئەوتۆ لە بەرانبەر خۆیدا نابینێ. گۆڕانی سیستیمی زاڵ بەسەر وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات، گەرانەوە و دامەزرانەوەی نیزامی سەرمایەداری لە بلووکی رۆژهەڵات، هەڵوەشانی پەیمانی وەرشەو و هەوڵدانی ئەندامانی پێشووی بۆ چوونە نێو پەیمانی ئەتلانتیکی شیمالی و هتد... هەموویان ئاکامی هەڵوەشانی فیدراسیۆنی ناوبراون."

لە راپۆرتەکەدا وەزعیەتی رێژیم لە کوردستان بەکورتی بەم جۆرە خراوەتە بەرچاو:

لە کۆتایی کۆنگرەی نۆهەمی حیزبەوە هەتا ئێستا، وەزعیەتی کوردستان، وەک بەشێک لە ئێران، پیشاندەری هەمان وەزعیەت بووە کە لەباقی بەشەکانی وڵات دا لە ئارادا بووە.

ناڵ و گۆڕەکان هەرچی بووبن، درێژە و ناکامی بێ ئەملا و ئەولای سیاسەتەکانی رابردووی ڕێژیمە کە تا ئێستا نیدامەیان بووە. سەرەڕای ئەمەش بەهۆی هێندێک ڕووداوی گرینگ، کە بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق هاتوونەتە پێش، وەزعیەتی سیاسی لە کوردستانی ئێران، چلۆنایەتی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی خەڵک و هەڵوێستی ڕێژیم لە بەرانبەری دا، ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە، ئاڵوگۆڕێک کە لەهەر زەمینەیەک دا تایبەتمەندی خۆی هەیە و قووڵیی و بەرینایەکەیان لە پێوەندی دەگەڵ هەر کامیان جیاوازی هەیە.

"وەزعیەتی نابەسامانی ئابووری، رەواجی بازاڕی دزی و بەرتیل خواردن لە گشت نیدارە دەوڵەتی و نیوەدەوڵەتییەکان دا و کەمبوونی پێداویستییەکانی ژیان و گرانیی لەڕادەبەدەر ئەگەر لە کوردستان زۆر زیاتر و توند و تیژتر لە باقی ناوچەکانی ئێران نەبێ، هەرنەبێ لە هێندێک بارەوە خراپترە".

"ئەم وەزعیەتە پڕ کارەساتە پێ بەپێی ئەو ڕووداوانەی کە لە کوردستانی عێراق دا هاتوونەتە پێش لەلایەکەوە بۆتە هۆی هاتنە خواری وەرەی هێزە چەکدارەکانی ڕێژیم لە گشت ئۆرگانە سەرکوتکەرەکان دا و، لەلایەکی دیکەوە بۆتە هۆی چوونەسەری هەستی خەباتگێڕی و هیوا بەسەرکەوتن و گەیشتن بەئازادی لە نێو کۆمەڵانی خەڵکی کورد لە شار و گوندەکان دا...."

لە پێوەندی لەگەڵ فەعالییەتی رێبەرایەتی حیزب لە زەمینەی سیاسیدا راپۆرت ئاوا دەدوێ:

"حیزب تا ئەو جێگایەی لەوزەی دا بووە، لە راستای پێکهێنان و هەرچی پتەوتر کردنی پێوەندی دۆستانە دەگەڵ هەموو حیزب و رێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان سیاسەتی هەمیشەیی خۆی سەرکەوتوانە بردۆتە پێش و تەوەرەی ئەسڵی سیاسەتی تەبلیغاتی حیزب بریتی بووە لە هێورکردنەوەی پێوەندی نێوان هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن، مەحکووم کردنی شەڕی براکوژی و پێکهێنانی هەلومەرجێکی لەبار بۆ نزیکبوونەوە لە حیزب و رێکخراوە کوردییەکان لەهەر چوار پارچەی کوردستان دا. لەسایەی رێباز و سیاسەتێکی ئەوتۆدا بووە کە رێبەرایەتی بەشەکەی دیکەی حیزب ناچاربوون لە رۆژەکانی کۆتایی ساڵی ١٣٧١ دا بە " ئەگەر و بەڵامێکی زۆرەوە، دەستیان لەشەڕ دەگەڵ ئێمە هەڵگرت و بە شێوەیەکی رەسمی، بەڵام زۆر ناسیاسییانە رایانگەیاند". ئەوەش دەقی بڕیارنامەی پلینومی کومیتەی ناوەندییانە کە لە رۆژنامەی ژمارە ١٩٥ی کوردستان و لە مانگی رەشەمەی ١٣٧١ دا بلاوکراوەتەوە.

"پلینوم دوای باس لەسەر راپۆرت بەو ئاکام و بڕیارە گەیشت کە بە لەبەر چاوگرتنی وەزعی مەنتەقە و مەسەلەحەتی گشتی گەلی کورد لەو قۆناغە حاستەمەدا کە ئێستا پێیدا تێدەپەڕێ شەڕ دژی تاقمی لادەر بە شێوەیەکی یەک لایەنە رابگرێ.
بەڵام ئاشکرایە کە کادر و پێشمەرگەکانی حیزب لەلایەن هەر دەستە و تاقمێکەوە بکەونە بەر پیلان و هێرشی چەکدارانە، مافی دیفاعی بێ ئەم لاولایان لە خۆیان هەیە و لەم بوارەش دا حیزبی دێموکرات نیشانی داوە کە زۆر بەباشی دەتوانێ دژی هێرش کەران و پیلانگێڕان راوەستێ".

**کومیتەی ناوەندی**
**حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران**
**١٣٧١/١٢/١١**

"بێگومان بەحوکمی ئەوە کە سیاسەتی هەتا ئێستای حیزب بە بڕوای گشت دۆستانی کورد سیاسەتێکی مەنتقی و لە پێناو بەرژەوەندی گەلەکەماندا بووە، ئەم سیاسەتە هەروا شێلگیرانە درێژە دەدرێ، چونکە ئەوە یەکگرتوویی و هاوکاری گشت هێزەکانی بەشدار لە بزوتنەوەدایە کە دەتوانێ سەرکەوتنی خەباتە رەواکەمان مسۆگەر بکات. خەباتێک کە هەتا ئەمڕۆ هەزاران کەس لە نازاترین رۆڵەکانی گەل گیانی خۆیان لە پێناوی دا بەخت کردووە. گەیشتن بە یەکگرتوویی و یەکبوونێکی ئەوتۆ ئاردەزوو و ئاواتی گشت ئەو کەسانەیە کە دڵیان بۆ ئازادی گەلی کورد لێدەدا و مایەی ترس و خۆفی هەموو ئەو کەسانەشە کە بۆ لەنێوبردنی بزووتنەوە رەواکەمان هەوڵ دەدەن."
هەر لەسەر ئەم تەرزە بۆچوونە و دڵسۆزییەکی کە حیزبمان لە هەموو هەل و مەرجێک دا نیشانی داوە و بەکردەوە بۆی چووە، دەیان پەیام لەلایەن حیزبە سیاسییەکان، ئۆرگانەکانی حکوومەتی هەرێم، کەسایەتییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی دەر و ژوور بۆ کۆنگرەی "دە" هاتبوو کە بەداخەوە بەهۆی کەمی ئیمکانات لەهەل و مەرجی خۆیدا چاپ نەکران و بڵاونەبوونەوە، بەڵام زوربەیان لە فرسەتی موناسیب دا لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەدا خوێندرانەوە. ئێمە لێرەدا جارێکی دی ناویان دەنووسین تا بەم چەشنە وەک سکرتێری ئەو کاتی حیزب سوپاسی دووبارەم لەهەستی خاوێنیان بەرانبەر بە حیزب و گەلە بەشخوراوەکەمان دەربڕیبێ. هیوادارم لەبەر ئەوەی پەیامەکان شتی مێژوویی و ئامۆژگاری بەکەڵکیان تێدایە هەروا بپارێزرێن و لە هەل و مەرجی هەڵکەوتوودا چاپ و بڵاوبکرێنەوە.

## حیزبه کوردستانییەکان:

١- ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عیراق.
٢- یەکیەتی نیشتمانی کوردستان.
٣- حیزبی شیوعی عیراق.
٥- حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان.
٦- ڕێکخراوی کاوە.
٧- حیزبی سوسیالیستی کوردستانی عیراق.
٨- حیزبی رزگاری کوردستان.
٩- پارتی ولاتپارێزی کوردستان.
١٠- سازمانی خەباتی نەتەوایەتی و ئیسلامی کوردستانی ئێران.
١١- سازمانی خەباتی شۆڕشگێڕی کوردستان.
١٢- بزووتنەوەی دیموکراسی خوازانی کوردستان.
١٣- کۆمەڵەی یەکسانی کوردستان.
١٤- کۆمەڵەی نەتەوەیی کورد.
١٥-یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان.
١٦- یەکێتی قوتابیانی کوردستان.
١٧- یەکێتی قوتابیانی تورکمان.
١٨- یەکێتی خوێندکار و لاوانی زەحمەتکێشانی کوردستان.

**حیزبە ئێرانییەکان:**

١٩- کومیسیون ملیتهای شورایعلی مقاومت.
٢٠- سازمان مجاهدین خلق ایران.
٢١- سازمان کردستانی حزب کمونیست ایران
٢٢- حیزبی شیوعی کوردستانی عیراق.

## ئەنجوومەنەکان:

١- ئەنجوومەنی فەرهەنگی کورد لە ئالمیرە.
٢- یەکێتی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستان.
٣- ئەنجوومەنی پەنابەرانی دانیشتووی هەرێمی کوردستان.

## خاریجییەکان:

١- ئوتا تساپف نوێنەری سوسیال دیموکراتەکانی ئاڵمان لە پەرلەمان.
٢- جیرمی کوربون نوێنەری مەجلیسی عەوام لە پەرلەمانی ئینگلیس.
٣. ناوەندی راگەیاندن و بەڵگەنامەی کوردی لە ئاڵمانیا.
٤. پیترمولر بەرپرسی ئەنجوومەنی هۆڵەندی دۆستانی کورد لە هۆڵەندا.
٥. پرۆفیسۆر جۆرج هانریش لە ئوتریش.

## کەسایەتییەکان:

١- مامۆستا شێخ عزەدین حوسێنی.
٢- مامۆستا حسیب قەرەداغی.
٣- مامۆستا عیسمەت شەریف وانلی.
٤- مامۆستا غەریب پشدەری.
٥- مامۆستا بەهادین نوری.
٦-مامۆستا رەئوف بێگەرد.
٧- د. سەعدی بەرزنجی.
٨- جەمال محەمەد ئیسماعیل (سوارە قەڵادزەیی).
٩- ممتاز حیدری.
١٠- خالید دلێر.
١١- حەمە فەریق حەسەن.
١٢- شێرزاد حەسەن.
١٣- عەلی قازی (کوڕی رەش).
١٤- مستەفا شەڵماشی.
١٥- حوسێن کورد نەژاد.
١٦- کەریم زەند.
١٧- خالد عەزیزی.

کۆنگرە هەروەها دوای تەواو بوونی کارەکانی ناسایی چەند پەیامی بەم ناوانە نارد:
١- بۆ خەڵکی کوردستان.
٢- بۆ بنەماڵەی شەهیدان.
٣- بۆ بەندییە سیاسییەکان.
٤- بۆ ئەندامان و کادر و پێشمەرگەکان.

لەبەرئەوەی پەیام بۆ کادر و پێشمەرگەکانمان دوای گۆڕینی دروشمی حیزب گرینگی تایبەتی هەبوو، لێرەدا ئەو پەیامە دێنین:

## پەیامی کۆنگرەی دەهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ

بۆ ئەندامان و کادر و پێشمەرگەکانی حیزب:

«کۆنگرەی دەهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، گەرمترین سڵاوی شۆڕشگێڕانەی خۆی پێشکەش بە ئێوە کادر و ئەندامان و پێشمەرگە ئەبەزەکانی حیزب دەکا کە لە ماوەی ١٥ ساڵ خەباتی بێ وچان و سەنگەر بەسەنگەردا، بەوپەڕی فیداکاری و لەخۆبردوویی بۆ وەدیهێنانی ئامانجە بەرزەکانی حیزب و گەل تێکۆشاون. ئێوە وێڕای دیفاع لە ئازادی و سەربەستی ئەتەوەکەمان خۆشەویستی حیزبتان لەدڵی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا جێگیر کردووە.

هاوڕێیان! دەهەمین کۆنگرەی حیزب لەهەل و مەرجێکی ناسکی مێژوویی ئەوتۆدا گیرا کە سیمای سیاسی جیهان گەلێک ئاڵوگۆڕی گرینگی بەخۆیەوە دیوە. کۆنگرە لەبەر ڕووناکی ئەو ئاڵوگۆڕانە کە سەرانسەری گیتی گرتۆتەوە، خاڵە تاکتیکی و ستراتیژییەکانی حیزبی دەگەڵ دۆخی سیاسی جیهان نێزیک کردۆتەوە. بە چەشنێک کە کۆنگرەی دەهەم ڕێبازی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی دەگەڵ ڕەوتی ڕوو لەگەشەی دیموکراسی و مافی ئەتەوایەتی لە جیهاندا

هاوئاهەنگ کردووە.

بەشـداری هاوڕێیـانتـان لە کـۆنگرەدا و هاوبەشی چالاکـانەیان لەڕەوتی باس و لێکۆڵینەوە سیاسییەکاندا و هەروەها دەستنیشان کردنی خاڵە بنەڕەتییەکانی ئەم قۆناغە لەخەباتی گەلەکەماندا، بوو بەهۆی ئەمە کە کۆنگرە جارێکی دیکە پێ لەسەر دیاریکردنی مافی چارەنووس و دێموکراسی داگرێتەوە و وەک دروشمی حیزب پەسندی بکا.

لەم پێوەندییەدایە کە ئەرکی کادر و ئەندامان و پێشمەرگەکانی حیزب گەلێک لە جاران گرنگترە و پێویستە بۆ ناساندن و شیکردنەوەی زیاتری مافی دیاریکردنی چارەنووس و ئەو خاڵانەی وا لەبەرنامەدا هاتوون تێ بکۆشن. هەروەها تێکۆشان بۆ گرێدانی شێوەکانی خەبات لە پێناوی وەگەڕخستنی چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ بۆ رووخاندنی رێژیمی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامی لە پێویستییەکانی ئەم دەورە لە خەبات و تێکۆشانە.

کۆنگرە بە دڵنیایی لە سەرکەوتنی خەباتی ئازادیخوازانەی گەلەکەمان، رێز لەهەوڵ و تێکۆشانتان دەگرێ و ئاواتی سەرکەوتنی یەکجاریتان بۆ دەخوازێ.

**کۆنگرەی دەهەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**رێبەرایەتی شۆڕشگێر**
**١٣٧٣/٢/١٦**

کۆنگرە بە لەبەرچاوگرتنی سەرکەوتنی گەلی فەلەستین لە وتووێژێک دا کە لەژێر چاوەدێری نەتەوە یەکگرتووەکان و پترۆس غالی سکرتێری گشتی ئەو رێکخراوەدا بەڕێوەچوو، وای بەمەسڵەحەت زانی پەیامێکی بۆ بنێرێ و لەگەڵ سویاسی بۆ ئەم کارە گرینگەی ئەنجامی داوە و سەرنجیشی بۆ سەر مەسەلەی کورد راکێشێ. ئەمەش دەقەکەیەتی:

# پەیامی کۆنگرەی دەهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، بۆ پترۆس غالی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان:

لەگەڵ ڕێزماندا!

لەهەل و مەرجی ئاسکی پاش ئەم ئاڵوگۆڕە گرینگانەی کە لە سیاسەتی جیهانی دا هاتوونەتە ئاراوە و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشی گرتۆتەوە، لەکوردستان حیزبی ئێمە کە نێزیک بە نیو سەدەیە لە پێناو مافە ئینسانییەکانی گەلی کورد و بە پێی ڕاگەیەندراوی مافی مرۆڤ و بۆ وەدیهێنانی مافی دیاریکردنی چارەنووس لە چوارچێوەی ئێرانێکی دێموکراتیک دا خەبات دەکا، دەهەمین کۆنگرەی خۆی بەڕێوەبرد.

کۆنگرە پیخۆشحاڵی خۆی سەبارەت بە بەناکام گەیشتنی هەوڵەکانی چارەسەرکردنی کێشەی گەلی فەلەستین دەربڕی. لە وەها هەل و مەرجێکی گرینگ و هیوا دەر دا، کۆنگرەی دەهەمی حیزبمان لەگەڵ پێشکەش کردنی سلاو و ڕێزی خۆی، لە ئێوەی بەڕێز وەک سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان کە ڕێز لە ڕاگەیەندراوی جیهانی مافی مرۆڤ و مافی سەربەستی گەلان بۆ دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان دەگرن، داوا دەکا لە هێنانە گۆڕی مەسەلەی کورد لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان دا پشتیوانی بکەن و یارمەتی بدەن بۆ وەرگرتنی کۆڕی نوێنەرایەتی نەتەوەی کورد لەم ڕێکخراوەدا بۆ داکۆکی کردن لەمەسەلە ڕەواکەمان.

دیارە ئاگادارن کە نەتەوەی کورد بە درێژایی سەدەی بیستەم و تا ئێستاش بۆ وەدەستهێنانی ئازادی و دێموکراسی تووشی دەیان کارەساتی دڵتەزێن هاتووە کە ویژدانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی هەژاندووە. بەتایبەت گەلی کورد لە کوردستانی ئێران، ئەوا زیاتر لە پازدە ساڵە بەردەوام کەوتۆتە بەر هێرش و سەرکوتی کۆماری ئیسلامی ئێران.

بۆ دوایی هاتن بەم کارەساتانە و ئاشتی و ئاسایش لەم ناوچە گرینگەی جیهاندا، چارسەری عادیلانەی کێشەی سی میلیۆن ئینسانی کورد دەکرێ بڵێین دەکەوێتە سەر شانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بەڕێزتان وەکو سەرۆکی ئەم ڕێکخراوە جیهانییە.

هیواداریین لەم ئەرکە پیرۆزە و ئەرکەکانی دیکەتان دا سەرکەوتووبن

**کۆنگرەی دەهەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**

**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**

**٧٣ / ٢/١٦**

لەکۆنگرەی دەهەم دا بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەموو باس و وتووێژە کە لەسەر راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرە کرا، هەروەها بەگوێرەی چەند پێشنیارێکی بەکەڵک کەلەلایەن هاوڕێیانی بەشداری کۆنگرە درابوون، بڕیارنامەی ژێرەوە بەزۆرایەتییەکی نێزیک بەتەواوی دەنگەکان پەسند کرا.

١- کۆنگرە دوای باس و لێکۆڵینەوە لەسەر وەزعی سیاسی ئێستای کوردستان و ناوچەی رۆژهەلاتی نێوەراست و جیهان بە تێکرای دەنگ راپۆرتی سیاسی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی "١٠" تەئیید دەکا و سویاسی کار و تێکۆشانی کومیتەی ناوەندی دەکا.

٢- کۆنگرە دوای باس و لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی کار و تێکۆشانی حیزب لە نێوان دوو کۆنگرەی ٩ و ١٠ دا و دەستنیشانکردنی کەم و کووڕییەکان، رێنوێنی پێویستی خستە بەرچاو و داوای جێگیربوونی مودیرییەتێکی نوێی گونجاو لەگەڵ هەل و مەرجی ئێستا دەکا.

٣- کۆنگرە لەسەر دروشمی رووخانی رێژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران پێ دادەگرێ، بۆ ئەم مەبەستە درێژەدان و پتەوترکردنی دۆستایەتی و هاوخەباتی دەگەڵ هێزە دیموکرات و خەباتگێرەکانی سەرانسەری ئێران بە پێویست دەزانێ.

٤- بۆ پێکهێنانی پێوەندی و پتەوترکردنی دۆستایەتی دەگەڵ هێزە نیشتمانپەروەرەکانی کورد هەوڵی زیاتر بدرێ.

٥- بە لەبەرچاوگرتنی ئاڵوگۆڕەکانی سیاسی جیهان و چلۆنایەتی هەل و مەرجی خەبات لەکوردستان پێویستە هێزە کوردستانییەکان بۆ پێکهێنانی ئۆرگانیزمێکی کوردی لەدەرەوەی وڵات هەنگاو هەڵگرن بەمەبەستی ناساندنی مەسەلەی کورد بە بیروڕای گشتی جیهان و دیفاع لە مافەکانی کورد لەکۆڕ و کۆمەڵە دەوڵەتی و نێونەتەوەییەکان دا.

٦- بۆ پتەوترکردنی ریزەکانی خەباتی گەلی کورد و گەیشتن بە ئامانجە نەتەوایەتییەکانمان لە کوردستانی ئێران دا پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی بەپێویست دەزانین.

٧- سیاسەتی تا ئێستای حیزب لە پێوەندی دەگەڵ فراکسیۆن تەئیید دەکرێ. پێویستە کومیتەی ناوەندی داهاتوو هەوڵی زیاتر بۆ چارەسەری ناکۆکی نێوانمان بدا.

٨- کومیتەی ناوەندی پێویستە بۆ باشترکردن و رێک و پێکتر بەرێوەبردنی کاری دیپلۆماتیک بەمەبەستی ناساندنی خەباتی رەوای گەلەکەمان و وەدەستهێنانی پشتیوانی زیاتر بۆ پتەوکردنی پێوەندییە دیپلۆماتییەکانی حیزب بەرنامەیەکی درێژ

ماوەی هەبێ و هێزی زیاتری بۆ تەرخان بکا.
٩- بە لەبەرچاوگرتنی توسووڵ و پرەنسیپەکانی حیزبی بۆ قازانج و بەرژەوەندی گەلی کورد ناڵوگۆڕە سیاسییەکانی جیهان و ناوچەیی لەبەرچاوبگیرێ و لەم ناڵوگۆڕانە کەڵکی پێویست وەربگیرێ.
١٠- کومیتەی ناوەندی هەوڵ بدا بۆ نێزیکبوونەوەی زیاتر لە ڕێکخراو و کەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکانی کوردستانی ئێران بۆ یەکخستنی ریزەکان، بۆ ئەو مەبەستە کومیتەی ناوەندی دەستی ئاوەڵا دەبێ بۆ شێوەی یەکگرتن و دیاریکردنی بەرپرسایەتییەکان.
١١-داڕشتنی گەڵاڵەی نوێ بۆ سازماندانی پێشمەرگە بۆ خەباتێکی گونجاو لەگەل و مەرجی نوێی ئەمڕۆی کوردستان و دابینکردنی پێداویستییە زەرووریيەکان بۆ ئەم مەبەستە.
١٢- هەوڵدان بۆ بەهێزکردنی کەرسەی تەبلیغی و سیستماتیک کردنی شێوەی تەبلیغ بەتایبەت بە نیسبەت دروشمی نوێی پەسند کراوی کۆنگرەی دەهەم.
١٣- بۆ پێگەیاندنی فکری و سازمانی کادر و پێشمەرگەکانی حیزب و ئامادەکردنیان بۆ وەئەستۆگرتنی ئەرکی حیزبی لە قۆناخە نوێیەکانی خەبات دا و بۆ ئەم مەبەستە بەرنامەی ئاموزشی پێویست دیاری بکرێ.
١٤- کۆنگرە داوا لە رێبەری داهاتوو دەکا کە بۆ بەشداری کردنی هەرچی زیاتری ژنان لە جولانەوەی گەلی کورد دا هەولی پێویست بدا.
١٥- بۆ شکڵ پێدان و ئاکتیوکردنی تەشکیلاتی دەرەوەی وڵات کومیتەیەکی دیاریکراو هەبێ و بۆ کاروباری تەشکیلاتی سەر بە کۆمیسیۆنی تەشکیلات و بۆ کاری دیپلۆماتیک لەبەرامبەری کۆمیسیۆنی پێوەندییەکاندا وەڵامدەر بێ.
١٦- کۆنگرە لەسەر شێوەکانی خەباتی دیپلۆماسی، جەماوەری و چەکداری هەروەک رابردوو پێ دادەگرێتەوە.

لەکۆنگرەی دەهەم دا هەرچەند بەداخەوە بەشێکی لەو کاتەدا بەرێوەچوو کەشەڕی براکوژی لە قەڵادزێ را دەستی پێکرد و بەرەو رانیە هاتبوو، پەلاماردان بۆ سەر بنکەکانی پارتی لە رانیەش دەستی پێکردبوو و تەقەی ورد هیچ، دەنگی خومپارە و چەکی نیوە قورس گوێی خەڵکی شاری کەڕ دەکرد و هەوڵدانی زۆری بەرپرسانی حیزبی ئێمەش بۆ تەواوبوونی شەڕ بەناکام نەگەیشت، بەڵام دیسانیش کۆنگرە پاش چەند سەعات تەعتیل

کردن دەستی بە درێژەدانی کۆبوونەوەکانی کردەوە و ئاخرین بەشی بەرنامەی کۆنگرەشی کە بریتی لە هەڵبـژاردنی ئەندامـانی رێبـەری بوو بەڕێوەبرد و ئەو پازدە کەسـەی ژێرەوەی بۆ کومیتەی ناوەندی و چوار کەسیشی وەک جێگری کومیتەی ناوەندی هەڵبژارد:

| | | |
|---|---|---|
| ١- فەیسەڵ ایراندۆست. | ٢- فەتاح کاویان. | ٣- هاشم کەریمی. |
| ٤- حەسەن رستگار. | ٥- حوسێن مەددەنی. | ٦- جەلیل گادانی. |
| ٧- نەبی قادری. | ٨- عوسمان رەحیمی. | ٩- کەمال کەریمی. |
| ١٠- سەعید بێگزادە. | ١١- ئەبوبەکر راد. | ١٢- مەلا خدر دۆلەگەرمی. |
| ١٣- خالید حەسەن پور. | ١٤- سەرهەنگ قادری. | ١٥- هاشم روستەمی |

**ئەندامانی جێگریش:**

١- سەید برایم کەریمی. ٢- سیروان حەفیدی.

٣- مامۆستا بێیەش. ٤- محەممەد ئەمین رەشیدی

پێویستە بگوترێ سەرەڕای ئەوەی چەند نەفەر لەو کەسانەی هەڵبژێردرابوون یا وەک نوێنەر لە دەرەوە را هاتبـوونەوە بۆ کـۆنگرە یا خـۆیان رایانگەیاند کـە دەچنە دەرەوە یا ناتوانن بۆ هەمیشـە لە کـوردسـتـان بمێنن، لە پێوەندی دەگەڵ بایەخ دانان بۆ کاری دەرەوە قسەکەیان لێ بیسـترا و هەڵیـان بژاردن. بە خۆشییەوە ئێستـاش لە ریزی پێشەوەی تێکۆشەرانی حیزب لە هەندەرانن.

دوای تەواوبوونی کـاری کـۆنگرەی دەهەم یەکـەمین پلینۆمی کـومیـتـەی ناوەندی هەڵبژێراوی کۆنگرەی دەهەم رۆژی ١٧ی بانەمەڕ دەستی پێکرد کە لەودا جەلیل گادانی بۆ سێیەمین جار بێ نێوبڕ و بەزۆربەی نێزیک بەتەواوی دەنگەکانەوە بە سکرتێری حیزب هەڵبژێردرایەوە و کاک حەسەن رەستگاریش بۆوە جێگری سکرتێر.

هەروەک لە پێشـەوە ئاماژەی پێکرا رۆژی یازدەی بانەمەڕ واتە رۆژی دەست پێکردنی کاری کۆنگرەی دەهەمی حیزب شەڕی براکوژی لە نێوان دوو هێزی سەرەکی کوردستـانی عێراق، یەکیەتیی نیشتـمانی کوردسـتان و پارتی دیموکراتی کوردستـان - یەکگرتوو لە قەلادزێ را دەستی پێکرد و ئەم شەڕە خۆ کوژییە لەگەڵ ئەوەی کە بەداخەوە رەوتی جێگیر

بوونی دیموکراسی لەم بەشە لە خاکی کوردستان کە دەرفەتێکی زێڕینی مێژوویی بۆ رەخسابوو وەدوا خست و بووە هۆی کوشت و کوشتارێکی بەرچاو و گرانی و قەیرانێکی زۆر لە هەرێمی کوردستانی عێراق دا. لەگەڵ ئەوەش دوژمنانی نەتەوەکەمان بەگشتی و رێژیمی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامی بە دەستێکی ناوالە ترەوە کەوتنە دەستتێوەردان لە کار و باری نێوخۆی کوردستانی عیراق. کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی لەم هەلە کە بۆیان رەخسابوو بۆ جێبەجێ کردنی پیلانەکانیان دژ بەنەتەوەکەمان بەگشتی و بزووتنەوەی عادیلانەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بەتایبەتی ئەوەستا و بە سازکردنی تۆڕ و رایلەکەی جاسووسی و تیرۆریستی، بەدەیان کردەوەی تیرۆریستیان خولقاندووە و بە دەیان کادر و پێشمەرگە و تێکۆشەری سیاسی هێز و رێکخراوە سەرانسەری و کوردستانییەکان بوونە قوربانی ئەم پیلانانە.[٢]

ئەم شەڕە دوای چەند مانگ بەهەوڵ و تێکۆشانی حیزب و رێکخراو و کەسایەتییە دڵسۆزەکانی نەتەوەکەمان کە بێ شک حیزبی ئێمە بەشێکی بەرچاوی لەم هەولانەدا هەبووە[*] کۆتایی پێهات و پرۆژەی ئاشتی و پێکەوە ژیانی برایانەی تا ساڵی ٢٠٠٠ لە پەرلەمانی کوردستان لە نێوان ئەودوو هێزە سەرەکییەدا مۆرکرا و بوو بەهۆی خۆشحاڵی گەلی کورد بەتێکڕا. بەڵام بەداخەوە ناحەزانی نەتەوەی کورد و دوژمنانی گەلەکەمان لە ناوخۆ و دەوروبەر بە هەموو شێوەیەک بۆ تێکدانی وەزعەکە لە هەوڵدابوون و گەیاندیانە ئەو جێگایە کە خولێکی تازەی شەڕی براکوژی لە نێوان ئەو دوو هێزە دەست پێ بکاتەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا و خوێنێکی زۆر لە بەینیاندا رژا و بە سەدان رۆڵەی کورد لەم بەینەدا گیانیان لەدەست دا. تەنانەت خەڵکی بێ چەک و ماڵ و منداڵیش زۆر لە ناوچوون.

کۆماری ئیسلامی لەو دەرفەتە کەڵکی خۆی وەرگرت و بەبەستنی سنوورەکان و بڕینی رێگەی هاتوچۆ و پێشگیری لە هێنانی خواردەمەنی و کەلوپەلی پێویست کرد و بەدەیان شێوەی دیکە زەختی هێناوەتە سەر هێزەکانی دەسەڵاتدار لە هەرێمی کوردستان تا بەم شێوەیە رێگەی چالاکی سیاسی، ئیزامی و تەبلیغی هێزەکانی نەیاری خۆی بە دەستی ئەوان واتە براکوردەکانمان بەربەست بکات. رێژیم لەم بوارەش دا توانی بەمەبەست بگا و سەرەڕای بەستنی رێگەی هاتوچۆی کادر و پێشمەرگەکانی هێزە سیاسییەکانی

---

٢- حیزبی ئێمە هەوڵی زۆری بۆ ئاشتی دا و بۆ ئەم مەبەستە گەلالەیەکی پێشکەش بە هەردوولاکرد. بەیاننامەیەکیشی لەسەر تۆببارانی قەلادزێ لەلایەن رژێمی ئێرانەوە بلاوکردەوە و مەحکوومی کرد کە لە ئاخری پەرتووکەکە دادێ. هەروەها لەم بابەتەوە نامە بۆ حیزبەکان نووسرا .

کوردستانی ئێران بەدەستی برا کوردەکانی عێراق، هەردوو رادیۆی ئێمە و بەشەکەی دیکەی حیزب داخران و بۆ ماوەیەکی درێژ چالاکییان نەما. دواتر هی بەشەکەی دیکە دوور لە شوێنی دەسەلاتی حکوومەتەکانی هەرێم وەگەڕ کەوتەوە.[٣] بە پێچەوانەی بەڵێنێک کە لەلایەن یەکیەتییەوە بە ئێمە درابوو " دوای بەستنی رادیۆکان تیرۆر نامێنێ و دەستی تیرۆریستان بەسترێ" بەداخەوە رۆژ بەرۆژ دەستی دوژمن ئاوالەتر و دەستی ئێمە توندتر بەسترا و کۆسپی زیاترمان بۆ دانرا. تیرۆریزم زیاتری پەرەساند و ژمارێکی زۆر لە کادر و پێشمەرگەی حیزب تیرۆر و شەهید کران. لەلاپەڕەکانی ئاخری ئەم پەرتووکەدا سەرنجتان بۆ لیستەی ئەو کارە تیرۆریستیانەی رێژیم رادەکێشین کە ژمارەی زیانە ئینسانییەکان بە تێکڕا لە دووسەد کەس زیاترە و هەرکام لەوان لە شوێنێک و لە شار و دیارێکی کوردستانی عێراق بە تاوانی کوردبوون و سەر دانەنواندن بۆ دوژمن بەدەستی بەکرێگیراوان و تاقمە کوردێکی خۆفرۆش شەهید کراون.

گومان لەوەدا نییە کە ئەم کارە خراپانەی هێزەکان و ئەو جینایەتانەی بەکرێگیراوان کردوویانە هەر لە هەل و مەرجێکی ئالۆز و نەبوونی ئەمنییەت و دەسەلاتێکی بەهێز و چاوپۆشی کردن لە تاوانەکانی مۆرە تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی دا دەلوێ.

بە دوای پلینۆمی یەکەم دا کار و تێکۆشان بە شێوەیەکی بەرچاوتر لەجاران دەستی پێکردەوە. هەست بە بەرپرسایەتی لە هەموو هاوڕێیان دا بەهێزتر بوو، بەپێی بەرنامەی داڕێژراو خەریکی کار و تێکۆشان بوون.

یەکێک لە کارە هەرە باشەکانی حیزب ئەوەبوو کە بەڕێوەبردنی کار و باری ئەورووپا بە کومیتەیەکی سێ کەسی لە ئەندامانی رێبەری ئەسپێردرا.

هاوڕێی بەڕێز و تێکۆشەر ئەمر کاک (ئەبی قادری) بوو بە بەرپرسی ئەم کومیتە کە لە عەینی کات دا قسە بێژی حیزبیش بوو. هاوڕێیان "کاک سەعید بێگزادە و کاک حەمەدەمین رەشیدی"ش وەک ئەندامی کومیتەی ئەورووپا دیاریکران و هەرکام بەرپرسایەتییەکیان قەبووڵ کرد. دامەزرانی ئەم کۆمیتە و بوونی ئەندامانی رێبەری لەو کومیتەدا شوێنی زۆر باشی لەسەر بەرەوپێش بردنی کاروباری رێکخراوەیی و پێوەندییەکانمان دانا. جێگەی خۆیەتی لێرەدا جارێکی دیکەش سپاسی زەحمەتەکانی

---

٣- هەر لەدوای هەڵگیرسانەوەی شەڕی براکوژی ، بەداخەوە کوردستانی باشوور بوو بە دوو بەشی جیاواز و هەرکام شەرعیەتی خۆیان بەڕەوا دەزانی . بە واتایەکیتر ئەگەر تا دوێنێ دوژمنان نیشتمانەکەمانیان بەش بەش دەکرد ، ئێستا کورد بە دەستی خۆی دابڕ دابڕی کردووە .

کاک نەبی بکەین کە نە تەنیا بە تێکۆشانی بێ وچانی خۆی هەوڵی هەرچی زیاتر پەرەپێدانی کاری تەشکیلاتی و پێوەندی دەدا، بەڵکو لەباری ماددیشەوە بە مانای راستی وشە لەخۆی مایە دادەنا.

زۆر بەداخەوە کاک نەبی لە رێکەوتی ۱۳۷۵/۹/۱۲ بەهۆی نەخۆشییەکی بێ عیلاج لە وڵاتی دانمارک فەوتی کرد و لە نێو کوڕ و هەستی پڕ لە سۆزی خزمان و هاوڕێیان لە گۆڕستانی کۆپنهاگ دا بە رێوڕەسمێکی حیزبییانە بەخاک سپێردرا.

پلینۆمی دووهەم لە مانگی بەفرانباری ۱۳۷۳ پێکهات و هێندێک بڕیاری گرینگ دران کە پێویستە ئاماژەیان پێ بکرێ، کردەوەی نادروستی لایەنی دیکە نابێ ببێتە هۆی ئەوە کە حاکمیەتی دەوڵەتی هەرێمی کوردستان خەوش دار کەین.

چونکو موجاهیدین دوای گۆڕانی دروشمی ستراتیژی حیزب دۆستایەتی خۆیان دەگەڵ ئێمەش لە پێدا و پێیان وابوو بە تەواوی وازمان لە خودموختاری هێناوە. پێویست بوو لەم بوارەدا وەڵامێک بدرێتەوە و لە عەینی کاتدا هەوڵ بدرێ دۆستایەتییەکە بە هێز کەینەوە. بۆیە پلینۆم لەسەر ئەم رەفتارە قەراری دا پێیان بگوترێ. ئێمە رێزی تایبەتیمان بۆ پاراستنی دۆستایەتی دەگەڵ موجاهیدین هەیە، بەڵام لە هەڵبژاردنی ستراتیژی خۆمان دا سەربەستین و رێز لە بڕیارەکانی کۆنگرەی حیزبی خۆمان دەگرین... هەروەها بە پێویست زاندرا کە بەم شێوە بۆیان تەوزیح بدرێ:[٤]

"حیزبی ئێمە خودموختاری بە شێوەیەک لە شێوەکانی مافی دیاریکردنی چارەنووس دەزانێ و لە نێوان ئەو دوو مەقوولەیەدا ناکۆکی نابینێ و هەروەها رێکخراوی موجاهیدین وەک رێکوپێکترین و بەهێزترین هێزی ئۆپۆزیسیۆن دەناسێ".

چونکو رێژیم جارجار لەرێگای جۆراوجۆرەوە داوای وتوویژی دەکرد و ئەو مەسەلە پێویستی بە باسێکی تازە هەبوو کە لە پلینۆم دا بە تێر و تەسەلی قسەی لەسەر کرا و لە ئاکام دا حیزبمان بەم شێوەیەی قەراری دا: "کۆماری ئیسلامی ئێران هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەلای موسبەت دا تێدا پێک نەهاتووە، بگرە زۆریش زیاتر لە پێشوو دیاردەی مەنفی تێدا پێکهاتووە. بۆیە هەر چەشنە وتوویژێک دەگەڵ ئەم رێژیمە بێجگە لەزەرەر و زیانی

---

٤- ئێمە بناخەی دۆستایەتیمان لەسەر بڕوابوونی ئەوان بەو گەڵاڵەی دوازدە ماددەیی خودموختاری دانابوو کە کاتی خۆی کە حیزب ئەندامی شووڕای بەرگری میللی بووە دەگەڵی ئیمزا کردبوون و تا ئێستاش بەم گەڵاڵە وەفادارن.

سیاسی هیچ ناکامیێکی نابێ. ئەوەی حیزبێکی دیکە تەجرەبەی کردووە و ئەتیجەکەشی دیوە، با ئێمە تەجرەبەی نەکەینەوە".

بە لەبەر چاوگرتنی رادەی هەوڵدان بۆ تیرۆر و پیلانگێران بەچەشنی جۆراوجۆر لەلایەن رێژیمی کۆماری ئیسلامییەوە پلینۆم لەسەر ئەوە ساغ بۆوە بەشێک لە کۆمیسیۆنی تەشکیلات دا پێکبێ بەناوی"بەشی زانیاری و پارێزگاری" کورتییەکەی "زاپا" بوو. بەلام بۆ ئەوەی لە ئەرکی خۆی لانەدا دوو خالّی خستە ناو بەرنامەکە:

ئەلف: ئەم بەشە تەنیا بۆ پووچەل کردنەوەی پیلانەکانی دوژمنانی حیزب، بەتایبەت رێژیمی کۆماری ئیسلامی و دیتنەوەیان و ئیقدامی پێویست لە دژی عەوامیلی نفوزی سەر بە هەر لایەنێکی دوژمنکار، یان نەیار، پێک دێ.

ب: ئەم بەشە دەبێ لەهەر چەشنە چالاکییەک کە ببێتە هۆی بەرتەسک بوونەوە، یان لەنێوچوونی ماف و ئازادییە دێموکراتیکەکان لەنێو خۆی حیزب دا، خۆ بپارێزێ.

ئەو بەشە لە ماوەیەکی کورت دا توانی گەلێک لە پیلانەکانی رێژیم ئاشکرا و پووچەل کاتەوە و زۆر لە مۆرەکانیان بناسێ.

لەم پلینۆمەدا بەدوای تێپەڕبوونی شەش مانگ لە کۆنگرەی دە، هەلسەنگاندنێک لەسەر تێکۆشانی کۆمیسیۆنەکان کرا و راپۆرتی کاردکانیانی بە وردی خستە بەرچاو. بە خۆشییەوە کاری هەموو ئۆرگانەکان سەرەڕای کەموکووڕی ئیمکانات جێگەی رەزامەندی بوو و سەرکەوتوو لەقەلەم دران.

هەر لەم پلینۆمەدا سێ کەس لە کادرە لێوەشاوەکانی حیزب، کاک سەید عەبدالله حوسێنی، کاک خالید وەنەوشە، کاک خدر محەممەد پور بە ئەندامی مشاوری کومیتەی ناوەندی هەلبژێران و بەرپرسایەتی ناوەندی ۱ و ۲ یان بە تەرتیب خرایە ئەستۆ.

بەگشتی لەماوەی چەند سالّی دوای هەلوێستگرتنی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بۆ پێکهێنانی فەزایەکی دێموکراتیک و پێوەندی دۆستانە و هاوکاری بەکردەوەی نێوان هێزە سیاسی یەکانی بەشدار لە بزووتنەوەی سەرانسەری ئێران و بە تایبەت نێوان هێزە کوردستانییەکان، حیزبی ئێمە ئەوەی لە توانایدا بووە ئەنجامی داوە.

رێبەرایەتی حیزب بۆ جێ بەجێ کردنی بڕیار و راسپاردەکانی کۆنفرانس و کۆنگرەکانی حیزبی لەم پێوەندییەدا سیاسەتێکی هەمیشەیی و ئەگۆڕی سەرکەوتوانەی بردۆتە پێش. پێکهێنانی دۆستایەتی و پتەوتر کردنی پێوەندی دۆستانە لەگەل حیزب و رێکخراوە

سیاسییەکان چ لە رادەی سەرانسەری ئێران و چ لە رادەی هەموو پارچەکانی کوردستان، ناکامی بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتە نوسوولییە بووە. لەم چوارچێوەیەدا سەرەڕای هەڵوێستی دوژمنانە و سیاسەتی بایکۆت کردن و شەڕ پێ فرۆشتن و هەوڵدان بۆ پێشگیری کردن لە چالاکی هێزەکانی ئێمە لەلایەن ئەو بەشەی دیکەی حیزب، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بەمەحکووم کردنی شەڕی براکوژی و ئەم چەشنە هەڵوێستانە، لە هەموو ئیمکاناتی خۆی کەڵکی وەرگرتووە.

لەم بوارەدا و بۆ ئەوەی ئەم سیاسەتە ببێتە سیاسەتێکی سەقامگرتوو لەنێو ریزەکانی حیزب دا، بارهێنان کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، وەک ئەرکێکی جیددی و شۆڕشگێڕانە سەیری کراوە و جێبەجێ بووە.

هەروەها حیزب بەمەبەستی لابردنی ئاڵۆزی نێوان هەردوو بەشی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و پێکهێنانی دۆستایەتی و هاوکاری بەکردەوە و تەنانەت یەکگرتنەوەش، لەهەوڵی دۆستانەی گشت رێکخراو و حیزب و کەسایەتییە سیاسییەکان و خەڵکی دڵسۆز پێشوازی کردووە. لە ناکامی ئەم هەوڵ و تێکۆشانە بەرچاوەی حیزبمان و تا رادەیەکیش دەرکی راستییەکان و پێویستییەکانی ئەمڕۆی بزووتنەوەی گەلەکەمان لەلایەن ڕێبەرایەتی ئەوانەوە بوو کە ئەو بەشەی دیکەی حیزب لە کۆنگرەی دەهەمی خۆیان کە لەسەرەتای بەهاری ١٣٧٤دا بەڕێوەچوو، لە ئەنجامەی فشاری بەشی زۆری نوێنەرەکان کە لە پێویستی ئەم مەسەلە حاڵی ببوون، بڕیاری کۆتایی هێنان بە بایکۆت و کردنەوەی دەرکەی وتووێژ پەسندکرا. ئەوە هەنگاوێکی زۆر باش بوو کە لەوەڵامی هەوڵی بەردەوامی ئێمەدا هەڵیان هێناوە.

حیزبی ئێمە کە هەر لە سەرەتاوە هەوڵی چارسەری سیاسییانەی کێشەکەی دەدا، ئەم بڕیارەی کۆنگرەی دەهەمی باڵەکەی دیکەی حیزبی بەدەرفەت زانی و دەست بەجێ لەلایەن دەفتەری سیاسییەوە پێشنیاری دانیشتنی راستەوخۆیان دەگەڵ مەتردح کرا، بەخۆشییەوە وەڵامەکە موسبەت بوو. سەرەنجام لە رۆژی ٢١ی بانەمەڕی ساڵی ١٣٧٤ لە سکرتاریای ئەوان لە نێزیک کۆیە چاومان بەیەکتر کەوت.

کۆڕی حیزبی دێموکرات، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بریتی بوو لە سکرتێر و جێگری سکرتێر و هێندێک لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی. لەبەشەکەی

دیکەش هەر تەرکیبێکی ئاوا لە دانیشتنەکەدا ئامادەبوون.
بەدوای ئەو چاو پێکەوتنەدا پلینۆمی سێهەم لە رێکەوتی ٢ /٣/ ٧٤ پێکهات کە زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی رێبەرایەتی تێدا بەشداربوون.
لەم کۆبوونەوەدا تەحلیلێکی سیاسی لەلایەن دەفتەری سیاسییەوە پێشکەش کرا کە زۆر بەکورتی مەتلەبەکان ئەمانەبوون:
ئەلف: ئێران لە قەیرانێکی قووڵ و پەرەگرتووی ئابووری و سیاسی دا دەژی، تەحریمی هەموو لایەنەی ئەمریکا بەهۆی پشتگیری و دەست تێوەردانی کۆماری ئیسلامی لە تیرۆریزمی جیهانی و هەوڵدانی بۆ بەرهەم هێنانی چەکی ئەتۆمی، ئەو قەیرانە ئابوورییە توند و تیژتر دەکا و دەبێتە هۆی فشارێکی زۆری سیاسی لەدەرەوەڕا بۆ سەر کۆماری ئیسلامی، هەروەها دەبێتە هۆی تەریک کەوتنەوەی زیاتری رێژم لە کۆمەڵگەی نێونەتەوەییدا.
ئەمریکا لە خەلیج دا دەستی بالای هەیە و وێدەچێ، ئەورووپا و ژاپۆن وەدووی سیاسەتەکانی کەون و، لەحالی حازردا، کە ئەمریکا دەستی لە هەموو قازانجێکی ئابووری لە ئێران دا هەڵگرتووە، دەستی ئاواڵەترە بۆ راکێشانی سەرنجی ولاتانی سەنعەتی گرووهی(٧).
سەرجەمی ئەو فشارە ئابووری و سیاسییانەی دەرەوە دەبێتە هۆی زیاتر بوونی ناڕەزایی نێوخۆیی و وەپێش خستنی رووخانی رێژیم، یان ئاڵ و گۆڕە ئیحتیمالییەکانی دیکە.
ب: کوردستان، مەسەلەی کورد زیاتر لەهەموو کاتێک لەنێو کۆڕ و کۆمەڵی نێونەتەوەیی دا دەنگی داوەتەوە و جێی خۆی کردۆتەوە و لەزۆر شوێن پشتیوانی نیودەرسمی دەوڵەتانی لە پشتە.
بەهۆی مەوقعیەتێکی تایبەتی کە تورکیا دەگەڵ ئەورووپا هەیەتی و بەهۆی خەباتی لێبڕاوانەی خەڵکی باکوور، مەسەلەی کورد لەو بەشە لە کوردستان زەقتر بۆتەوە. زۆر وێدەچێ چارەسەریی مەسەلەی کورد لەو بەشەدا پێش پارچەکانی دیکەی کوردستان بکەوێ.
دیارە لە ئێران بەهۆی هەبوونی چەند نەتەوە و نەبوونی هاوفکری و هاوخەباتی نێوانیان لەلایەک و مەتردح نەبوونی کێشەی کوردی کوردستانی ئێران لە رادەی

نێونەتەوەییدا وەک پێویست لەلایەکی دیکەوە، چارەسەری ئەم مەسەلە کەوتۆتە پاش مەسەلەی کوردستانی تورکیا و عێراق، مەگەر ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو بێتەپێش.

وەزعی کوردستانی عێراقیش بەستراوەتەوە بە ڕادەی تەباوڕەبا بوونی ئەو گەورە هێزانەی حاکمیەتیان هەیە. چونکو دەگەڵ ئەوەیدا کە شانسێکی گەورە ڕووی تێکردوون، دەوڵەتانی خاوەن دەسەڵات بەبێ بوونی ئەمنییەت و تەبایی ئامادەنین خۆیان ئەوەندە لە مەسەلەکە وەردەن و بچنە پێش تا ئەو مەسەلەحەتەی ئێستا لەم چوار وڵاتەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە هەیانە بیهاوێنە مەترسییەوە. بەتایبەتی کە هەر چوار دەوڵەت لەسەر هەموو مەسەلەیەک ناکۆک بن لەسەر مەسەلەی کورد و پێشگیری لە گەیشتن بە مافی ڕەوای یەک بۆچوونیان هەیە.

ئەندامانی پلینۆم ڕاپۆرتە سیاسییەکەیان پەسندکرد و هەروەها لە پێناو ئاشتی و یەکگرتنەوەدا ڕەوشی ڕابردوویان تەئیید کردەوە. لەلایەک بڕیاری بەشەکەی دیکەی حیزبیان لە کۆنگرەی دەهەمیان دا لەمەڕ هەڵگرتنی بایکۆت و کردنەوەی دەرکەی وتووێژ بە هەنگاوێکی موسبەت ئەرخاند، لەلایەکی دیکەشەوە چاوپێکەوتنی دوو هەیئەتی ڕێبەری دوو بەشی حیزبیان لەڕۆژی ٢١ی ڕەشەمەی ١٣٧٤ بە زۆربەی دەنگ بەکارێکی باش و ڕێ خۆشکەری ئاشتی ئەرخاند.

هەر لەم بوارەدا بە درێژی قسەکرا و لەلایەن ئێمەوە بڕیار درا:

ئەلف: دانیشتنەکان ڕەسمییەت پێ بدرێن.

ب: جەلبی ئیعتمادی یەکتر بکەین.

ج: ئیعتراف بە یەکتر بکەین.

د: بە مافی بەرانبەرەوە دابنیشین تا یەکێک لەم سێ مەبەستەی خوارەوە سەربگرێ:

١- یەکگرتنەوە وەک دوو باڵی حیزب. ٢- یەکگرتن وەک دوو حیزب.

٣- وەک دوو حیزب بەیەکەوە هاوکاری بکەین.

هەر لەم پلینۆمەدا هەیئەتێک کە بریتی بوون لە (١. کاک حەسەن ڕستگار. ٢. کاک حوسێن مەددەنی. ٣. کاک کەماڵ کەریمی و ئەندامی ئیحتیاتی هەیئەت کاک عوسمان ڕەحیمی) پێکهات، تا بەتایبەتی لەسەر ئەم مەسەلانە دەگەڵ بەشەکەی دیکەی حیزب قسە بکا. دیارە ئەرک و چوارچێوەیەکیشی بۆ دیاریکرا. یەک لەو مەرجانە ئەوەبوو دوای هەموو دانیشتنێک ئاکامی کارەکە بدەنەوە بەدەفتەری سیاسی.

هەر لەم پلینۆمەدا هاوڕێیان کاک قاسم قازی، کاک صالح خضر پور (رەبەتی)، کاک ناصر پیرانی و کاک جەعفەر مەنگوڕی بە مشاویری کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردران.

ڕۆژی ١٩ی جۆزەردانی ١٣٧٤ سکرتێری بەشەکەی دیکەی حیزب مامۆستا عبداللە حەسەن زادە و چەند ئەندامی دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی بۆ چاوپێکەوتنی هاوڕێیانی ڕێبەریی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ هاتنە "قەڵا سەیدە" هەڵکەوتوو لە دۆڵی شاوڕێی دەوروبەری ڕانیە کە بنکەی دەفتەری سیاسی حیزبمانی لێ بوو.

# بەشی شەشەم

دوابەدوای ئەو چاوپێکەوتننانە، رادەی کارە تێرۆریستییەکانی رێژیم چوونەسەرێ و هەوڵیاندا بەهەر شێوەیەک کە بۆیان بلوێ نەهێڵن رەوتی پتەوترکردنی دۆستایەتی و سەرەنجام یەکگرتنەوەی هەردوو بەشی حیزب بچێتە پێش و بە ئەنجام بگا.

کاری لێک نیزیکبوونەوە و تەفاهوم گەیشتبووە جێگایەک کە لە هەردوو بەشی حیزب وەک لە پێشدا ئاماژەمان پێ کرد هەیئەت بۆ بردنە پێشی وتووێژەکان دیاری کرابوو.

رۆژی چوارشەممە رێکەتی ٧٤/٨/٢٤ پلینۆمی چوارەمی کومیتەی ناوەندی پێکهات و لەو پلینۆمەدا ناڵ و گۆڕێک بەسەر هەیئەت دا هات و دوو کەس کە بریتی بوون لە کاک حوسێن مەددنی و کاک کەماڵ کەریمی مانەوە، بەڵام لە جێگەی کاک حەسەن رەستگار کە قەراربوو بۆ سەردانی بنەماڵەکەی بچێتە دەرەوە کاک فەتاح کاویان دیاریکرا. هەر لەو پلینۆمەدا باسی گرینگی کارەکە کرایەوە، هەربۆیەش جارێکی دی لەسەر پێویستی بردنە پێشی پرۆسەی ئاشتی و یەکگرتنەوە تەئکید کرایەوە.

هەر لە پلینۆمی چوارەم ووای کورتە باسێک لەسەر پێشنیاری نووسەری ئەم دێڕانە وەک سکرتێری حیزب بۆ دڵنیاکردنی لایەنی دیکە قەرارمان دابوو کە هەموو ئەندامانی رێبەری حیزبمان ئامادەن لە کاتی یەکگرتنەوەدا هەتا گرتنی کۆنگرە واز لەهەر چەشنە بەرپرسایەتییەکی مستەوای رێبەری بێنین و وەک کادر کاربکەین تا بەرپرسانی بەشەکەی دیکەی حیزب بە تایبەتی و گەلی کورد بە تێکڕا دڵنیا کەین کە ئێمە وەدوای پلە و پایە و ئیمتیاز نەکەوتووین و سەرکەوتنی حیزب و گەلەکەمان لە چوارچێوەی دێموکراسی ناوەکی و دەرەکی دا ئامانجمانە. رەنگە ئەو فیداکارییەی هاورێیانی ئێمە کردیان لە مێژووی حیزبەکان و خەباتی گەلی کورددا بێ وێنەبێ. هەر ئەو بڕیارە تەفاهومێکی زیاتری لە نێوانمان دا پێک هێنا و شانازییەکەشی لەروانگەی مرۆڤی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو هەموو کات بۆمان دەمێنێتەوە.

ئاخـر لەزۆربەی هەرەزۆری ئەو پەیامانەی بە بۆنەی کۆنگرەی دەهەم و هەروەها بۆ

پیرۆزبایی جیژنی پەنجا ساڵەی دامەزرانی حیزب کە بە شکۆی تایبەت لە "قەڵا سەیدە"ی شوێنی دەفتەری سیاسی بەڕێوەچوو و زۆربەی هەرە زۆری حیزبە کوردستانی و ئێرانییەکان، ئەدیب و هونەرمەندان و کەسایەتییە ناودارەکان بەشداریان تێدا کردبوو و هاتبوون ئەو داخوازەیان تێدا بوو.

جگە لە داخوازی خەڵکی وڵاتی خۆمان کە هەر ڕۆژە بە شێوەیەک وەڵامیان بۆ هەردوولا دەنارد کە پرۆسە بە ئاخر بگا و یەکگرتنەوەکە جێبەجێ بێ و لە یەکگرتنەوە زۆر بەپەلە بوون. دڵسۆزان لە کوردستانی عیراقیش زۆر جار دەهاتن و تەئکیدیان لەسەر یەکگرتنەوە دەکرد.

لە ڕێکەوتی ۱۹۹٤/٤/۲۰ یش (٤۲) کەس لە نووسەران، ئەدیبان و شاعیرانی کوردستانی عیراقێ کە زۆر جار لە تاقمی گچکەتردا بۆ ئەم مەبەستە سەریان لەهەردوولا دابوو مەتنێکی جوانیان ئیمزاکردبوو و ناردبوویان، لەودا داوایان دەکرد کە بۆ خاتری گۆڕی شەهیدان و قارەمانانی گیانفیدای کورد و ڕێبەرانی ڕابردوو و، لە ڕێگەی کورد و کوردستان دا یەک بگرنەوە. بۆ دڵنیایی خوێنەران و ڕێزگرتن لە داواکارەکان دەقی مەتنەکەی بە ناوی خاوەن ئیمزاکانەوە لە ئاخری کتێبەکەدا دێنین.

هەروەها جەماعەتێکی زۆر لە کوردانی ئێرانی دانیشتووی شارەکانی سلێمانی، هەولێر، ڕانیە و قەڵادزێ چەندجار ئیمزایان کۆکردبۆوە و ئەو داخوازەیان لە ئێمە هەبوو کە هەرچی زووتر یەک بگرنەوە.

لەو هەلومەرجەدا کە وتوویژمان بۆ یەک گرتنەوە گەرم بوو، هێندێک کەس لە کادر و پێشمەرگەکانی باڵەکەی دیکەی حیزب دەهاتنە لای هاوڕێیانی ئێمە و حەزیان دەکرد بێنە لای ئێمە و درێژە بە خەباتی خۆیان بدەن، بەڵام ئێمە دەمانگوت واباشترە هەر لەوێ بمێننەوە و بچن بۆ یەکگرتنەوە هەوڵبدەن، چونکە یەکگرتنەوە داخوازی گەلی کوردە و دەبێ بگاتە ئەنجام.

ڕەوتی کاری حیزبی و ئەرکی ئۆرگانەکان بە شێوەی ئاسایی بەرەو پێش دەچوو. هەیئەتەکانی تایبەتی یەکگرتنەوەش چەندجار چاویان بەیەکتر کەوتبوو. چەند گەڵاڵەش هاتبووە ئاراوە و خراببوونە بەر باس. بەڵام یەک شت زۆر ڕوون و ئاشکرابوو، ئەویش ئەوەبوو کە بەشێکی بەرچاو لەبەشەکەی دیکەی حیزب مەبەستی تێکەڵ بوونەوەی حیزبیان وەک دوو باڵی حیزب لەبەرچاو نەبوو و زووریش موخالیف بوون!! لە حاڵێک دا ئێمە مەسەلەکەمان گەلێک پێ گرینگ بوو.

ئەو دانیشتن و هاتوچۆیانە بە جێگایەک گەیشتن کە ڕۆژێک لەسەر پێشنیاری نووسەری ئەو دێڕانە بڕیار درا جارێک من وەک سکرتێری ئەم بەشەی حیزب لە کۆبوونەوەیەک دا لەسەر وەزعەکە و چلۆنایەتی بۆچوونمان لەمەڕ یەکگرتنەوە،یا هەر شتێکی گونجاوی دی بۆ کادر و پێشمەرگەی ئەوان و ڕۆژێکیش مامۆستا وەک سکرتێری بەشەکەی دیکەی حیزب لەم بابەتەوە بۆ کادر و پێشمەرگەی ئێمە بدوێین.

بەخۆشییەوە ئەو بەرنامەش جێبەجێ بوو، پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٣٧٤/٥/١٠ دەگەڵ کاک سەرهەنگ قادری ئەندامی کومیتەی ناوەندی و کاک قاسم قازی مشاوری کومیتەی ناوەندی چووینە قەڵای ئێزیک کۆیە کە شوێنی کۆمیسیۆنەکان و کۆبوونەوەکانیان بوو. جەماعەتێکی زۆر کادر و پێشمەرگە بانگ کرابوون، قسەکانم لەگەڵ پێشوازییەکی گەرم بەرەوروو بوو. بەگشتی کۆبونەوەیەکی زۆر بەکەڵک و پڕ سوود بوو. بەشێکی بەرچاو لە ڕاستییەکانم بۆ روون کردنەوە، گەلاڵەی چەند ساڵ پێشتری خۆمانمان بۆ شیکردنەوە.

هەروەها مامۆستا لەڕۆژی ١٣٧٤/٥/١٤ تەشریفی هێنا بۆ لای ئێمە و بۆ کادرو پێشمەرگەکان قسەی کرد کە ئەویش سەرەڕای ئەو تانە و توانجانەی کردبوونی بە ئێو ناخن لەسەر یەک بەسوود بوو.

ئەو سەردان و وتووێژانە لە فەزایەکی دۆستانەدا بەڕێوەچوون، ئوقتە گۆڕانێک بوون لە پێوەندی نێوان ئەو دوو حیزبەدا کە لەلایەک ماوەی چەند ساڵ بوو ناتەباییەکانیان بەوپەڕی خۆی گەیشتبوو و لەلایەکی دیکەوە ببوونە هۆی نیگەرانی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و بزووتنەوەی لاواز کردبوو.[1]

ئەم وەزعە تازەی کە پێکهاتبوو لەلایەک بوو بەهۆی خۆشحاڵی و بەرەو سەرچوونی لە ڕادەبەدەری وردی خەڵکی دڵسۆزی کوردستان و هەموو لایەن و کەسایەتییە شۆڕشگێر و ئیشتمانپەروەرەکان و، لەلایەکی دیکەوە وردی هێزەکانی ڕێژیمی دژی گەلی کۆماری ئیسلامی هێنایە خوارێ و ترس و خۆفێکی زۆری لە دڵی کاربەدەستان و بەکرێگیراوانی ڕێژیم پێکهێنابوو. ئەو ترسە گەیشتبووە ڕادەیەک کە کاربەدەستانی ئەمنییەتی و ئیتلاعاتی پەنایان بردبووە بەر هەر چەشنە پیلانگێڕییەک.

---

١- ئەوەی ڕاست بێ، بەشەکەی دیکەی حیزب لەوچەند ساڵەی دەورەی ناکۆکیدا ئەوەندە بە خراپی لەسەر ئێمە دوابوون کە تەوجیە کردن بۆ یەکگرتنەوەیان بۆ سادە نەبوو. لەحاڵێکدا ئەفرادی حیزبی ئێمە بەهۆی ئەوەی هەر لە ڕۆژی هەوەڵی هەڵوێست گرتن را بە شێوەی مەنتقی حاڵی کرابوون ئەو ئیشکالەیان نەبوو.

هەرچەند دوای دەیان جار دانیشتن هێندێک لەو شتانە گۆڕدران و بوون بەو گەڵاڵە کە دوای چەند مانگ وتووێژ لەلایەن هەردوو سکرتێری دووباڵەکەی حیزب مامۆستا حسن زادە و کاک حەسەن رستگاردەوە کە بە چەند هۆیەک چەند مانگ پێش یەکگرتنەوە ببووە سکرتێری رێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ نیمزا کراوە و مەرجەکانی یەکگرتنەوەی تێدایە، دیسانیش زۆر دوور لە رووحی دێموکراسی و برایەتی راستەقینە بوو، بەڵام یەکبوونەوەی حیزب لە روانگەی ئێمەوە بە لەبەرچاوگرتنی داخوازیی کۆمەڵانی خەڵک ئەوەندە گرینگ بوو کە قەبووڵمان کرد.[٢]

سەرەڕای هەموو ئەوانە مەسەلەکە ئەوەندە بەرەو پێش چووبوو کە زۆربەی زۆری خاڵەکانی بەحوکمی بایەخی تایبەتی یەکگرتنەوە قەبووڵ کرابوون، بەڵام مخابن بەبێنێکی زۆر لەسەر هەڵنەگرتنی "گیۆمە"یەک کە لە گەڵاڵەی ئیعلامیەی هاوبەش دا بە دەوری ئێوی حیزبی دێموکرات کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕیان داهێنابوو، یەکگرتنەوەکە دوا کەوت. چونکو مانای ئەو گیومە نەفی حیزبێک بوو کە بۆ هەموو حیزبە ئێرانی و کوردستانییەکان و بەشێکی زۆر لە حیزب و لایەنە خارجییەکان ناسرابوو و هەشت ساڵ بوو تێکۆشانی دیپلۆماسی، تەشکیلاتی، نیزامی و تەبلیغاتی تایبەت بە خۆی هەبوو، کونفرانسی چوار و، دوو کۆنگرەی ٩ و ١٠ی لە درێژەی کۆنفرانس و کۆنگرەکانی پێشووی حیزبیدا بەڕێوەبردبوو، لە نێو کۆڕ و کۆمەڵی کوردستانی و دەرەوە جێگای خۆی کردبۆوە.

بەڵێ گیومەکە ماوەیەکی درێژ کۆسپ بوو و پێشگیری لە جێبەجێ کردنی ئەو کارە گەورە دەکرد، ببوو بە ویردی زبانی کادر و پێشمەرگەی هەردوو باڵی حیزب!.

ئێمە زۆر بە لە سەردخۆیی ئەرکەکانی دیاری کراوی حیزبیمان بەڕێوەدەبرد و لە خزمەت حیزب و گەلەکەمان دابووین. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵە پەسندکراوەی کۆنگرەی ٩ کە لە بڕیارنامەکەی دا هاتبوو، هەوڵمان زۆردا بۆ ئەوەی بەهەر شێوەیەک بێ ئۆرگانیزمێکی نەتەوەیی دەگەڵ حیزبەکانی کوردستانی پێک بێنین کە بتوانێ داخوازییەکانی گەلی کورد بە تێکڕا مەتردح کا و بەگوێی جیهانیانی بگەیەنێ و بگاتە جێگایەک لە رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکانیش دا وەک چاوەدێر ئامادەبێ و راستەوخۆ ویستی گەلی کورد لە هەموو پارچەکان بێنێتە گۆڕێ و مافی رەوای بۆ داوا بکا.

٢- من ئەوە لەلایە، بەڵام چونکو کاتی ئیمزاکردن هەر بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەی لەسەرەوە باسم کرد بڕیاردرا ئەهێنی بمێنێتەوە و تا ئێستاش بڵاونەبۆتەوە دەری ناخەم و چاپی ناکەم.

له ساڵەکانی٦٩ و ٧٠ دا له چەندین شوێن ئەم بۆچوونە لەگەڵ رادیۆکان و هەروەها له کۆنفرانس و چاپەمەنییەکان دا باس کرابوو، له هێندێک له رۆژنامەکانی ئوتریش دا و هەروەها له رادیۆی ئەو وڵاتەشەوە باسی لەسەر کرابوو له رۆژنامەکانی ئێرانزەمین له پاریس و، ترودا له ئەورووپش هاتبووە گۆڕێ.

هەر لەو یەک دوو ساڵەدا دەگەڵ هێندێک له حیزبەکانی کوردستانی نه تەنیا باسی لەسەر کرا، بەڵکو چەند کۆبوونەوەشی له ئاڵمان و دانیمارک به بەشداری حیزبی ئێمە، پاسۆک، کاوە، پارتی دێموکراتی سووریا و بەرەی رزگاریخواز و... یەک دوو حیزبی دیکەی کوردی له ئاڵمان و دانمارک لەسەر کرا و بەهێندێک بۆچوونی هاوبەشیش گەیشتبووین. بەپێی قەرارێک کە لەو کۆبوونەوانەدا درابوو بە پێویست زاندرا، حیزبەکانی دیکەی وەک ح.د.ک.ا، پارتی دێوکراتی کوردستانی عێراق، یەکیەتی نیشتمانی کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیاش دەعوەت بکرێن، بەڵکو له کۆبوونەوەکان دا بەشدار بن. زەمینەکە هەبوو، له سێ وڵاتی ئوتریش، بریتانیا و ئاڵمان ئامادەبوون جێگاشمان بدەنێ، یاسر عەرەفاتیش کە له تونس دەگەڵم باس کرد زۆری پێ خۆشبوو. بە داخەوە حیزبە گەورەکان نەهاتن و هەر له چوارچێوەی ئەو حیزبانەدا مایەوە کە له سەرەوە ناویان هات. بە دوای ئەوەی دا کە راپەڕینی گەلی کورد له کوردستانی عیراق سەری هەڵدا و ناکامی باشی هەبوو، ئەتەوەی کورد ئومێدێکی تازەی بۆ پەیدا بوو، ئەو کۆبوونەوانەش ئەمان و مەسەلەکە بێدەنگەی لێکرا.

PKK کە ئەودەم دەگەڵ ئێمە نەهاتە پێش دوایە بۆخۆی پەرلەمانێکی له دەرەوەی وڵات سازکرد و بە هاوکاری ئەوان تلویزیۆنی Medtv دامەزرا و هێدی هێدی بوو بە جێگەی هاوار و بانگی کوردان. ئەودەم کوردستان بە گشتی شەڕ و کێشەی ناوخۆیی لێ پەیدا نەببوو. ئێمەش هەم له کوردستان وەک حیزبەکانی دیکە پێوەندیمان دەگەڵ PKK بەهێزبوو، کەم و زۆر هاوکاری یەکترمان دەکرد، هەم له دەرەوە هاتوچۆی پەرلەمانی کورد و تلویزیۆنی Med tv.ەیمان دەکرد و هێندێک جار هەواڵەکانمانیان بڵاودەکردەوە، جار جاریش وتووێژیان بۆدادەنایین تا بتوانین لەسەر وەزعی کورد له کوردستانی رۆژهەڵات بدوێین.

سەبارەت بە پێکهاتنی کۆنگرەی ئەتەوەیی، یا ئەو شتەی کە ئێدەی ئێمە بوو بەدەڵ دەمانەویست بەپێی ئوسووڵ پێک بێ، باس هاتە گۆڕێ و کەوتە ناو حیزبەکان. نوێنەری تێکۆشەری ئێمە کاک ئەبی له چەند کۆبوونەوەدا بەشداری کرد و منیشیان بۆ یەک دوو

جەلسەی باس و مێزگرد سەبارەت بەو شتە گرینگە بانگ کرد کە بە دڵەوە بەشداریم تێدا کرد.جارێکیان یانزە حیزبی کوردستانی لەم مێزگردەدا بەشداربوون، ئەوانەی لە بیرم ماون بریتی بوون لە: حیزبی سوسیالیستی کوردستانی تورکیا - پارتی دیموکراتی کوردستان - یەکیەتی نیشتمانی کوردستان - حیزبی دیموکراتی کوردستان، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ - حیزبی شیوعی کوردستان - PKK - حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی عێراق - پلاتفۆرمی کوردستانی تورکیا - پەرلەمانی کوردستان و مامۆستا برایم ئەحمەد و چەند کەسایەتی دیکەی سەربەست.

هەڵکەوتێکی باش بوو، باسەکان زۆر لێک نزیک بوون و قەراربوو دواتر کۆبوونەوەی درێژتر هەبێ لە "ح.د.ک.ئ" ش داوا بکرێ لە داهاتوودا بەشداربێ.

بۆ کۆبوونەوەی دواتر کاک نەبی قادری داوای لێکردین تا ئاخرین ئەزدری خۆمانی لەسەر پێکهاتنی کۆنگرەی نەتەوەیی بدەینێ تا لەوێ مەتردحی کا و وەک پرەنسیپ پێیان لەسەر داگرێ. ئێمەش بە پەیامی بێ سیمی ئەو خاڵانەی ژێرەوەمان دا بە (کاک نەبوبەکری راد) کە وەک نوێنەری حیزب لە دەفتەری حیزەکان لە بەغدا بوو تا بە تلیفۆن بیدا بە کاک نەبی.

١- چەند کەس لە ئەندامانی رێبەریان وەک (کاک حەسەن، کاک نەبی، کاک سەعید و کاک فەیسەڵ) لە ئەورووپان با ئەزدری خۆیان کۆکەنەوە و لەگەڵ بۆچوونەکانی ئێمە بیکەنە پرۆژەیەک و پێشکەشی بکەن.

٢- بەگشتی ئێمە موخالیفی شەڕی براکوژین و ئەم شەڕەش کە لە بەینی PKK و پارتی دا هەیە بە غەدرێکی ئاشکرای دەزانین و دەستتێوەردان لە کاروباری بەشەکانی دیکەی کوردستانە.

٣- ئێمە موافقی دۆستایەتی لە بەینی هەموو پارچەکانی کوردستان و هەموو هێزەکانی کوردستانین لەسەر بنەمای ئیحترامی بەرانبەر.

٤- رەنگە بیانهەوێ کاک عەبدوڵڵا وەک رێبەری نەتەوەیی بەسەر هەموو حیزبەکان و پارچەکان دا تەحمیل کەن ئێمە لەگەڵ ئەوەش موافق نین.

٥- پەرلەمانی کورد لە دەرەوە دەبێ بەرەو ئەوە بڕوا کە لە ژێر نفووزی حیزبێک دا نەمێنێ. بەڕاستی دەبێ لەرێگەی بەشداری هەموو حیزب و پارچەکانەوە بۆ خزمەت بە ستراتیژی کورد بێنێتەوە و خزمەتی گشتی کورد بکا و رێژیمەکانیش بەرانبەر کورد وەک یەک چاو لێ بکا .

٦- خۆ بواردنی هەر حیزبێک لە ئیعتیراف بەهەر چوار پارچەی کوردستان ناڕەوایە، هیچ کەس مافی ئەوەی نییە پارچەیەک لە کوردستان بکاتە " وجه المصالحه " بۆ سازان لەگەڵ لایەنێکی تر.

٧- رسالەتی کۆنگرەی کورد لە دەرەوە ئەوەیە کە ببێتە ئۆرگانێکی گشتی کورد و غەمخۆری ئەتەوەکەمان لەهەر چوار پارچە دابێ و هەوڵ بۆ هێنانە گۆڕی مەسەلەی کورد لە جیهاندا بدا.

٨- رێز دانانی کۆنگرە بۆ ئەندامان و هەروەها حورمەت راگرتنی حیزبەکان زۆر کۆمەک دەکا بۆ بەهێزبوونی پەرلەمان یا کۆنگرەی نەتەوەیی یەکگرتووی کورد.

٩- حەللی هەر گیر و گرفتێک لە نێو حیزبەکان دەبێ لەرێگای وتووێژی هێمنانەوە بێ.

**دەفتەری سیاسی**

**جەلیل گادانی و هاشم کەریمی**

**٥/٧ /٧٤. ١٣٦٥[٣]**

تا یەکگرتنەوەمان دەگەڵ بەشەکەی دیکەی حیزب، پێوەندیمان دەگەڵ PKK و پەرلەمان و Med tv . هەر بەرقەرار بوو. بۆ گەلێک مەسەلەش بە تایبەتی پەرلەمان نەزەری هاوڕێیانی ئێمەیان وەک مەشوەرەت وەردەگرت و هاوکاری سیاسیمان پێکەوەهەبوو، جگە لەوەی زۆر جار بۆ رێ و رسمەکان دەعوەت دەکراین، یادی دووی رێبەندانیشمان لە سالی ١٣٧٤ دا لە سوئید پێکەوە و لە یەک سالۆن دا بەڕێوەبرد.

لەسەر ئەو شەڕانەی کە جارێک پارتی و یەکیەتی بەیەکەوە وەک حکوومەتی هەرێم لە کوردستانی عیراق دەگەڵیان کردن و لە جارەکانی دواییش دا هەڵوێستی لێبڕاوانەی خۆمان گرتووە و پێمان راگەیاندوون.

بە پێچەوانەی ئەو قەول و قەراردی لەلایەن حیزبە حاکمەکانەوە بەتایبەتی یەکیەتی نیشتمانییەوە درابوو، تەوژمی رێژیم و تیرۆریستەکانی هەردەهات و زیاتر دەبوو. بۆیە لە مانگی فیوریەی ١٩٩٥ نامەیەک بە ئامادەوە بۆ کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ لە "ژنێڤ" نووسرا و بۆ یازدە ناوەند و رێکخراوی دیکەش وێنەکەی نێردرا و داوای ئیقدام و

---

٣- لەو کات دا کە دەبوو بە پەلەش ولام بدرێتەوە، بە کەلک وەرگرتن لەو باس و وتووێژانەی لە پێش دا لەسەر ئەو بابەتە لە دەفتەری سیاسی پلێنۆم دا کرابوو، هەر من و کاک هاشم لە دەفتەری سیاسی ئامادە بووین، ئەوەمان لە رێگەی دەفتەری حیزب لە بەغداوە بۆ کاک ئەبی بەرێ کرد.

لێپرسینەوە کرابوو کە دەقەکەی لە ئاخری کتێبەکە دا چاپ دەکرێ.

حیزبە گچکە ئێرانییەکان بەتەواوی کوردستانیان جێ هێشتبوو. مەنتیق حوکمی دەکرد هێزەکانی کوردستانی ئێران تەجرەبەیان وەرگرتبێ. ئێمە دەگەڵ کۆمەڵە زۆر نێزیکتر ببووینەوە، لەسەر زۆر مەسەلە و رووداوی سیاسی جیهانی و ئێرانی و کوردستانی بەیەکەوە مەشوەرەتمان دەکرد و هێندێک جار هەیئەتی هاوبەشیشمان لە کوردستان و دەرەوە هاودەنگیان دەکرد و بەیەکەوە بۆ لابردنی گیر و گرفتەکان دەچوونە لای بەرپرسانی حکوومەتی هەرێم و رێکخراوەکانی دەرەوە.

بە دوای کۆبوونەوەیەک کە دەفتەری سیاسی حیزبی ئێمە و کومیتەی ناوەندی کۆمەڵە کردیان لەسەر تیرۆرەکان بەو ئاکامە گەیشتن کە حیزبە حاکم و بەرپرسەکانی کوردستان بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ پەرەساندنی تیرۆر گوێ نادەنێ و بێ تەفاوەتن و بگرە هێندێک مۆرەی بە کرێگیراو جار جار هاوکاریشیان دەکەن. بۆیە وا باشە کۆمەڵانی خەڵک ئاگادارکەین و لەرێگەی ئەوانەوە موشکلەکانمان حەل کەین و داوای هاوکارییان لێ بکەین.

لەسەر ئەو قەرارە بانگەوازێکی هاوبەش بۆ کۆمەڵانی خەڵکی ئازادیخواز لە کوردستانی عێراق لە رێکەوتی ٩٦/٤/١٥ دەرچوو کە ریزی ئەو رووداوە دڵتەزێنانەی تا ئەو کات لە کوردستانی رزگار کراودا بەرانبەر بە کوردە تێکۆشەرەکانی ئێرانی کرابوون، زەمیمە کرا. ئەو نامەیە و زەمیمەکانی لە ئاخردا بەرچاوتان دەکەون.

هەرچەند ئێمە هەر لە سەرەتای هەڵوێست گرتنەوە دەگەڵ شوورا و سازمانی موجاهیدینیش وەک زۆربەی حیزبەکانی ئێرانی و کوردستانی پێوەندی زۆر دۆستانە و باشمان هەبوو، بەڵام دوای کۆنگرەی " ١٠ " لەسەر ئەوەی کە دروشمی حیزبمان گۆڕی بوو و لە جیاتی خودموختاری کە هۆیەکی گرینگی دۆستایەتی ئێمە دەگەڵ موجاهیدین بوو، دیاری کردنی مافی چارەنووسمان پەسند و بەرز کردبۆوە نێوانمان ساردببوو و پێوەندییەکی ئەوتۆمان بەیەکەوە نەمابوو.

لەراستیش دا ئەو ساردبوونەوەی دۆستایەتیمان بە زیانی هەردوولامان و زیاتریش بە زیانی ئێمە بوو. چونکو ئەوان تەنیا هێزێکی سەرانسەری ئێرانین کە بە شێوەی رەسمی گەلالەی دوازدە ماددەیی خودموختارییان دەگەڵ ئێمە ئیمزا کردووە و تا ئێستاش بۆ گەلی کورد بە مافێکی رەوای دەزانن. زۆرپێویست بوو ئەو ناتەباییە لە جێگایەک هەڵگیرێ و دەرگای دۆستایەتیمان بکرێتەوە. لە دەرەوەش بۆ ئەم کارە هەوڵ درابوو، بەڵام بە ئاکامی پێویست نەگەیبوو.

بۆیە لە پلینۆمی چواردم دا کە بڕیاردرابوو سەفەری دەرەوە بکەم یەکێک لەو ئەرکانەی هاوڕێیانی ڕێبەری پێیان ئەسپاردبووم، حەللی ئەو ناکۆکییە بوو. لە مانگی ئۆی ٧٤ دا سەفەری دەرەوەم کرد هەر کە گەیشتمە پاریس دەگەڵ بەرپرسی ئەو کاتی حیزبمان "کاک فەرهاد" (ئیقبال) قسەم کرد تا چاوپێکەوتنێک دەگەڵ شوورا بکەین. لە کۆبوونەوەکەدا پاش گلەیی و گازندەیەکی زۆر لە یەکتر، هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە دیاریکردنی مافی چارەنووس شتێکی گشتییە و یەکێک لە هێڵەکانیشی خودموختارییە.لە ئاکامی چەند کۆبوونەوەی درێژدا بەو ئاکامە گەیشتین کە بەیانێکی هاوبەش دەرکەین و بۆچوون و بەڵێنەکانمان بۆ یەکتر نوێ بکەینەوە. دیارە پێشتر دەگەڵ هاوڕێیانی ڕێبەری ئامادە لە ئەورووپاش وەک کاک حەسەن ڕەستگار و کاک ئەبی قادری بەرپرسی کومیتەی ئەورووپا و کاک سەعید بەگزادە مەشوەرەتمان کردبوو، پێشنووسی مەتلەبەکەشیان دیبوو و ئەزەریان لەسەر دابوو.

ڕۆژی ٧٤/٩/٢٣ ئەو هاوبەیانییە دوو قۆڵییە کە لەلایەن من و محەممەد ڕەزا ڕوحانی بەرپرسی کۆمیسیۆنی کاروباری میلیتهای شورای ملی مقاومت ایران لەسەرەتایەک و شەش خاڵ دا ئیمزا کرا کە هەم لە ڕادیۆ و تلویزیۆن و هەم لە ڕۆژنامەی ژمارە ٧٧ ی ئێران زمین دا بڵاوکرایەوە. ئەو کارە دەنگدانەوەی باشی هەبوو و ئاژانسە هەواڵدەرییەکانیش باسیان کرد. عەینی شتەکەش لە بەشی بەڵگەنامەکان دا دێتە بەرچاوتان.

ڕۆژی ٧٤/٩/٢٧ چاوپێکەوتنێکمان وەک هەیئەتی حیزبی دەگەڵ مریم خانم رجوی، سەرکۆماری دیاریکراوی شوورای ملی مقاومت هەبوو کە زۆر بەکەڵک بوو و دەستووری دا هاوکاری باش و هەمە لایەنەمان بکەن و ئەو پەیمان نامە بەکردەوە جێبەجێ بکرێ.

بەدوای ئەم بڕیارنامە و چاوپێکەوتنانەدا لە چەند وڵات نوێنەرانیان بۆ درێژە دانی کاری دیپلۆماسی ساڵەکانی پێشوو هەروەها بۆ چاوپێکەوتنی هێندێک ئۆرگانیزمی حکوومەتی و پەرلەمانتێر و دۆستانی خێرخوازی کورد هاوکارییان کردین.

بەدوای ئەو چاوپێکەوتنانەی من و هاوڕێیانم لەدەرەوە، ڕێکەوتی ١٣٧٤/١٠/٢٤ کاک فەتاح کاویان و کاک حوسێن مەدنی ئەندامانی دەفتەری سیاسی و کاک ئەبوبکر راد ئەندامی کومیتەی ناوەندی و نوێنەری حیزب لە بەغدا چاویان بە کاک مەسعود رجوی بەرپرسی شوورا کەوتبوو، لەوپەڕی ڕەزامەندی دا مەتنی بڕیارنامە ئیمزاکراوەکەی منیان دەگەڵ ئاغای محەممەد ڕەزا ڕوحانی تەئیید کردبوو.

هەر لەو سەفەرەی دەرەوەم دا پاش سەردان لە وڵاتانی فەڕەنسا، هولەندا، ئاڵمان، نەرویژ، سوئێد و بریتانیا و بلژیک لە مانگی ڕەشەمە دا دەگەڵ کاک سەلاح گادانی وەک هەیئەتێکی حیزبی بۆ یەکەم جار سەفەرێکی ئەمریکامان کرد و ماوەی دە ڕۆژ لەوێ ماینەوە. سەرەڕای ئەوەی لە کۆشکەکانی سەنا و کۆنگرەدا لەگەڵ دەیان سەناتۆر و کۆنگرێسمان یەک یەک دانیشتنمان هەبوو لەسەر وەزعی ئێران و کوردستان ئاگادارم کردن و بەتایبەتی لەسەر بەشخوراوی نەتەوەی کورد بەگشتی و گەلی کورد لە کوردستانی ئێران قسەم بۆ کردن و داوای هاوکاریم لێ کردن بۆ پشتیوانی لە خەباتی ڕەوای گەلانی ئێران و بەتایبەتی گەلی کورد بەدژی ڕێژیمی ئاخوندان.

جگە لەوەی زۆر کەسایەتی ناودار و بنکە و بنیادی ئینسانی و هەروەها نوێنەرانی هێزەکانی کوردستانی و ئێرانیم لە واشینگتون چاو پێکەوت و لەگەڵ هەر کام لە ئەوان باسی وەزعی کورد و کوردستان و ئێران و سیاسەتی ئەمریکامان بەرانبەر بە دەوڵەتەکانی داگیرکەری کوردستان کرد، دەگەڵ هاوڕێیانی پەنابەری حیزبیش لە نێزیکەوە یا بە تەلیفۆن پێوەندیم گرت و بۆ کارکردن لە بواری سیاسی و حیزبی هانم دان.

ڕێکەوتی ١٢ی مارسی١٣٧٤ نامەیەکی سەر ئاوەڵام بۆ سەرۆکی کۆنگرەی ئەمریکا نووسی و وێنەشم بەهەموو ئەو نوێنەرانەدا کە ملاقاتم کردن.. دەگەڵ ئەو نامە لیستەیەکی ٧٤٢ کەسی لە شەهیدانی حیزب کە تاساڵی ١٩٩٠ ئیعدام کراون، ناوی ١٣٠ ئاوایی وێرانکراو، ئێوی ٣٠ کەس لە حیزبی خۆمان، ٣٨ کەس لە حیزبەکانی دیکەی کوردستان کە لە چوار ساڵی دوایی دا تیرۆریستەکانی ڕێژیم شەهیدیان کردبوون زەمیمە کرابوو. هەر لەو نامەدا ئیشارە بەزۆرکاری غەیرە ئینسانی ڕێژیم دەگەڵ خەڵکی ئاسایی و بەندییە سیاسییەکان کرابوو. وەرگێردراوی ئەو نامەیە لەگەڵ بەڵگەنامەکان و هەروەها نامەیەکی کورتیش کە بۆ سوپاس لەو ٢٢ نوێنەرەی کونگرەی ئەمریکام نووسیوە کە نامەیان بۆ کلنتۆنی سەرکۆمار نووسیبوو و لەو نامەیەدا داوایان لێ کردبوو سەرنجی زیاتر بە مەسەلەی کورد لە ئێران و عێراق بدرێ و پشتیوانی جددیتریان لێ بکرێ، لە ئاخردا ئەو نامە و بەڵگانە دەکەوێتە بەرچاوتان.

ئاشکرایە کە هەرکام لە سەفەرەکانی دەرەوە گرینگی بنەڕەتییان، کاری دیپلوماتیک بوو و لە هەر وڵاتێک کە دەچووین زۆر لە کەسایەتی ناسراوی حکوومەتی، دیپلۆمات و ڕێکخراوە مرۆڤدۆست و دیموکراتیکەکانمان چاو پێدەکەوت و بە پێی ئیمکان لە سەر وەزعی ئێران و نەتەوەی کورد و چلۆنایەتی ئەو غەدرانەی کە لەلایەن ڕێژیمەکانەوە لێمان

کراوە باس دەکرا و بۆچوونی حکوومەتەکانی داگیرکەری کوردستان دەهاتە گۆڕێ. بەڵام لە ئەمریکا کە بە هاوکاری دۆستانی بەڕێز بەرنامەڕێژییەکی لەبار کرابوو ئەو چاوپێکەوتنانە هەم زۆر بوون و هەم یەکجار بەکەڵکبوون و لەڕاستیدا هیچ چاوپێکەوتنێکمان نەبوو کە لە کۆتایی دا سویاسمان لێ نەکرێ و داوا نەکرێ بۆ جارەکانی تر کاتی زیاتریان بۆ دابنێین. باسەکانیامان لە سەر ڕێژیمی ئێران، و باقی ڕێژیمەکانی کە کوردستانیان بەسەر دابەش کراوە، هەروەها باس لەسەر رابردووی نەتەوەکەمان و وەزعی پەرێشانی کورد لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان زۆر لا پەسەند بوو.

بەتایبەتی هێندێک مۆرەی گرینگ وەک خانم کاترین پۆرتێر بەرپرسی مافی مرۆڤ کە مێردەکەشی نوێنەرێکی بەناوبانگی کۆنگرەیە و ئەو نامەی لەسەر کورد بۆ کلینتۆن نووسرابوو و ٢٢ نوێنەری کۆنگرەش ئیمزایان کردبوو لەسەر پێشنیاری ئەو ئامادە کرابوو، بۆ خۆشی بۆ تەواو کردنی شەڕی براکوژی کوردستانی باشوور زۆری هەوڵ دابوو، هەروەها خانم جۆلی بێریولت نوێنەری ڕێکخراوی نەتەوەکانی بێ کورسی لە ڕێکخراوی نێونەتەوەیی دا کە زۆر کەسی پێناساندین و زۆر ڕێنوێنی کردین و وتی هەموو نەتەوە بێ کورسییەکان دەتوانن لەم ڕێکخراوەی ئێمە دا بەشدارین.

لەم سەفەرە دە رۆژییەدا رۆژانە ٥-٤ چاوپێکەوتنمان هەبوو کە ناو و نیشانی هێندێک لەوانەمان لەلا ماوە کە دەتوانن لەلاپەڕەکانی ئاخری پەرتووکەکە دا چاوتان پێیان بکەوێ.

لە ئاکامی سەفەرەکە دا بۆمان دەرکەوت کە ئەو جۆرەی پێویستە لە روانگەی ئەمریکاوە نە ڕێژیمەکانی حاکم بەسەر کوردستانی دابەش کراودا و نە نەتەوەی کورد وەک خۆی کە هەیە ناسراون و، ئەرکی سەرشانی هەموو حیزبە کوردستانییەکان و دیپلۆماتەکانە زیاتر بۆ ئەمریکا سەفەر بکەن و زۆرتر لەسەر راستییەکان ئەمریکا روون کەنەوە، چونکە بە هیچ شێوەیەک هەستیان بە تیرۆریزمی دەوڵەتی نەکردووە و لە خۆیانی زۆر دوور دەبینن.[٤]

هەروەها بۆمان روون بۆوە کە بەرپرسانی دەستڕۆی و هەر هەنگاوێک کە بە ئێوی دێموکراسی و مافی مرۆڤ و ئەم بابەتانە هەڵیدەگرن، بەر لە هەمووشت بۆ دابین کردنی بەرژەوەندی خۆیان و بەهێزکردنی وەزعی خۆیان لە شوێنەکانی جۆراوجۆری دنیایە و هەموو هەوڵ و کۆششیان بۆ یەکلاکردنەوەی دنیای دووقوتبیش بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان بووە.

---

٤- خوێنەری بەڕێز ئەم بەشە زۆر پێش رووداوی دڵتەزێنی ١١ی سپتامبر نووسراوە.

هەر بۆیەش ئەمریکاییەکان بەشێکی کەم لە دەردی ئێمەی کورد و گەلانی بەشخوراوی دیکەیان دەرک کردبوو. تا ئەو کاتیش دڵخۆشی زۆریان بە پیوەندی داهاتووی خۆیان و رێژیمی کۆماری ئیسلامی هەبوو. ئەو بۆچوونە لە هێندێکیان بە قەدرا بۆچوونی ئەورووپاییەکان توندبوو، کیسەیەکی گەورەی خۆشبینانەیان بۆ کردنەوەی گرێکان لەلایەن رەفسەنجانییەوە هەڵدروو بوو. هێندێک سەناتوور و کۆنگرێسمان لە سیاسەتی کلینتۆن لە سەر ئەو گەمارۆ ئابوورییەی لەو کاتدا لە سەر ئێران داندرابوو نارازی بوون. هێندێکیش لەوان پێیان وابوو وەزارەتی کاروباری دەرەوە ئەوچەشنەی پێویستە لە مەسەلەکان و ماهییەتی رێژیمی کۆماری ئیسلامی حاڵی نین، بەڵام ئەمریکاییەکان وەک نەتەوەیەکی پێشکەوتوو بە پێچەوانەی ئێمەی کورد، ئەو ئاڵۆزی و جیایی بیروڕای یەکتریان بەراحەتی تەحەممول دەکرد و بۆ حەللی هەموو موشکلەیەک لەگەڵ یەکتر دەرگای وتوویژ دەکەنەوە.

لە هەڵسەنگاندنی دواییدا بە تەواوی بۆمان روون بووە سەرەڕای ئەوەی ئەمریکا دوای شەڕی دووهەمی جیهانی بەتایبەتی هەوڵی داوە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و گەلەکانی بناسێ و لە سییەکانی هەتاوی دا بە دوای کودیتای ۲۸ی گەلاوێژی شا بە دژی موسەدیق (ویلیام دوگلاس) مافناسی ناسراوی ئەمریکایی بۆ کوردستان نارد و ویستی کورد بناسێ کەچی هێشتا کوردیان بە باشی نەناسیوە. هەرچەند لەم ساڵانەی دواتریش ئیمکاناتێکی زۆری بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە بەڵام کورد و چلۆنایەتی ژیان و وەزعی ژێئوپولیتیکی ئەو خاک و نەتەوە بە زۆر لە یەک داپڕاوەی دەرک نەکردووە و ئیستراتیژی روونی بۆی نییە.

هەروەها زیاترمان بۆ روون بۆوە کە شەڕی براکوژی لە کوردستانی باشوور شوێنی زۆر خراپی لە بیروبۆچوونەکانیان سەبارەت بە کورد داناوە و بەتایبەتی جێبەجێ نەکردنی رێککەوتننامەی دوبلین تاڕادەیەکی بەرچاو ئەوانی رەشبین کردووە و لە هاوکاری دەگەڵ کورد دڵساردی کردوون.

بۆیە بە بڕوای ئێمە ئەرکی بەرپرسانی ئەحزابی کوردستانییە بە هەر شێوەیەک بۆیان دەلوێ سەفەر بکەن بچنە لای دەوڵەتانی خاوەن دەسەڵات و بەکردەوە پێیان نیشان دەن کە کوردیش توانای خۆبەڕێوەبردن و خۆئیدارە کردنی هەیە و دۆستان و دڵسۆزانی کورد لەو رەشبینییە دەرخەن و بەرەو گەشبینییان بەرن تا دەستی دۆستیمان بۆ درێژ کەن و هاوکاری پێویستی کورد بەتێکرا بکەن.

بە ئاشکرا دیار بوو کە لەبەر فەرق و جیاوازی زۆر لە بەینی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی

ئێرانی لەلایەک و نەبوونی دەرکی واقعی لە ماهییەتی تیرۆریست پەروەری کۆماری ئیسلامی دووچاری بێبڕوایی و سەرلێشێواوی بوون و تا ئەوکات خۆیان بۆ ساغ نەدەبۆوە و بڕیاری لێبڕاوانەیان بۆ نەدەدرا. بەڵام ئەوەش حاشا هەڵنەگر بوو کە شووڕای بەرگری میللی لە نێو سەناتۆرەکان و نوێنەرەکانی کۆنگرەدا جێگەی خۆیان کردۆتەوە و بەتەواوی لە گۆڕەپانی سیاسەت دا دیار و بەرچاون. تاقولۆقیشیان ئەوان لەڕوانگەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە بە تیرۆریست دەزانن.

هەر چەند سەفەرەکە زۆر کورت بوو و لە دە رۆژ تێنەپەڕی بەڵام یەکجار بەسوودی حیزبەکەمان و گەلی کورد و بزووتنەوەی سەرتاسەری ئێران بوو. ڕەنگە ئەگەر فرسەت هەبێ و یادداشتەکانی ئەو سەفەرە تەنزیم بکرێ پەرتووکێکی بەکەڵکی لێ پەیدا بێ.

ڕێکەوتی ٧٥/١/٥ لە کۆتایی سەفەرەکەی دەرەوەم دا لە بەغدا دەگەڵ کاک مەسعود ڕەجەوی بەرپرسی شووڕای ملی مقاومت و فەرماندەی ئەرتەشی ئازایخواز چاومان بەیەکتر کەوت و جارێکی تر لەسەر وەزعی سیاسی بە درێژی دواین و کۆبوونەوەیەکی زۆر دۆستانە و سەرکەوتوومان هەبوو. لەو دیدارەدا سوپاسی مریم خانم ڕەجەوی بەتایبەتی و خوشک و برایانی شووڕای بەرگری میللیم کرد کە لە سەفەرەکەی ئەمریکام دا ئەوپەڕی هاوکارییان کردم.

دیارە ڕێز و حورمەتی بەرپرسانی پارتی و یەکیەتی لە ئەمریکا و دوکتور نەجم الدین کریم بەرپرسی کۆنگرەی کورد لە ئەمریکاش بۆ من جێگای سوپاس و پێزانینە.

زەحمەتی کاک سەلاح کادانیش وەک دیپلۆماتێک و کادرێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتووی حیزب کە بەڕاستی نموونەی ئەزم و کاتناسی بوو و لەم سەفەرە دا دەگەڵم بوو جێگەی سوپاسە.

کورتەی زۆربەی زۆری ئەو چاوپێکەوتن و دانیشتنانەی دەگەڵ زیاتر لە سی نوێنەری کۆنگرە و سەناتۆر و ڕێکخراو و کەسایەتییەکانی واشەنگتۆن بوومانە و هەروەها دیدار و چاوپێکەوتن دەگەڵ کەسایەتی و نوێنەرانی حیزب و ڕێکخراوە کوردستانی و ئێرانییەکان بوومانە بەدەستەوەن. بە مەبەستی قەبە نەبوونی کتێبەکە لێرەدا نایان هێنم، بەڵام عومەر باقی بێ لە داهاتوودا بە شێوەیەکی گونجاو دەخرێتە بەرچاوی هاونیشتمانانی بەرێز و خوازیارانی بەڵگە و دۆکیمەنتی زیندوو.

لەوماوەی دا کەمن لە دەرەوە بووم مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە سکرتێری بەشەکەی دیکەی حیزبیش دەگەڵ کاک بابا عەلی مهرپرودر لە دەرەوە بوون. زۆر جار بەیەکەوە بە تەلیفۆن قسەمان دەکرد. چەند جارێکیش لەسەر داواکردنی مامۆستا من وێڕای چەند

هاوڕێیەکی وەک کاک عەزیز ماملێ، کاک ئیقبال محەممەدی، یا کاک تاهیر ئەردەلان دەچوومە دەفتەر و لەوێ دوای هێندێک باس و خواسی گشتی دەچووینەوە سەر مەسەلەی گۆڕین و لەسەر چلۆنایەتی یەکگرتنەوەکە دەدواین.

ئەودی بەڕوونی لە قسەکانی ماموستا دەردەکەوت بۆ هات و چۆی ئێمە دەگەڵ Med tv و پەرلەمانی کوردستان و هەروەها بۆ پێوەندیان دەگەڵ سازمانی موجاهیدینی خەڵک و شورای بەرگری میللی زۆر ناڕەحەت بوو. هێندێک جار بەڕوونی دەری دەبڕی و لەم بابەتەوە پرسیاری دەکرد.

بەداخەوە ئەو خۆ بە زل زانییە زۆرجار چاوی مەنتقی پیاو دەبەستێ و مرۆڤ تووشی رەشبینی و هەڵە دەکا. دەنا ئێستاشی دەگەڵ بێ هەبوونی پێوەندی دۆستانە دەگەڵ پەرلەمانی کورد، یادەزگایەکی تەبلیغاتی وەک Medtv و هەروەها بوونی دۆستایەتی دەگەڵ موجاهیدین و شوورا جگە لە سوود بۆ ئێمەی کورد چ زیانێکی تێدایە؟

بەڵام ئەودی لەو شتانەشی پێ ناخۆشتر بوو کرانەوەی ڕێگەی ئێمە بۆ ئەمریکا بوو، پێی وابوو ئەو پێوەندییانە پێشی یەکگرتنەوەی ئێمە دەگرن. لە حاڵێکا هیچ کام لەو هێز و پێوەندییانە بە قەدرایە " گیومەی " ماموستا لەسەر کاری پیرۆزی یەکگرتنەوە شوێنی مەنفییان دانەنا و ئێمە هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە سەربەست بووین و بڕیاردەری هەموو قەرار و بڕیارێک بۆ خۆمان بووین و بە کردەوەش لەو هەشت ساڵەدا نیشانمان دا.

کاری یەکگرتنەوە بەسترابۆوە بە گەڕانەوەی هەردوو سکرتێر و هێندێک هاوڕێ کە لە ئەورووپا بوون و دەبوو بگەڕێنەوە کوردستان. بە خۆشییەوە لە سەرەتای بەهاری ۷۵ ئێمە گەڕاینەوە کوردستان. بەشێک لە هاوڕێیانی کومیتەی مەرکەزیش گەڕانەوە و باسەکە بەگەرمی دەستی پێکردبۆوە و ئەندامانی ئەو دوو هەیئەتەی بۆ بردنە پێشی مەسەلەی یەکگرتنەوە دانرابوون هەروا بەگەرمی هاتوچۆیان هەبوو و لەسەر گەلاڵە و هەل و مەرجەکە دەدوان.

لە ڕێکەوتی ٧٥/٢/٦ پێنجەمین پلینۆمی کومیتەی ناوەندی گیرا و چەند ڕۆژی خایاند. لەو کۆبوونەوەدا بۆ بەهێزتر کردنی هەیئەتی حیزب کاک عوسمان رەحیمی ئەندامی کومیتەی ناوەندیش کرا بە ئەندامی رسمی هەیئەت.

لە ئاگادارییەکیدا کە بە بۆنەی کۆتایی هاتنی پلینۆم لەلایەن دەفتەری سیاسییەوە بڵاوکراوەتەوە نووسراوە :

"پلینۆم وێڕای تەئیید کردنی هەوڵ و تێکۆشانی هەیئەتی تایبەتی لە پێناو یەکگرتنەوەی دوو باڵەکەی حیزب هەیئەتی دیاریکراوی راسپارد بۆ چارەسەرکردنی دوا

گیروگرفتەکان هەوڵ بدا، ڕێگا بۆ تێکۆشانی هاوبەشی هەموو تێکۆشەرانی دێوکرات لە ژێر تیشکی یەکگرتنەوەیەکی بەرپرسانە و دڵسۆزانەدا خۆش بکا.. "

هەر لەو پلینۆمەدا قەراردرابوو ئەگەر پێویست بوو بە پێی سەرکەوتنی هەینەتەکان پلینۆمەکانمان وەپێش دەخەین و هاوڕێیان بۆ کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی بانگ دەکەین.

بەشێک لە کەموکووڕی گەلاڵەی هەل و مەرجی یەکگرتنەوەمان حەل ببوو، پێویست بوو بۆ باقییەکەشی هەنگاو هەڵگیرێ. هەر بەو مەبەستە لە ڕێکەوتی ٧٥/٦/٢٩ شەشەمین پلینۆم بۆ ماوەی سێ ڕۆژ گیرا. بەڕاستی پلینۆمێکی پڕ جەنجاڵ بوو. پاش باسێکی دوور و درێژ کۆبوونەوە هاتە سەر ئەو باوەڕە ئاڵوگۆڕێک لە دەفتەری سیاسی دا پێک بێنێ. کاک حەسەن ڕەستگار کرا بە سکرتێر و دەفتەری سیاسی لە پێنج کەسەوە کرا بە سێ کەس. لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی کاک هاشم کەریمی و نووسەری ئەم دێڕانە لە جێگای خۆمان ماینەوە و منیان بە تێکڕای دەنگ بە پێچەوانەی مەیلی خۆم وەک جێگری سکرتێریش دیاری کرد.

بەشی هەرەزۆری باسەکانی پلینۆم لەسەر یەکگرتنەوە بوو. بەتایبەتی سەبارەت بە بەیاننامەی هاوبەش. لە کۆتایی دا بەو ئاکامە گەیشتین کە لە بڕیارە سیاسییەکانیش دا نووسراوە :

"ڕێبەرایەتی ئێمە بڕیاری دا بەو شەرتەی گیومەکان هەڵگیرێن بەیاننامە و ڕێککەوتن نامەکە قەبووڵ دەکا".

قەبووڵی ئەو هەموو بەکەم گرتنە و پێ ڕێخستن لەو هەموو خەبات و فیداکارییەی لەو ٨ ساڵەدا کرابوو، کارێکی هاسان نەبوو. تەنیا مەسەلەحەتی گەلی کوردبوو کە حوکمی دەکرد ئەو یەکگرتنەوە بەو مەرجە سەیر و سەمەرانە بکرێ. پێشتر لەسەر زۆر شێوەی دیکە وەک هاوکاریکردن، وەک دوو حیزبی برا پێکەوە خەبات کردن و... دوا بووین، بەڵام ڕاپەڕاندنی مەسەلەکە و یەکگرتنەوەی یەکجاری لەهەموان پەسندتر بوو. هەر بۆیەش دەبوو تەنازول بکەین و لەهەوڵ دان ماندوو نەبین.

ئەو هەوڵ دانە ئەوەندەی درێژە کێشا تا کاک نەبی قادری ئەندامی کومیتەی ناوەندی، بەرپرسی کومیتەی ئەورووپا و قسە وێژی حیزبمان کەلەبەر ئەخۆشییەکی عیلاج ناپەزیری سەرەتانی ئێسک کە تووشی هاتبوو، هەر لەبەرئەوەش دوای کۆنگرەی دەهەم ئەیتوانیبوو بگەڕێتەوە کوردستان، بەداخەوە لە ئێوارەی دووشەمە ڕێکەوتی ١٣٧٥/٩/١٣ لە شاری کۆپنهاگی دانمارک کۆچی دوایی کرد. ڕۆژی دوایی لەنێوخەم و پەژارەی ئەندامانی بنەماڵە

و هاوڕێیانی حیزبی دانیشتووی ئەورووپا و جەماوەرێکی زۆر لە کوردانی دڵسۆز بەڕێوڕەسمێکی باشی حیزبییانە بەخاک ئەسپێردرا و مەخابن نەیتوانی یەکبوونەوەی ریزەکانی حیزب ببینێ.

بەم بۆنەوە جگە لەوەی لە دانیمارک و سوئید و نەرویژ، لە بنکەی دەفتەری حیزب و شارەکانی رانیە و هەولێر سەرەخۆشی بۆ دانرا، لەلایەن کومیتەی ناوەندی و کومیتەی دەرەوەی حیزبیشەوە راگەیەندراوێک بەم بۆنەوە دەرچووە کە لە بەڵگەکان دا دەکەوێتە بەرچاوتان.

چەند کەس لە هاوڕێیانی رێبەری کە بۆیان نەکرابوو بانگهێشتنەوەی دەفتەری سیاسی و کومیتە مەرکەزی جێبەجێ بکەن و بۆ کۆبوونەوەکانی پلینۆم بگەڕێنەوە، تەعلیق کرابوون.

موناقەشە و هەوڵدان لەسەر پرۆژەکە بەردەبەرد لە ناکامی خۆی نێزیک دەبۆوە و کەند و کۆسپەکان بەلانی کەمی خۆیان گەیشتبوون.

لە پلینۆمی حەوتەمی حیزب کە لە رێکەوتی ٧/ ١٠/ ٧٥ لە دەفتەری حیزبمان لەشاری هەولێر گیرا. پاش باسێکی کورت لەسەر ئاخرین ئاڵوگۆڕەکانی بەیانییەی هاوبەش و نێزیک بوونەوەی زۆر بەرچاو لەسەر مەتنی ئاگاداری هاوبەش، پلینۆم بەدەفتەری سیاسی ئەسپارد کە هەر ئەو رۆژە بچنە دەفتەری سیاسی باڵەکەی دیکەی حیزب لە کۆیە و دوایین بڕیاربدەن.

ئەو مەئمورییەتە بەسەرکەوتنەوە بە ئەنجام گەیشت و هەر ئەو رۆژی بەیاننامەکە دوای هەڵگرتنی گیومەکان و رێککەوتننامەکە کە "تا ئێستاش نەهێنییە "بە هێندێک ئاڵوگۆڕ لەلایەن هەردوو سکرتێری دوو باڵی حیزبەوە مامۆستا عبداللە حەسەن زادە و کاک حەسەن ڕەستگار ئیمزا کرا و بڕیار درا دوای دە رۆژ ڕێوڕەسمێک بەڕێوەبچێ و بەشێوەیەکی ڕەسمی یەکگرتنەوەکە ڕاگەیەندرێ.

دوای گەڕانەوەی ئێمە بۆ هەولێر، پلینۆم زۆر زوو کۆتایی هات و دوای دوو رۆژ ئیعلامیەی ژێرەوە نووسرا و بڵاوکراوە:

## هاوولاتییه بەڕێزەکان
## ئەندام و کادر و پێشمەرگە تێکۆشەرەکانی حیزب !

پلینۆمی حەوتەمی کومیتەی ناوەندی حیزبمان، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لە ڕێکەوتی ٧/ ١٠ /٧٥ تا ٩/ ١٠ /٧٥ بەبەشداری زوربەی ئەندامان و جێگران و موشاویرانی کومیتەی ناوەندی بەڕێوەچوو. لەم سێ ڕۆژەدا مەسەلەکانی جیهانی و ئێرانی و کوردستانی کەوتنە بەر باس و لێکۆڵینەوە و بەشدارانی پلینۆم چالاکانە لەسەر مەسەلەکان دوان. لە ژێر ڕووناکی ئەم باسانەدا گرینگترین مەسەلەی ئەم جارەی پلینۆم بریتی بوو لەیەکگرتنەوەی دوو باڵی حیزب کە ماوەی ساڵ و نیوێکە هەم حیزبی ئێمە و هەم باڵەکەی دیکەی حیزب بۆی لە هەوڵ و تێکۆشان دان.

بەخۆشییەوە ڕادەگەیەنین کە بە تێکڕای دەنگ بڕیاری یەکگرتنەوەی تێکڕای ریزەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران درا و بە دەفتەری سیاسی ئەسپێردرا کە هەرچی زووتر ئەم مەسەلە گرینگی تایبەتی خۆی بدرێتێ و بەئەنجام بگەیەندرێ.

**کومیتەی ناوەندی**
**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**
**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**١٣٧٥/١٠/١٠**

لەبەر ئەوەی چاوپێکەوتنەکانی ئەو یەک ساڵ و نیوە دەنگی دابۆوە و ببوو بە مایەی دڵخۆشی خەڵک و لانی کەم بۆ بەشی هەرە زۆری خەڵک روون بوو کە ئەم ڕێککەوتنەوە ئەو ئاکامانەی ژێرەوەی دەبێ:

١- وردی خەڵکی خەباتگێری کوردستان زیاتر دەچێتە سەری و هان دەدرێن بۆ پێک هێنانی ریزی یەکگرتوو دژی سیاسەتە چەوتەکانی ڕێژیم لە کوردستان دا.

٢- ئەم یەکگرتنەوە ریزەکانی بزووتنەوەی هەقخوازانەی گەلی کورد یەکگرتووتر و بەهێزتر دەکا.

٣- لە بواری ناوچەیی و جیهانیدا زیاتر حیساب لەسەر یەکگرتوویی و بەهێزی نفووزی مەعنەوی هێزەکان لە نێو خەڵک دا دەکرێ.

٤- وردی هێزە دژی گەلییەکانی ڕێژیم لە کوردستان دێتە خوارەوە.

٥- یەکگرتنەوە لە ئەنجام دا دەبێتە هۆی چارەسەری زۆرکێشە و گیروگرفتی نێوخۆیی.

بۆیە پێویست بوو هەرچی زووتر ئەم خەبەرە بە خەڵک بگا و لە رادیۆکان و میدیای کوردستانی و جیهانی دا بلاوبێتەوە.

سەرەڕای ئەوە لە پێناو ئەم یەکگرتنەوەدا گەلێک شت هاتۆتە گۆڕێ، دەیان نامە ئاڵوگۆڕکراوە کە هەرکامیان شوێن و کەڵکی خۆیان هەیە و ردنگە هەل و مەرجی ئێستا بۆ نووسین و بلاوکردنەوەیان موناسیب نەبێ. بەلام وەک فەسڵێکی تایبەت لە ژیانی خەبات و حیزبایەتی دەبێ بنووسرێ و ببێتە پەرتووکێک و بۆ تەجرەبە وەرگرتنیش بێ لە ئیختیار نەسل و جیلەکانی دوارۆژ بندرێ.

سەرەنجام رۆژی ١٩/ ١٠/ ٧٥ ڕێوڕەسمێکی بەرین و پڕ شکۆ بەبەشداری بەشێکی زۆر لە کادر و و پێشمەرگە و بنەماڵەکانی هەردوو باڵی حیزب بەڕێوەچوو. لەو ڕێوڕەسمەدا لەلایەن سکرتێرەکانی هەردوو بەش قسەکرا و بەیانیەی هاوبەش کە پێشتر بە ئیمزای هەردوولا گەیشتبوو خوێندرایەوە و یەکگرتنەوەکە کە ئارەزووی چەند ساڵەی خەڵک بوو وەدی هات. دەقی ئیعلامیەکە و قسەکان لە ئاخری کتێبەکەدا لە ریزی بەڵگەنامەکان دا هاتووە.

# بەشی هەوتەم

لەماوەی ئەو چەندساڵەدا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ تەنیا لە بەشی سیاسی دا کاری نەکرد، بەڵکو بەپێی ئەو بێ بەشیەی کە بەبوونی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی گەلەکەمان زیاتر لە پێشوش تووشی هاتبوو بەئەرکی خۆی دەزانی بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کادر و پێشمەرگەکان بەڕاستی نموونەی فیداکاری بوون و لە هەموو بوارەکاندا هەر کەس بە گوێرەی توانای خۆی ئیستیعدادی لە خۆی نیشان دابوو، لە بواری جۆراوجۆردا هەوڵی دا و دەتوانین بڵێین لەبەشی هەرە زۆریان دا سەرەڕای کەم ئیمکانی سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو کە بە کورتی ئاماژەیان پێ دەکەین:

**لەبواری کاری ئۆرگانیک و ڕێکخستن دا:**

١- بەدوای ساغ بوونەوە لەسەر هەڵوێست گرتن، ئیقدامی جیددی بۆ نووسینی ڕاگەیەندراوێک کرا و بنەماکەی لەسەر بۆچوونی هاوبەشی هەموو هاوڕێیان داڕێژرا و ئەوەمان کردە بڕیار کە لە چوارچێوەی سیاسەت و بەرچاوگرتنی ئەدەبیاتی سیاسییانە و ژیرانە دەرنەچین.

٢- پاش نووسین و بڵاوکردنەوەی ڕاگەیەندراوەکە، بێ ڕاوەستان ناردنی لیژنەی تایبەت بۆلای هەرکام لەبەشەکانی حیزب کە لە کوردستانی عێراق دا جێگیر بوون و هەرئۆرگانەی لەلایەک بوو، دەست پێ کرا. ئەرکی ئەو لیژنانە باس کردن لەسەر بەیانیەکە و ڕوونکردنەوەی زیاتر و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی بیسەران بوو.

٣- گواستنەوە و ڕێکخستنی هەموو ئەو ئۆرگان و هێزانەی پشتیوانی خۆیان ڕادەگەیاند بۆ شوێنی دیاریکراو. هەروەها بردنەوەی ئەو کەسانە بۆ شوێنی دڵخوازی خۆیان کە دەیانەویست وەک پێشوو لەجێی خۆیان دا بمێننەوە و بە هەڵوێستی ئێمە ڕازی

نەبوون. دیارە ئەو کارە لە چەند شوێن بەوپەڕی حورمەتەوە جێبەجێ کرا. بەداخەوە لایەنی دی ئەو حورمەتەی نەپاراست و لە ناوەندی شیمال کردیانە ڕێگری و کەمینیان بۆ هاوڕێیانمان دانا و بە دەخالەتی حکوومەتی عێراق موشکلەکە حەل بوو.

٤- ڕێکخستنی هەموو ئەو کەسانەی پشتیوانییان دەربڕی لەجێ و شوێنی تازە بە نێوی کومیتە شارستان و هێزی خۆیانەوە.

٥- گێڕانەوە لە هەموو ئەو کەسانەی پێشتر بەهۆی دڵهێشی لە بەرپرسان و ڕەفتاری حیزب تۆریا بوون و دانیشتبوون. ئەو کارە دەر و ژووری دەگرتەوە و بڕیارێکی زۆر بەکەڵک بوو. دیارە ئەم دەعوەتە بە هیچ شێوەیەک کەسانی جاسوس و جینایەتکاری نەدەگرتەوە.

٦- گرتنی پێوەندی دەگەڵ هێزەکانی ئێرانی و کوردستانی کە لە مەیدان دا بوون و هەروەها ئاگادارکردنی ئەوهێزە کوردستانییەی لەوڵات دا نەبوون و ناوەندەکانیان لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستان دا بوو. جگە لە بەیانییەی ١٠ ماددەیی چەند کەسێکیش وەک لیژنە بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر دەچوونە لایان.

٧- ساغ کردنەوەی ئەو کەسانەی لەدەرەوە ئامادەی پشتیوانی لە هەڵوێستمان بوون. بەدوای ئەوەدا دانانەوەی کومیتەی حیزبی لە وڵاتەکان بەتایبەتی دامەزراندنی ناوەندێک لە پاریس بۆ کاری دیپلۆماتیک و وەڵامدانەوە بە پێداویستی ئەندامانی لاو یا کومیتەکانی کە ساغ کرابوونەوە.

٨- وەگەڕخستنەوەی ڕادیۆ و چاپەمەنی کە بەداخەوە نێزیکەی مانگ و نیوێکی لەوەختمان گرت تا وەڕێ کەوت.

٩- گرتنی کۆنفرانسی چوار بۆ ساغ بوونەوە لەسەر بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆی حیزب و هەڵبژاردنی ڕێبەرایەتی تازە.

١٠- سازمان دانەوەی هێزەکان و تەیارکردنی دووبارەیان لە باری چەک و چۆڵەوە و ناردنەوەی پێشمەرگە و کادر بۆ نێوخۆی وڵات و تێکۆشانی بەکردەوە لەبواری سیاسی، تەشکیلاتی و نیزامی دا.

١١- پێکهێنانی کۆنگرەی نۆهەمی حیزب بە بەشداری نوێنەرانی دەر و ژوور، ئیسلاحاتی پێویست لەبەرنامە و تەئکید لەسەر پێکهێنانی ئۆرگانیزمی گشتی بۆ گەلی کورد لەدەرەوەی کوردستان و بەتایبەت لە ئورووپا بەمەبەستی پاراستنی سەربەخۆیی و ئازادی تێکۆشان. هەروەها سووربوون لەسەر ئەو سیاسەتە ژیرانەی تا

ئەو کات رێبەرایەتی حیزبمان بەرانبەر بە هاوسەنگەرانی پێشوو و باقی هێزەکان گرتبوویە پێش.

١٢- گرتنی کۆنگرەی دەهەم، گۆڕینی شیعاری ستراتیژی حیزب لە خودموختاری بۆ دیاریکردنی مافی چارەنووس. بەهێزکردنی بەکردەوەی دژی ئاڵۆزی و ناتەبایی نێو هێزەکانی کوردستان و پێکهێنانی تەفاهوم دەگەڵ لایەنەکەی دیکەی حیزب کە تا ئەو کاتیش هەر بە فراکسیۆنمان ناودەبردن.

هەربۆیە هەموو حیزبە ردسەنەکان لە پارچەکانی کوردستان و ئێران، هەروەها کەسایەتییەکان پاش ماوەیەکی کەم سەردەرای ئەوەی ردنگ بێ لەسەردتای هەڵوێست گرتن دا لە کارەکەمان رازی نەبووبن، بەڵام زۆر زوو بە پشتیوانی جیدەی لە هەڵوێستمان روویان تێ کردین و بەگیان و دڵ دۆستایەتییان دەکردین. ئەوان دەیانزانی کە ئێمە هەرچەند داوامان کەمە، بەڵام گەلێکی گەورەی سی میلیۆنین، ئێمەش وەک خەڵک مافمانە بە سەربەستی بژین و نابێ لەو بوارەدا ترسمان هەبێ. پێویستە بە راشکاوی رابگەیەنین کە گەلێکین غەدرمان لێکراوە و مافمان زەوت و وڵاتمان بەش کراوە.

بەڕاستی دەخۆمان رادەدی هەوڵ بدەین و ببینە هەوێنی یەک گرتنێکی گەورەی هێزەکانی کوردستانی و ئێرانی. بڕوای تەواومان بەوە هەبوو کە دۆستایەتی دەگەڵ هێزەکانی هەردوولا پێویستییەکی مێژووییە و بۆ رزگاری گەل و نەتەوەی ئێمە وەک کورد و هەموو گەلانی تری ئێران گرینگی تایبەتی هەیە.

لەو دەیان پەیام و پیرۆزباییانەی بەبۆنەی رێوڕەسمەکان و کۆنگرەکان و بەتایبەتی لە ماوەی بەڕێوە چوونی جێژنەکانی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی حیزب دا هاتبوون و ئەو گەرم و گوڕییەی نوێنەری هێزەکان، نووسەران، شاعیران و زانایان بەبەشداری خۆیان نیشانیاندا نموونەی هاوبیری و پێشوازی لە بیروبۆچوونی ئێمە و سیاسەتی دروست و ئوسوولی حیزبی دیموکراتی کوردستان، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بوو.

**بواری سیاسی :**

هەوڵدان بۆ هەرچی زیاتری نێزیکی لەو هێزانەی هەست بە بەرپرسایەتی دەکەن و دەیانتوانی شوێنەواریان لەسەر جووڵانەوەکەمان هەبێ. تەنانەت دەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی جارانمان کە بۆ سەر و ماڵیان لێ دەدایین و بەتەواوی وجوود دوژمنایەتییان دەکردین، زۆر جار نیازپاکی خۆمان بەئاشکرا نیشان دا.

دابەزین بەتەواوی لەو فەرهەنگە نارەسەنەی خۆ بەزل زانی کە بەشێوەی ئاغا و مسکێنی دەگەڵ خەڵکی دیکە رەفتار دەکرا. دژایەتی بەکردەوە دەگەڵ شەڕی ناوخۆیی بەهەر بەهانە و بەهەر شێوەیەک کەدەستی پێدەکرا. بەدڵ پێمان وابوو کە ئەو کارە کە رەنگە خۆشمان رۆژێک بەداخەوە لایەنگری بووبێن و تینیشمان تێ کردبێ، گەورەترین زیان بە جوولانەوەی گەل و نیشتمان دەگەیەنێ و لە ئاکام دا هیچ گیروگرفتێک حەل ناکا و حەسرەتی ئەوانەی لە دەستمان دەچن دەخۆین و چ فایدەش نابینین.

پێمان وابوو کورد دەبێ خۆی لەدەست ئەو دوژمنە گەورە بۆ هەمیشە رزگار بکا کە بەدرێژایی مێژوو لەلایەن ئەزانان و دوژمنەکانیەوە هەوڵ بۆ سازکردنی دراوە. بەم هۆیە هەموو بەرنامەی ژیانی لێ تێکداوە، ژیانی لێ حەرام و ماڵی لێ وێرانکراوە.

نموونەی بەکردەوەی ئەم بۆچوونە ئاگربەستێک بوو کەیەک لایەنە دەگەڵ کۆمەڵە لە رێکەوتی ١ / ٢ / ١٣٦٧ رامانگەیاند و شوێنەواری زۆر گەورەی لەسەر وردەی گەل دانا و گەشەی بە خەبات دا.

هەروەها دەیان نامە و پەیام کەلەوماوەدا بۆ لایەنەکانی شەڕی ناوخۆیی نووسراوە و شەڕی ناوخۆیی بە هەموو شێوەیەک مەحکووم کراوە، شاهیدی زیندووی ئەو بۆچوونە راست و داخوازە رەوایانەن کە لە جێگەی خۆیدا نموونەکانیان هاتووە.

**لە بواری سیاسەتی دەرەوە:**

هەوڵماندا لەسەر ئەو بنەمایەی کە لە پێشینیانمان بیستبوو ((هەزاردۆست کەمە و دوژمنێک زۆر)) بە لەبەرچاوگرتنی بریاری کۆنگرە ((هەرکەس بڕوای بە دێموکراسی و دابین بوونی مافی گەلی کورد هەبێ دەبێ دۆستایەتی بکەین)) تێکۆشانی خۆمان لەبواری دیپلۆماسییەوە دەست پێکرد. رێگەی ئەورووپامان بەسەر خۆمان دا کردەوە، لەهەر شوێنێک هەستمان بەوەی کردبا دەتوانێ ئومێدێک بەگەلەکەمان ببەخشێ و سوودی لێ وەردەگرین سەرمان پێدادەکرد. جگە لەهاوڕێیانمان کە لەدەرەوە بوون و کاریان دەکرد و پێوەندییان دەگرت، ساڵێ یەک دووجار لەلایەن ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و ناوەندییەوە سەفەر بۆ دەرەوە دەکرا. پێمان وابوو کاری دەرەوە گرینگی تایبەتی خۆی هەیە و دەبێ هەوڵی زیاتری بۆ بدرێ، ئیمکانات و ئەفەری زیاتری بۆ تەرخان کرێ. هەر لەم پێوەندییەدا بوو کە کومیتەی ئەورووپا لە سێ هاورێ کاک ئەبی قادری، سەعید بیگزادە و کاک محەممەدئەمین رشیدی پێک هات کە نەتەنیا بوو بە هۆی بەهێز بوونی کومیتەکانی

حـیـزب لـەو وڵاتانە کـە تێکۆشـانی بەرچاو هەبوو لە چەند وڵاتی دیـکەی وەک فنلاند و دانیـمـارک و تورکیـاش کـومـیـتـە دامـەزرا و تێکۆشـان زۆر بەرچاوتر بوو. تەنانەت دوای فەوتی کاک نەبیش ئەم هەوڵ و تێکۆشانە لەلایەن کاک سەعید سەرنج راکێش بوو.

کردەوە لەو بوارەدا نیشـانەی روونی ئەو هەوڵ و کۆششـەیە کەلەماوەی ئەوچەند سالە بەسەدان کەسـایەتی سیـاسی و کۆمەلایەتی، بەسەدان نوێنەری حیزب و رێکخراوەکان، بەسەدان نوێنەری پەرلەمـان، رۆژنامـەنووس و هەواڵـنێرژ دیـتران. هـەوتوو و مـانگ نەبوو لەسەر حیزبی ئێمە لەرادیۆکان قسە نەکرێ یا لەلایەن هاوڕێیانەوە لەرۆژنامە و رادیۆ و تلەویزیۆنانەوە وتوێژ و هەواڵ و بیر و را بلاونەکرێتەوە. بەراشکاوی دەتوانم بلێم کە لە ناساندنی زیاتری گەلی کـورد بەگشـتی رۆلی بەرچاومـان هەبوو. دیسـانیش پێمـان کـەم بوو. دەکرا لەوە زیاتریش هەولبدەین. بەو خالە گەییووین کە ئێمە داوامان لە خەلک هەیە و پێـویسـتیـمـان بە یارمەتی دەولەتان و گەلانی جیـهـان هەیە، تا لە رزگـاربوونمان دا یارمەتیـمـان بدەن. لەم پێـوندییـەدا بەلـگە بەسـەدانە بەلام بە یەک لە هەزار قـەناعـەت دەکەین، کردنەوەی رێگای ئەمریکا، دیدار دەگەل یاسر عەرەفات و سـەفیـردکانی چین و ویتنام، یرف تاج الدین نوێنەری کوردەکانی موسکۆ، دۆستایەتی نێزیک دەگەل PKK و Med tv و پارلمانی کورد لە تەبعید دا بەشێک لەو کارانەبوون.

**لە بواری تەبلیغاتییەوە:**

دامەزراندنی رادیۆ چل شـەو دواتر لە راگەیاندنی هەلێست. دانانی بەرنامەی هەمە بابەت کـە جـێگەی سـەرنجی خـەلک بوون. بلاوکـردنەوەی "٨٠" ژمـارە لە رۆژنامـەی کوردسـتـان، "٢٠" ژمارە لەگۆڤاری وەرزیی ٢٦ی سەرماوەز، "١٠" ژمـارە لە روانگەی لاوان، چاپ و بلاوکردنەوەی دروشم و پۆستێری زۆر لە کوردسـتانی عێراق و ناردنەوەیان بۆ ناوخۆی وڵات، چاپکردنی ئەو پەرتووکـانە: (بەرناوردی چوارینەکـانی خەییام، کـاک نەبی قادری)، (دینامـیـزم......، کاک حوسێن مدنی)، کـتـێبی ئالبوومی شەهیدان بە نێوی "شـەهیـدانی حـیـزب و گـەل"، بەزەحـمەتی چەند هاوڕێی دانیـشـتـووی فـەرەنسـا و هاوکاری راسـتەوخۆی نووسـەری ئەم دێرانە، (پەنجا سـاڵ خەبات، لەلایەن نووسەری ئەم دێرانە، کە بۆ سەرفەجویی لە خەرجی حیزب دا نووسەر لەسەر خەرجی خۆی چاپی کرد)، هەروەها (بەرگی دووهەمی پەنجا ساڵ خەبات، لەلایەن نووسەری ئەم دێرانە، لەبەر هەل و مەرجی تایبەتی و نەپسانەوەی کۆشش بۆ یەکگرتنەوە تا ئێستا چاپ نەکرابوو). (دانانی

نوێنگەی وێنەی شەهیدان جگە لە نێوخۆی حیزب، لە رانیە، لە سلێمانی، لە هەولێر).
(بەڕێوەبردنی هەموو رێوڕەسمەکانی حیزبی و نەتەوەیی وەک "٢٥"ی گەلاوێژ، "٢٦"ی سەرماوەز، دووی رێبەندان، جێژنی نەورۆز، "١٠"ی خاکە لێوە. کە هەرکام بەرنامەی تایبەتی خۆی هەبوو)، بەشێک لە کارە هونەرییەکانی ئەو رێوڕەسمانە لەشارەکانی کوردستانی عیراقیش بەڕێوەدەچوون.

جێژنی ٥٠ ساڵەی دامەزرانی حیزب کە بەرێوڕەسمێکی پڕ شکۆ جگە لەبەشداری کۆڕی هونەری و لاوانی حیزب چەند کۆڕی مۆسیقای سلێمانی و کۆڕی میزۆپۆتامیاش بەشدارییان تێدا کردبوو. لەو کۆڕەدا زۆر لە گەورە نووسەران و شاعیرە بەناوبانگەکانی کوردستانی عێراق بەشدار بوون و لەماوەی ٢٤ سەعات دا هەرکام بە پێی لێهاتوویی و ئامادەگی خۆیان هەستی خاوێن و بێ خەوشی هونەرمەندانەیان دەربڕی. هەر بەو موناسەبەتە ئارمێکی تایبەتی ئامادەکرا و وەک دیاری بە دۆستان و و ئۆرگانەکانی حیزب پێشکەش کرا.

هەر بەو موناسەبەتە ئەوارێکی ویدیۆیی بەزەحمەتی مامۆستا بێبەش لە کورتەی خەباتی ٥٠ ساڵەی حیزب ئامادەکرا و دەگەڵ هەڵبەست و سروود تێک هەڵکێش کرا و پێشکەش بە ئۆرگانەکانی حیزب و گەلی قارەمانی کورد کرا.

**لە بواری ئاموزشییەوە:**

دانانی زیاتر لە "٢٠" دەورە کلاسی کادر لەدەرەجەی جۆراوجۆردا. کە لەو کلاسانەدا ئەو ماددانە دەگوترانەوە. ئەرکی حیزبایەتی و چلۆنایەتی کاری رێکخراوەیی لەهەل و مەرجەکانی جۆراوجۆردا، بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆ، کوردستان و ئەرکی جوولانەوە، مێژووی کورد بە گشتی، دێموکراسی، دیکتاتۆری، مێژووی جوولانەوەکانی کورد لەهەر چوار بەش، لێک گرێدانی خەباتی جەماوەری و خەباتی چەکداری، ناسینی ئۆپۆزیسیۆن، مافی دیاریکردنی چارەنووس، سیاسەتی حیزب و پێوەندی دەگەڵ هێزەکانی کوردستانی و ئێرانی و زۆر بابەتی تر.

هەوڵێکی زۆر بۆ پەروەردەی منداڵەکانی کادر و پێشمەرگەکان لەشاری رانیە و کەمپەکان درا، قوتابخانەی تەیار نە هەر بۆ ئەوان بەڵکوو بۆ منداڵەکانی دێهاتی دەوروبەریش داندرا. بۆ خوێندەواری گەورە ساڵان بەتایبەتی ژنەکان لە باری خوێندنی دەرس و پێگەیاندنی سیاسیی ئەوان چەندین کلاس و دەورە داندرا و بەهرەی باشیان

وەرگرت. دەرمانگای تەیار بۆ خۆمان و جەماوەری دەوروبەر دامەزرا. ئاوی لوولەکێشی لە سەرچاوەکان را و کارەبا بۆ خۆمان و سێ چوار گوندی دەوروبەر بە مودلیدە راکێشرا.

**بەشی ئەدەب و هونەر:**

دانانی بەرنامەی ئەدەب و هونەر هەر لە سەرەتای دامەزراندنەوەی رادیۆکە یەکجار سەرنجڕاکێش بوو. لەو بەرنامەدا کە لەلایەن هاوڕێیان مامۆستا ییبمش، مامۆستا عاشق و خوشکە خەجیج سوارەوە بەڕێوەدەچوو، هەر حەفتەی بۆ ماوەی سەعاتێک لەسەر شاعیران و نووسەرانی کورد قسە دەکرا و بێگومان گەنجینەیەکی بەکەڵکە بۆ گەلی کورد، ئەگەر رۆژێک نیمکانی چاپی هەبێ یا بە شێوەی زیندوو لە تلویزیۆن دوویات بێتەوە زیندووترین مێژووی ئەدەبی کورد دەبێ. چونکو جگە لە ژیاننامەی ئەو کەسانەی کە باسیان لەسەر کراوە لەهەرکام چەند نموونە هەڵبەستی پڕ لە هەستی جوانپەرستی و نیشتمان پەروەری و... هەڵبژێردراوە و دەگەڵ موسیقای موناسبی خۆی کە تایبەتی بۆی هەڵبژێردراوە دیکلمە کراون. جگە لەوانەش زۆر جار کۆڕی شیعر و ئەدەب دادەندرا کەلەوێ جگە لە مامۆستاکان، لاوەکانی خاوەن زەوقیش بەشدارییان دەکرد و رادەهاتن.

گۆڤاری ٢٦ی سەرماوەزیش ئۆرگانێکی هاندەر و هەمە بابەت بوو کە زۆر کەس دیارییان بۆ دەنارد و چاپ دەکرا. دەتوانین بڵێین هۆیەکی گرینگی هاندەر بوو بۆ هەموو ئەدیب و نووسەران بەتایبەت بۆ تازە پێگەیشتوو و لاوەکان.

کۆڕی هونەری لەو ماوەدا بەدەیان ئاهەنگ و سروودی سازکرد کە هەرکام چێژ و تامی خۆی هەبوو، زۆربەشیان نەتەنیا لەڕێگەی رادیۆ چوونە ناو کۆڕ و کۆمەڵی خەڵکەوە، بەڵکو بەشێوەی ئەهێنی نێردرانەوە نێوخۆ و کەڵکیان لێ وەرگیرا.

بەشی فیلمبەرداری، یەکێک لە بەشە هەرە بەبەهرەکانی حیزب بوو کە لەتەواوی ڕێوڕەسمی حیزبی، کۆبوونەوەکان، شانۆکان و بەرنامە هونەرییەکان فیلمی هەڵدەگرت تا هەم لە ئارشیودا بمێنێ و هەم ئەگەر بەپێویست بزاندرێ لە باقی ئۆرگانەکان لە شوێنە جۆراوجۆرەکان کەڵکیان لێوەرگیرێ. بەرنامەی تلویزیۆنی شەوی شیعر بەبۆنەی جێژنی نەورۆز دەگەڵ موسیقا و گۆرانی، هەروەها بەبۆنەی ساڵیادی مامۆستا گۆرانی شاعیر بەرنامەیەکی ئەوتۆ پێک هات کە لە کاناڵەکانی تلویزیۆنی سلێمانی و هەولێر بڵاوکرانەوە.

کلاسی تایبەتی شانۆگەری بۆ هێندێک لە پێشمەرگە و لاوەکان دانرا کە ناکامی زۆر

باشی بوو. شانۆگەری بیووە یەکێک لەو ئەرکە هونەرییانە کە لەنێو ئۆرگانەکان و واحیدەکانی پێشمەرگەدا کاری لەسەر دەکرا و بەشێک لەکاتی بێکاری خۆیان لەم کارەدا سەرف دەکرد و زۆریان پێشڕەفت کردبوو.

لەو ماوەدا بەدەیان شانۆ نەتەنیا نیشانی کادر و پێشمەرگە و ئەندامانی بنەماڵەکانی سەر بە حیزب درا، بەڵکو لە هێندێک لە شارەکانی کوردستانی عیراقیش وەک رانیە، سلێمانی، هەولێر دەهاتنە سەر بەرزەک و دەخرانە بەرچاوی خەڵک و گەلێک جاریش ئەو شتانە بەتایبەتی دوای راپەڕین لە تلویزیۆنی بەشێک لە حیزبەکانی کوردستانی باشوور بلاودەکرانەوە.

**ناوی بەشێک لەو شانۆیانە بریتین لە:**

١- شانۆی وەفاداران - ژیان و بەسەرهاتی شەهید سلیمان معینی یەکێک لە رێبەرانی جوولانەوەی چەکدارانەی ساڵەکانی ١٣٤٦ -١٣٤٧ی هەتاوی.

٢- خاک - باس لە نیشتمان پەروەری و کاری شۆڕشگێرانە دەکا.

٣- برایم زەبۆک - وەرگێڕاوی نووسراوەی عەزیز نەسین.

٤- کاوەی ئاسنگەر - نووسینی شێرکۆ بێکەس و دەرهێنانی هاشم رۆستەمی، لە رانیە و هەولێر نیشان دراوە.

٥- هاوار - نیشاندەری خەباتی ژنانی کورد دژی چەوسانەوە.

٦- چرۆی وەریو - تەمەنی یازدە مانگەی کۆماری کوردستان، ئامادەکردنی مامۆستا بێ بەش، لە شارەکانی رانیە، سلێمانی و هەولێر بەڕێوەچوو، کە هەرکام لەم شانۆیانە چەند رۆژ لەسەر بەرزەک مایەوە و پێشوازی زۆر گەرمی لێکرا.

٧- فیلمی ویدئویی ئەرک - بۆ یەکەم جار لەڕووی سیناریۆیەکەوە ئامادەکرا کە مامۆستا بێبەش نووسیبووی و کارگێڕییەکەش هەر بۆ خۆی کردوویەتی. بریتییە لە کار و باری پێشمەرگە و هاوکاری خەڵک بە دژایەتی دەگەڵ رێژیم. هەرچەند بەیەک دووربین هەڵگیراوە و ئیمکاناتەکەی زۆر کەم بووە، بەڵام فیلمێکی زیندوو و زۆر بەنرخ و سەرکەوتووە.

جگە لەوانە بەدەیان شانۆی کۆمیکی کورت و درێژ نووسراوە و نیشان دراوە کە دەتوانین " کۆلکە میرزا "، "دوکتوری بەدەڵ " و... ناوبەرین.

**بواری نیزامی و تەشکیلاتی:**

بەداخەوە بەڕێوەبردنی ئەرکی پێشمەرگایەتی و کاری چەکداری بۆ هاوڕێیانی ئێمە گەلێک دژواربوو، لەلایەک ئیمکاناتی کەم و لەلایەکی دیکە شەڕ دەگەڵ ڕێژیم و بەرگری لە خۆیان لە بەرانبەر هێرشی هاوسەنگەرانی رابردوومان کە پێشتر باس کراوە. سەرەڕای ئەوەش ئیمانی بەهێز بەهیچ شێوەیەک مەودای خۆ دزینەوەی نەدەدا و لەهەر هەلومەرجێک دا ئەرکیان پێ سپێردرابا بە گیان و دڵ ئەنجامیان دەدا.

کاری ئەهێنیش لەناو چین و توێژەکانی کۆمەڵ دا خۆی بەشێکی دیکە لەم ئەرکە بوو کە زۆرجار لە تەنیشت کاری پێشمەرگایەتی جێبەجێ دەکرا، هەرچەند هێندێک هاوڕێشمان لەم پێناوەدا شەهید بوون، بەڵام کارەکان ئەوەندە بەردەوبێش چووبوون کە زۆر جێگەی هومێد بوو. لەزۆر گوند و شار هەبوون هاوڕێیانێک کە بەدڵسۆزی تەواو هەڵدەسووڕان.

شەڕەکانی رۆژی ٢٧ی گەلاوێژی ١٣٦٧ لەدەوری مەهاباد و ناو شاردا، ئاغ داغ لە ٥/٢٨، کێوی تەرەغەو ناوچە بەربڵاوەکەی لە رێکەوتی ٥/٣٠ و خستنی زیاتر لە ١٥٠ کەلاکی دوژمن لە مەیدان. گیانبازی شەهیدانی بانە هەر لەو ساڵە دا و دەیان شەڕی دیکە و یەک لەوان شەڕی پیرودلی باغی لە ساڵەکانی دواتردا کە دەیان کەلاک لە دوژمن کەوتبوو، نموونەی خۆبەخت کەری و گیانبازی پێشمەرگە نازاکانی حیزب بوو و کورتەی دەستکەوتەکانیش لە جەدوەلی تایبەتیدا هاتووە. یا جێگەی خۆیەتی بیر خۆمانی بخەینەوە، ئەو درامایەی کە پۆلێک لە پێشمەرگەی حیزبمان ماوەی یەک حەوتوو لە شوێنێکی عاستەم لە سنووری تورکیا لە نێو دوژمنان دا حاسیە ببوون و تەنیا بە هێزی ئیمان و خواردنی بۆق و قرژاڵ و مار توانیان خۆڕاگرانە دەرباز بن.

دیارە ئەوانەی گوتمان بەو مانایە نییە کە ئێمە رەخنەمان لەسەر نییە. رەنگە ئێمەش لەگەڵ ئەو کارانەی ئەنجامان داون هێندێک جار هەڵەشمان کردبێ، هەلمان لەدەست دابێ و بۆهێندێک کار لە کاتی پێویستدا نەجووڵابین. ئەوەی جێگەی داخ بوو ئەوەبوو کە لەو دواییانەدا بەشێک لەبەر کەم بوونی ئیمکانات و بەشێکیش بەهۆی لاوازی وردی هێندێک لە دۆستان و هاوڕێیان دەغەلکاریی دەستی پێکردبوو. فرت و فێڵ بوو بە هۆی ئەوە بەشێکی بەرچاو لە کادر و پێشمەرگەکان بڕوای خۆیان بە حیزب لەدەست بدەن و بەجێمان بێڵن.

# بەشی هەشتەم

خوێنەری بەڕێز لە بیریەتی کە لە سەرەتای بەرگی یەکەمی "٥٠ ساڵ خەبات" دا داوام لەهەموو خوێنەرانی بەڕێز کردبوو کە دوای موتاڵای کتێبەکە هەر کەموکوورییەکی بەزەینیان گەیشت یادداشتی کەن و بە نووسراوە بۆم بنێرن تا لە چاپدانەوەدا هەڵەکان راست کەمەوە و بۆچوونەکانیشیان لەبەرگی دووهەم دا بخەمە بەرچاوی خوێنەران. لێرەدا بەپێویست دەزانم نووسراوەی ئەو چەند کەسانەی ژێرەوە کە لە گۆڤاردا چاپیان کردووە یا بەخەتی خۆیان نووسیویانە و بۆیان ناردووم بخەمە بەرچاوی ئێوە ئازیزان تا هەم لەبیر و بۆچوونیان ئاگاداربن و هەم منیش بەڵێنەکەم بردبێتە سەر. بێگومان هەر کام لەو کەسانە بە پێی موتاڵا، بەشداری لە خەبات یا ئاگاداری لە مێژووی رابردووی گەلەکەمان خاوەن ئەزەرن و بە حورمەتی زەحمەتێک کە کێشاویانە و رێنوێنییەکی بەمەبەستی تەکمیلی کتێبەکە و راست کردنەوەی هەڵەکان کردوویانە سوپاسیان دەکەم و لە کاتی خۆشیدا کەڵکی لێ وەردەگرم. ناوی ئەو کەسانە بریتییە لە:

١- کاک هۆشەنگ تۆفیق، ناسراو بە جووتیار، خەڵکی سلێمانی، ئێستا لە سوئید دەژی.
٢- کاک مەلا رەسول پیشنماز، خەڵکی مەهاباد، ئەندامی پێشووتری رێبەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دانیشتووی سوئید.
١- خوشکە سوهەیلا ماملێ، خەڵکی مەهاباد، دوکتورای مێژوو، دانیشتووی فەڕەنسە.
٢- کاک ئەنودر سوڵتانی، خەڵکی بۆکان، لێکۆڵەرەوە، دانیشتووی لەندەن.
٣- کاک هاشم روستەمی و مامۆستا عەبدوڵڵای مام عەلیش هێندێک ئیشکالاتی فەنییان خستۆتە بەرچاو کە لە چاپکردنەوەی دا بە پێی ئیمکان دەیانگونجێنم.

## چاوخشاندنێک بە کتێبی (پەنجا ساڵ خەبات) دا
## هۆشەنگ تۆفیق

نووسینەوەی مێژووی حیزبێکی وەک " حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران" کە ئێستاکە پەنجا ساڵ لە تەمەنی خۆی بەڕێ کردووە، کارێکی هەروا سووک و ئاسان نییە و هەوڵ و کۆششێکی زۆری دەوێت.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران " حدکا " لەماوەی ئەو پەنجا ساڵەدا بەچەندین قۆناغی جۆراوجۆر و بەنێو زۆرهەلومەرجی سەخت و دژواردا تێپەڕیوە.. لەچەند دەرفەتێکی زۆر کورتیش دا نەبوبێت بۆی ئەلواوە بە ئازادی (یان نیمچە ئازادی) لە کوردستانی ئێران دا کاری سیاسی خۆی ئەنجام بدات، ئیدی بەشی زۆری تەمەنی لە خەباتی نهێنی دا بەسەر بردووە و زۆربەی کات پێشمەرگە و ئەندام و رابەرەکانی پەرتەوازە و دەربەدەر بوون.

مێژووی ئەو پەنجا ساڵەی حدکا بەشێکی گرنگ لە مێژووی هاوچەرخی نەتەوەکەمان پێک دێنێت. هەروەها بەشێکیشە لە مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلانی ئێران و ناوچەکەش. لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەو حیزبە ئەهمییەتێکی گەورە و فرەلایەنی هەیە.

کێشە جۆراوجۆرەکانی ناوچەکە و ئێران و کوردستان لەلایەک و ئەو هێرش و پەلامارداننە وەحشیگەرییانەی بەردەوام کراونەتە سەر حدکا لەلایەکی دیکەوە و سەرهەڵدانی ململانێ و تەنگ و چەڵەمەی ناوخۆی حیزبیش بوونەتە هۆی ئەوە کە ئەو حیزبە نەتوانێت وەکو پێویست بە رابردووی خۆیدا بچێتەوە و ورد و درشتی رووداو و بەسەرهاتەکانی خۆی بنووسێتەوە و ژیاننامەی پێشمەرگە و رابەرەکانی تۆمار بکات و لە فەوتان و بیرچوونەوە بیانپارێزێت. نەک هەر ئەوە تەنانەت نەشیتوانیوە ئەرشیفێکی دەوڵەمەند و رێک و پێک سەبارەت بە مێژووی خۆی دابمەزرێنێ و هەرچی بەڵگەنامە و بڵاوکراوەی خۆی هەبووە تیایدا بیپارێزێت. کە لەناوخۆی کوردستان دا ئەو دەرفەتەیان بۆ ئەڕەخساوە، لەدەرەوەش (بەتایبەتی لە ئەورووپا کەلە چەند شوێنێک بنکەیان هەبووە و هەیە) هەر ئەو کارە گرنگەیان ئەنجام نەداوە، کە ئەمەیان تاڕادەیەک کەمتەرخەمی و بێ سەلیقەیی رابەرەکانی حدکا خۆی تێدایە !!

گەلێک سیاسەتمەدار و مێژوونووس و تەنانەت چەند نووسەر و ئەدیبێکیش جارجار لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبی و فارسییەکان دا دەربارەی هەندێک لایەنی مێژووی حدکا یان نووسیوە. بەزۆریش ئەو نووسینانە پەیوەندییان بە سەرەتای دامەزراندنی حدکا و سەروەختی کۆماری کوردستان و ڕووخان و لەناوچوونی ئەو کۆمارە و شەهید بوونی پێشەوای حیزب و کۆمار و ژمارەیەکی زۆر لە ڕابەرانی حیزب هەیە. بەڵام ڕابەر و سەرکردەکانی حدکا خۆی تاچەند ساڵێک لەمەوبەر زۆر بەکەمی سەبارەت بە مێژووی حیزبی خۆیان دەیان نووسی و زۆر کەم ئاوڕیان لە ڕابردووی حیزبی خۆیان دەدایەوە!..

ئێستا وا چەند ساڵێکە هەندێک لە ڕابەر و ئەندامە دێرینەکانی حیزب وەخۆ کەوتوون و پەیتا پەیتا دەربارەی مێژووی حدکا دەنووسن و چ بە شێوەی کتێب یان نامیلکە یان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا وتار و لێکۆڵینەوە بڵاودەکەنەوە.

دەتوانین بڵێین سەرەتای ئەم جۆرە نووسینە لە "٢٥ ساڵ خەبات و تێکۆشان"ی مامۆستا کەریمی حیسامی یەوە دەست پێدەکات، کە ساڵی ١٩٧٠ لە ژمارە "٣٢"ی ڕۆژنامەی " هاوکاری" دا بڵاوی کردۆتەوە. دوا بەدوای ئەوەش لە ساڵی ١٩٧١ دا کتێبێکی زۆربە نرخی بەناوی " کاروانێک لە شەهیدەکانی کوردستانی ئێران " بڵاو کردەوە.

ساڵی ١٩٧٤ یش مامۆستا هێمن لە پێشەکی دیوانی" تاریک و ڕوون " دا لە دوو توێی بیرەوەرییەکانیدا گەلێک ڕووداو و بەسەرهاتی گرنگی مێژووی حدکای یاداشت کردبوو و ڕوشنایی خستبووە سەر زۆر لایەنی مێژووی ئەو حیزبە.

ساڵی ١٩٨٥ دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوو بەرگی یەکەمی کتێبی " چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی" ی بڵاوکردەوە، کە لە دوو فەسڵ دا کورتەیەکی مێژووی حدکای نووسیبوو و ڕوشنایی پێویستی خستبووە سەر گەلێک لایەنی مێژووی هاوچەرخی کوردستانی ئێران و بە وردی دەربارەی کۆمار و پێشەوای نووسیبوو.

ساڵی ١٩٩١، حدکا فەسڵی سێهەمی " چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی" کە دوکتور قاسملوو بەر لە شەهیدبوونی بە ماوەیەکی کەم نووسیبووی، چاپ کرد و بڵاوی کردەوە. کە لەم فەسڵەدا دوکتور قاسملوو ئاماژەی بۆ ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی کوردستانی ئێران پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان کردووە و دەربارەی پاشماوەکانی حیزب لەو هەل و مەرجە دا و هەوڵی زیندوو کردنەوەی حیزب نووسیویەتی و سەرەنجام هەتاکو ڕووخانی حکوومەتی "مصدق"ی هێناوە.

هەر لەم ساڵانەی دواییدا مامۆستا کەریمی حیسامی چەند بەرگێکی لە بیرەوەرییەکانی لەوڵاتی سوید بڵاوکردەوە. کە لەڕێگای بیرەوەرییەکانییەوە گەلێک رووداو و بەسەرهاتی مێژووی حدکای بەسەر کردۆتەوە و گەلێک بەڵگەنامەشی لەگەڵدا بڵاوکردۆتەوە، ئەوەش ئەوەندەی تر نرخی بیرەوەرییەکانی زیاد کردووە.

ساڵی ١٩٩٥یش مامۆستا عەبدالله حەسەن زادە بە بڵاوکردنەوەی " نیو سەدە تێکۆشان " گەلێک کەلێن و بۆشایی مێژووی حدکای پڕکردەوە. کە ئەم کاردی مامۆستا عەبدوڵلا حەسەن زادە بە تەواوکەری " چل ساڵ خەبات "ی د.قاسملووی شەهید دادەنرێت.

لەم دواییانەشدا مامۆستا جەلیل گادانی کتێبێکی زۆر سەنگین و بەنرخی بەناوی " ٥٠ ساڵ خەبات و کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران" (بەرگی یەکەم) بڵاوکردەوە.

ئەم کتێبە بە نرخەی مامۆستا جەلیل بریتییە لە شەش فەسڵ، کەلە سەرەتای دامەزراندنی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)ەوە دەستی پێکردووە و هەتاکو کۆنگرەی حەوتەمی حیزب، واتە هەتاکو ناوەڕاستی ساڵەکانی ٨٠ی هێناوە.

من لەلای خۆمەوە پاش خوێندنەوەیەکی وردی ئەو کتێبە دیتم هەندێک کەلێن و بۆشایی کەوتوونەتە فەسڵەکانی(١، ٢، ٣)وە، کە بەهیچ جۆرێک لە سەنگ و بەهای کتێبەکە کەم ناکەنەوە.

سەرەتا نیازم وابوو نامەیەکی تێروتەسەل بۆ مامۆستا جەلیل گادانی بنووسم و هەموو سەرنج و تێبینییەکانی تیادا بخەمەڕوو بەو ئومێدەی لەبەرگی دووهەم دا یان لەچاپی دیکەی ئەم بەرگەدا کەڵکی لێ وەربگرێت. پاشان هاتمە سەر ئەو باوەڕەی مادام کتێبەکە لێرە (لە کوردستانی عێراق) بڵاو کراوەتەوە و کەوتووەتە دەست گەلێک کەس و لایەن، باشتر وایە سەرنج و روونکردنەوەکانم لە گۆڤارێک یان لە رۆژنامەیەکدا بڵاو بکەمەوە هەتاکو ئەو کەسانەش کە کتێبەکەیان خوێندۆتەوە و جێی بایەخیان بووە سوودی لێ ببینن.

مامۆستا جەلیل لە پێشەکی کتێبەکەدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لەنووسین و ئامادەکردنی ئەم بەرگەدا چەند کەسێک هاوکارییان کردووە، تەنانەت کاک عوسمان رەحیمی و کاک هاشم رۆستەمی دوو فەسڵیشیان ئامادە کردووە (بەڕای من دەبوا مامۆستا ئەو دوو فەسڵەی دەست نیشان بکردایە).

لە فەسڵی یەکەم دا سەرەتا کورتەیەکی مێژووی سیاسیی کوردستانی ئێرانی نووسیوە

و پاشان ئاماژەی بۆ چەند ڕووداوێکی مێژووی هاوچەرخی نەتەوەکەمان کردووە. ئینجا بە کورتی دەربارەی ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراوە سیاسییانەی نووسیوە کەبەر لە دامەزرانی کۆمەڵەی " ژ.ک " لە کوردستانی ئێران دا چالاکییان هەبووە. دوایی زۆر بە کورتی دەربارەی " حیزبی ئازادیخوازی کوردستان"ی نووسیوە و زانیارییەکی کەم و کورتی سەبارەت بەو حیزبە تۆمار کردووە.

بە باوەڕی من دەبوا مامۆستا جەلیل بە شێوەیەکی تێر و تەسەل دەربارەی ئەو حیزبەی بنووسیایە و ڕۆشنایی تەواوی بخستایەتە سەری، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە:

یەکەم: هەرچەند بەر لە دامەزراندنی حیزبی ئازادیخوازی کوردستان، لە کوردستانی ئێراندا چەند کۆمەڵە و ڕێکخراوێکی سیاسی هەبوون و چالاکییان نواندبوو، بەلام هیچ کامیان وەکو ئەو حیزبە بە دیسپلین و خاوەن بەرنامە و در و شمی دیار و ستراتیژیی نەبوون. لەبەر ئەوە حیزبی ئازادیخوازی کوردستان بەیەکەمین ڕێکخراوی سیاسیی "منظم" لە مێژووی کوردستانی ئێراندا دادەنرێت.

دووەم: هەروەک زۆر لە شارەزایانی مێژووی کۆمەڵەی "ژ.ک" و حدکا قامکیان لەسەر داناوە، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان"ژ.ک" لەسەر بنەماکانی حیزبی ئازادیخوازی کوردستان دامەزراوە و حیزبی دیوکراتی کوردستانیش لەسەر بنەماکانی کۆمەڵەی ژ.ک دامەزراوە، کەواتە بەو پێیە حیزبی دیوکراتی کوردستان لە بنەڕەتدا لەسەر بنەماکانی حیزبی ئازادیخوازی کوردستان دامەزراوە. عەبدولڕەحمانی زەبیحی کە یەکێک بووە لە دامەزرێنەران و ئەندامە چالاکەکانی هەرسێ حیزبەکە لەم ڕووەوە نووسیویەتی:[1]" ئەم سێ حیزبە، حیزبی ئازادیخوازی کوردستان، کۆمەڵەی ژ.ک، حیزبی دێموکراتی کوردستان، لە واقیعدا تەنها یەک حیزب بوون بەلام لە سێ هەلومەرجی جیاوازدا، هەلومەرجی پێش بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهان و هەلومەرجی پاش چوونی هێزی سۆڤیەتە سوێندخۆرەکان (بۆ ئێران) و لابردنی ڕەزاخان و هەل و مەرجی پاش جەنگ. چالاکیشی سێ ئەڵقەی پەیوەست بەیەک لە خەباتی گەلی کورد دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم پێک دێنێت.....[2]"

١- رد علي كراس السيد أرشي روزفلت، عبدالرحمن زبيحي، جريدة (خەبات)، العدد١٩٢، الجمعة، ١٨مارت ١٩٦٠، ص ٢ .

٢- وێدەچێ مەبەستی کاک هوشەنگ لە سوڤیەتە سوێندخورەکان هێزەکانی متفقین بێ. (گادانی)

سێهەم: زۆربەی ئەندام و رابەرەکانی حیزبی ئازادیخوازی کوردستان بوون کە کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانیان دامەزراند و هەر ئەوانیش لە دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان دا رۆڵی گەورە و بەرچاویان بینی. پاشان لە کۆماری کوردستانیش دا پلە و پایەی جۆربەجۆریان درایە.

لێرەدا بە پێویستی نازانم سەبارەت بە حیزبی ئازادیخوازی کوردستان بنووسم، چونکە لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر نووسیوە و هەروەختێک دەرفەتم بۆ هەڵکەوت بڵاوی دەکەمەوە، ماوەیەک لەمەوپێشیش کورتەیەکی ئەو لێکۆڵینەوەیەم لە هەفتە نامەی " ئاڵای ئازادی" دا بڵاوکردەوە.[3]

بەڵام ئەوەی بە پێویستی دەزانم ئاماژەی بۆ بکەم ئەوەیە ئێستا و دوا هەمق وایە کەباس لەدامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان کرا یەکسەر لە (کۆمەڵەی ژ.ک)ەوە دەست پێنەکرێ و بەرلەو ئاماژە بۆ حیزبی ئازادیخوازی کوردستان بکرێت و ئەو بە بنەمای بزانرێت.

مامۆستا جەلیل لە بەشی یەکەمی (فەسڵی دووهەم) دا کە باسی هەل و مەرجی ئێران و وەزعی حیزب پاش رووخانی کۆماری کوردستانی کردووە، ئەوەی روون کردۆتەوە کە (هەر بەدوای لە سێدارەدانی پێشەوا و هاورێیانی، لە مەهاباد و هێندێک شاری دی) وردەوردە جموجووڵی سیاسی دەستی پێکردەوە و هێندێک لە ئەندامانی حیزب هاتنە سەر ئەو قەناعەتە کە دەبێ رێکخراو سازکەنەوە. ئەوەبوو سەرەنجام کۆمەڵێک لە لاوە خوێنگەرمەکانی حیزب بە هاوکاریی حیزبی توودەی ئێران سەرلەنوێ "حیزبی دیموکراتی کوردستان"یان بووژاندەوە...

بەرای من دەبوا مامۆستا جەلیل لێرەدا ئاماژەی بۆ ئەوەش بکردایە کە هەر ئەودەم هەندێک لە ئەندامانی حیزب هاتبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە پێویستە حیزبێکی نوێ دابمەزرێنرێت کە لە پاڵ مەسەلەی ئەتەوایەتی دا مەسەلەی چینایەتیش لەبەرچاو بگرێ و سەرسەختانە دژی ئاغا و دەرەبەگ بجەنگێ، ئەوان پێیان وابوو کە یەکێک لەکەم و کووڕی و هەڵەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان ئەوەبوو کە رێگەی داوە ژمارەیەکی زۆر

---

٣- بروانە: ئاوڕدانەوەیەک لە حیزبی ئازادیخوازی کوردستان، هۆشەنگ تۆفیق، ئاڵای ئازادی، ژمارە ١٩٨ (یەک شەممە ٣/١٢/١٩٩٥) و ژمارە ١٩٩ (یەک شەممە ١٠/١٢/ ١٩٩٥).

له ئاغا و دەرەبەگە خوێنمژەکان بێنە ڕیزەکانییەوە، کە لە حاڵێکدا دەبوا نەک ڕێگای ئەوەی پێ نەدابان، بەڵکو سەرسەختانە دژایەتیشی بکردبان، ئەمانە دواتر "کۆمەڵەی کۆمۆنیستی کوردستان"یان دامەزراند، کە زۆر تەمەن درێژ نەبوو!![4]

هەر لەو سەرووەختەشدا هەندێک لە ئەندامانی حیزب هەوڵیان دەدا کۆمەڵەی ژ.ک زیندوو بکەنەوە و درێژە بەهەمان ڕێباز و شێوازی خەباتی ئەو کۆمەڵەیە بدەنەوە.[5]

لەبەشی سێیەم (فەسڵی سێیەم) (لاپەڕە ١٣٠) دا سەبارەت بە تیرۆرکردنی ڕووناکبیری تێکۆشەر و شۆڕشگێڕ " صدیق ئەنجیری ئازەر " کە ئەندامێکی چالاک و لێهاتووی حدکا بوو نووسیویەتی: " کاک صدیق ئەنجیری کە بۆ ماوەیەک دەچێتە لای چۆمان بۆ سەردانی کاک خالید حیسامی و مامۆستا هەژار و مامۆستا هێمن کەلەوێ دەژیان و هاوکاریی ڕادیۆی پارتییان دەکرد، بەداخەوە پاش بەینێک بە شێوەیەکی ناجوامێرانە بێ سەروشوێن دەکرێ. لەگەڵ ئەوەی هەم هاوڕێیانی حیزبی و هەم باوکی پیر و بەجەرگ و زەحمەتکێش و خەباتکاری دوای پێ و شوێنی کەوتن، بەتەواوی ڕوون نەبووەوە بەدەست کێ و چۆن شەهید کرا، بەڵام دەنگۆی بەهێز هەبوو، چونکە پیاوێکی زانا و تێکۆشەر و شۆڕشگێڕ بووە، ئەچووەتە ژێر ئەنسیری ئەحمەد تۆفیق، ناوبراو کاک صدیقی بەڕەقیبی سیاسی خۆی زانیوە، دوورنییە بە پیلانی ئەو تێدا چووبێ، هێندێک مرۆڤی کەم بڕواش لە نزیکانی ئەحمەد تۆفیق دوای ئەم ڕووداوە خۆیان تەحویلی ڕێژیم داوەتەوە کە پێشتر وازیان لە پێشمەرگایەتی هێنابوو، ئەوەش گومانەکە بەهێزتر دەکا".

سەرنج دەدەین مامۆستا جەلیل گومانی هەیە لەوەی کە صدیق ئەنجیری ئازەر بە بڕیاری ئەحمەد تۆفیق کوژرابێت!

لە واقیعدا هیچ گومانی ناوێت کە صدیق ئەنجیری بەپێی دەستوور و ئەخشە و پلانی سەید عەبدوڵڵای ئیسحاقی (ناسراو بە ئەحمەد تۆفیق) و بەدەستی سەید حەسەنی برازای

---

٤- سەبارەت بە " کۆمەڵەی کۆمۆنیستی کوردستان" بڕوانە: جنبش ملی کرد، کریس کوچرا، ترجمه: ابراهیم یونسی، موسسه انتشارات نگاه، تهران، ١٣٧٣، ص ٢٢٩. (هەروەها بڕوانە: چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی، فەسڵی سێهەم، چاپی یەکەم، ١٩٩١، ل ١٥)

٥- عەبدلڕحمانی زەبیحی و غەنی بلوریان و محەممەدی شاپەسەندی بەدەرکردنی ژمارە(١٠)ی گۆڤاری " نیشتمان" لە ساڵی ١٩٤٨ دا ویستیان درێژە بە خەبات و تێکۆشانی کۆمەڵەی ژ.ک بدەنەوە بۆیە هەمان ئۆرگانی پێشوویان دەرکردووە.

له گـوندی لێـوژێ لـه ناوچەی ناوەدشت تیـرۆرکـراوە. ئەم ڕاسـتـیـیـەش لەچەند جـێـدا تۆمارکراوە و گەلێک کەسیش " تفاصیل"ی ئەو ڕووداوە دەزانن!!. [٦١]

**سەرەتای حوزەیرانی /١٩٩٦**

(لەبەر ئەوەی کە نامـەی کـاک مـەلا رسـول پێـشـنـمـاز زۆر درێژ بوو هێندێک بەشی ڕەبتی بە کتێبی پەنجا ساڵ خەباتەوە نەبوو، چەند بەش لە نامەکەی لە ژێرەوە دەخەمە بەر چاوی خوێنەرانی بەڕێز).

**بۆ برای بەڕێز کاک جلیل گادانی:**

ئەو کاتەت باش وێڕای هەواڵ پرسی هیوام وایە بە ساغ و سەلامەتی و بێ دەردەسەری گەیبیەوە لای برادەران و کۆڕی خەبات. کاکی بەڕێز دوای ئەوەی لە ماڵی خۆمان لوتفت کرد و کتێبەکەت پێشکەش کردم ئەمکردە خۆ مات کردن و بە چوار پێنج شەو و ڕۆژان زۆر بە وردی خوێندمەوە، خوا هەڵناگرێ زۆر لە ئەوانیتر واقع بینانەتر و پوخت ترە، بەتایبەتی لە بارەی سـمـایلی قـاسـملو و دەورانی زیندان دا. هەروەک بۆ خـۆشت نیـشـارەت پێ کردووە، شتی ناوا مێژوویی و دووروودرێژ بێ کەم و کووڕی نابێ.

جا ئەمن کە ئەو شـتـانە دەخـوێنـمـەوە مـیـعـیـارێکم هەیە ئەویش ئەوەیە کـەسـێک جەریانەکانی پێش ڕاپەڕینی خەڵکانی ئێران و تۆزێک پێشتری لە بیر نەمابێ و بەڵگە و دیکۆمێنتیش بەدەسـتـەوە نەبێ چۆن شـتـەکـانی ١٣٣٨ هەتا ١٣٤٨ و هەتا زیندان و دواتری لە بیرە؟

بۆیە پێم وایە مامە غەنی زۆرتر ویـسـتوویەتی پاکانە بۆ ئەوەی بکا کە کردی دەنا ئەو شـتـانەی بەرانبـەر بە حکوومـەتی عـێـراق و مزاکـەردوە نووسـیـویەتی هەمـووی لێڵ و قوڕاوییە.

لەسـەر نووسـینـەکـەی جەنابـیشـت هێندێک نەزەر و ڕوونکردنەوەی ڕاست و دروست و واقع بینانەم هەیە زۆریان بە شاهید و بەڵگەوە پێم خۆشە نێوە لە چوارچێوەی تەسکی تەشکیلاتی کە بەڕای من گەورەترین زەربەی لە حیزب داوە بێنەدەرێ. هەر بۆ ئەوەی فلان

٦- لەم ڕووەوە بڕوانە: (نیـو سەدە تێکۆشـان، عـەبدوڵڵا حـەسـەن زادە، نوتی١٩٩٥، ل ٤٢).
هەروەها بڕوانە (کـاروانێک لە شەهیـدەکانی کوردستانی ئێران، کەریمی حیـسـامی، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ١٩٧١، ل١١٧).ش

کەس نەورێ لە لاتانە و کارتان دەگەڵ دەکا چاوپۆشی لە هەمووشتێک بکەن و کەسانێکی کە لێتـان دوورن و کـارتان لەگەڵ ناکەن و بە سەداقەتەوە، بێ ئەوەی سـەریان بۆ لایەن و زۆرداریێک شـۆڕ کردبێ بیـانخـەنە پشت گـوێ کاری زۆر بەکـەڵک و موسـبـەتیشی کـە بۆ حـیـزب کـردیێ بە فـەرامـۆشی بسـپـێـرن. لە سـەرچوون و نەچوونمان بۆ کـۆنگرەی (٢) راستییەکە ئاوا بوو:

پێش کـۆنگرەی سـاڵی ١٣٤٢ ی هەتاوی سـەردتای ئاکـۆکی ئێـمـە دەسـتـەیەک بەو ناوانەی ژێرەوە گـەڕاینەوە ناوخـۆ بەمەبەسـتی فەعالیـەت و زیندوو کردنەوەی کومیـتـە و حەوزەکانی حیزب (کاک سلێمان معینی، مینە شەم، عەبدول ئەستانی، کەریم ئەستانی و بۆ خۆم. لەو گەشتەمـان دا لە ناوچەی سـەردشت کومیـتـەی (بولفەقان) بۆ دانان کە مەلا ئەجـمەددین کەوکەبی بەرپرسی بوو.... لەناوچەی مەنگوڕایەتی کومیـتەی گۆڕموسـامـان دامەزراند کە ئەویش هەر مەلایەک بەرپرسی بوو.

لە مەهاباد کاک ئەمیری قازی پێوەندی پێوەگرتێن و لە سیاقوڵیش محێدین ئاغا هاتە لامـان و لە لایەن برادەرانی تارانیـشـەوە هاتبـوو. لە شـامـات و چۆمی مـەجـیـد خـانەوە پێوەندیان بەزۆر کەسەوە گرت و لە قاقلاوەش سەعدی حاجی بایز ئاغا و زۆر کەسی دیکە هاتن بۆ لامـان و لەوانیش رێکخراوێک پێک هات. بەلای بانە و گـلـولان و بەشی زۆری گەورکایەتی دا گەڕاینەوە. ئەوانی وەک ئەندامانی کومیتەکان دامان نان زۆربەیان ماون و پێویست بە ناوهێنانیـان ناکا. ئێـمە سێ مانگمـان پێ چوو. ئاغایەکی خانێ لە ناوچەی لای قـوێـتـەل و خـەلیـفـان راپۆرتی لێ داین ئەرتەشـێـکی زۆرمـان وسـەر گـەڕا بەڵام هەرچۆنێک بوو بە سەلامەت دەرباز بووین.

بەدوای گەڕانەوەی ئێمەدا ئەحمەد توفیق و برادەران ئومێدێکیان وەبەرهات و کەوتنە بیری ئەوەی کۆنگرەیەک بگرن کەچی کاتی پێک هاتنی کۆنگرە بە هۆی ئەوەی کە ئێـمە لەگـەڵ ئەحـمـەد توفـیـق بەربەرەکـانێـمـان کـردبوو بانـگ نەکـرابووین بۆ کـۆنگرە، بەڵام ئەو کەسانەی کە من داوام لێ کردبوون بۆ ناو ریزی حیزب و کومیـتەمان لێ پێک هێنابوون دەعـوەت کرابوون. کاک سەید حەسەن هاشمی دەعـوەتی لێ کرابوو بەڵام بەبێ ئێمە حازر نەبوو بچێ. دوایی لەسـەر داوای هەمـووی ئێـمـە ناردمـان بۆ کـۆنگرە و هەر بەویش دا نامـەیەکمـان بۆ کۆنگرە نـووسی و داوامـان کـرد ئێـمـە بەحەقی خۆمانی دەزانێن بەشداری کۆنگرە بین و لەوێش بەرەو روو لەگەڵ ئەحـمەد توفیق کێشـەکانمان باس بکەین و کۆنگرە هەرچی بڕیاری دا ئێمە قەبوولی دەکەین.

دوای ئەوەی وەڵامی رەدیان داینەوە ئێمە نێزیک دوازدە سێزدە کەس بەو ناوانەی خوارەوە بەرەو کۆنگرە لە قەڵادزێ را وەڕێ کەوتین:

١- کاک حەسەن رستگار. ٢- مینەی سراجی. ٣- سالار حەیدەری.

٤- سمایلی شەریف زادە، ٥- قادر قازی، "مامەند". ٦- میرزا خدر مەردسەنە. ٧- فەقێ رەسوو زیوەیی. ٨- رەشید سمێڵ (رەحمان شیلمجاران). ٩- عوسمان عەزیزان. ١٠- وسێن ئاغای سیسیرێ. ١١- سەید فەتتاحی نیزامی. ١٢- خەلیل شەوباش. ١٣- بۆ خۆم.

سێ کەسمان تفەنگمان پێ بوو، کاتێک گەیشتینە نێزیک کۆنگرە، تفەنگچییەکانی ئەحمەد توفیق لێیان لە چەخماخ داین و لێمان دامەزرابوون. هەر کە دەنگیان داین و بوو بە راپسان داپسان میرزا خدر و فەقێ رسووی زیوەیی کە چەکی پێ نەبوو بەسەر بەردێری دا دایان قەڵاشتە خوار و هەڵاتن. میرزا خدر دەگەڵ هەڵاتنەکەی هاواری دەکرد کوڕە کاک حەسەن تەقەم لێ مەکە ئەمن شەڕێ ناکەم. ئەوانەی کۆنگرە کە ئەوەیان زانی بەلایەکی دیکەدا خۆیان گەیاندە میرزا خدر و بردیان بۆ کۆنگرە. مەبەست لە کاک حەسەنیش کە میرزا هاواری بۆ دەکرد حەسەنی برازای ئەحمەد توفیق بوو کە گوایە بەرپرسی جەماعەتەکە بوو.

باسی شەڕی (٣) مانگە دەنووسی، لەوەی کە بۆخۆت ئاگات لە هێندێک شت نەبووە و خەڵکی دی گوتوویانە یا نووسیویانە قسەم نییە، بەڵام ئەو هەموو قارەمانەتییەی پێشمەرگەکانی مەهاباد کردیان هەروا بە سووک و هاسانی بۆ بەسەر بازدان دا نایێ. لە خۆم باشتر دەزانی بەرپرسی گشتی پێشمەرگەی حیزب ئەمن بووم و ئەندامی کومیتەی ناوەندیش بووم. دیارە سەرگورد عەبباسی، سەرگورد کەریم عەلیار و جاوید فەرپش (هەژار) کە دوایە هات بەشداربیان کردووە و هاوکار بوون.

دەستەی شەپۆل و تۆڵە کە هەر یەکەی لە هەشت کەس تێ ئەدەپەڕین سابلاغیان وەزاڵە هێنا. تەنانەت (لۆمۆند) لەسەر ئازایەتی گرووپی شەپۆل نووسیبووی.....

نامەی مەلا عەولام لا مەوجودە کە لە ئاشی پشکاوێ را بۆ منی نووسیوە بۆ کاوڵان و نامێد کە چۆن خۆ بە قوربانی خۆم و کوڕەکانم دەکا و پێشمەرگەکانی بە کوڕی خۆم ناوبردوون و دەڵێ زۆر زوو ئازایەتی و قارەمانەتی خۆت و کوڕە بەجەرگەکانت شاری هەڵمەت و قوربانی سولەیمانییتان بەجێ هێشت و حەماسەتان خوڵقاند. لەلایەکی دیکەوە نامەی دوکتور قاسملووم هەیە کە بەعەینی تاریخ و رۆژ نووسیویەتی " کارێکی وا بکە

پێشمەرگەکان حەوتووی جارێک دەست لە مەهاباد و دەوروبەر بوەشێنن نەک هەموورۆژێ چونکە بۆخۆت دەزانی ئێمە ئەو تەقەمەنی و موهیماتە چەند بە زەحمەت وەدەست دێنین ".

لە لایەکی دیکەشەوە ئێمە کە زیبا کەلامان لە مەهاباد هێنا دەرێ، حەوتوێک چاوەڕوان بووین کەس لە دەفتەر را نەهاتە کاولان یا چوارگا کە لەو دوو گوندانە رامانگرتبوو. هەتا ناردم کاک حەسەن بابا تاهیری هاتە کاولان و بۆ نیشان دانی نییەت پاکی خۆمان تەحویلی ئەوم دایەوە. دوایەش کە مەهابادمان گرتەوە بۆ خۆم چووم لە پشکاوێ را دوکتور قاسملوو و میوانەکانی (کریس کوچرا و ژنەکەییم) هێناوە مەهاباد و دوکتور لە میتنگێک دا کە ئامادە کرابوو لەبەیکی بۆ پەیامی خومەینی گوت.....

لە باسی کۆنگرەی پێنج دا دەبوایە ئیشارەت بەو قسانە کردبا کەمن بە حزوری خۆی لەسەر دوکتور قاسملوو کردم.

لەسەر کۆبوونەوەی برایمە چی وات نەنووسیوە. راستی مەسەلەکە ئەوەبوو هەروەک دوایەش روون بۆوە ئەمن هیچ کەینە و بەینەم دەگەڵ مامە غەنی نەبوو. ئەو تەسلیم تەڵەب بوو حیزبی تووەدەشم بە هیچ نەدەزانی بەڵکو پێم جاشی سیاسی بوون. زۆریشم دادەڕۆ لەبەر کاک مینەی سراجی کرد کە ئەو کارە نەکا بێ فایدە بوو. مامە غەنی کە ترسی هەبوو ئەگەر شت بڵێ رەنگە لەوێ بیگرن، بە درۆ بە منی گوت لە برایمە کۆبوونەوە هەیە و مشاورەکانیش بانگ کراون بەلام تۆ بانگ نەکراوی کە هەقی خۆتە و مشاوری. منیش پێم سەیر بوو زیاد لە هەموان من بانگ نەکرابم، بۆ روون کردنەوەی مەسەلەکە هاتبووم. کە بۆم دەرکەوت هیچ کام لە مشاورەکانی لێ نییە و داوایەکی دیکەشم لە مەڕ خۆم و دوکتور قاسملوو هەبوو، پلینوم بە قسەی نەکردم و گەڕامەوە......

کاکە گیان دیسانیش تیکراری دەکەمەوە بە بێ هیچ نان بە قەرز دانێک بە رای من کتێبەکەت زۆر شتی باشی تێدایە و زۆر لە هی ئەوانیتر واقع بینانەترە، لەگەڵ ئەوەی کەم و کووڕی خۆشی هەیە هیوادارم لە بەرگی دووەم دا بتوانی جوبرانی کەم و کووڕییەکان بکەیەوە.

نیتر هەربژی بە شادی و سەلامەتی

**بـرات: رەسول پێشنماز**

**سوێد – ڤیستراس**

**١٩٩٧/١١/٢٥**

## کاک جەلیلی بەرێز:

لە پێش هەرشتێکدا زۆر سوپاستان دەکەم کە ئەو هەلەتان بۆ پێک هێناوین کە بتوانین مێژووی ٥٠ ساڵی رابردووی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران باشتر بناسین. ئەگەر ئەو کەسانەی کە هەرکام بە شێوەیەک لە جەرەیانی رووداوەکان دا بوون، باسیان بکەن، وردە وردە مێژووی گەلەکەمان، لانی کەم لە سەدەی بیستەم دا، کەم تا کورت دێتە سەر کاغەز و وەکو بەڵگەیەکی مێژوویی بۆ رۆڵەکانی کورد و غەیری کورد بەجێ دەمێنێ. پێم وایە هەموو ئەو کەسانەی لەسەر مێژووی کورد تەحقیقیان کردووە دان بەسەر ئەو راستییەدا دەنێن کە بەڵگە و نووسراوە لەلایەن کوردەکانەوە زۆر کەمە و گەلێک جار، کورد ناچارە، گەلی خۆی لە چاوی بێگانەوە تەماشا بکا و لە لێکۆڵینەوەدا روانگەی وان لەبەر چاو بگرێ. جا بۆیە جگە لەوەی کە کتێبی ئێوەش بەڵگەیەکی بەنرخ و بەرێزە، جێگایەکی تایبەتیشی هەیە وەکو هەموو ئەو کتێب و نووسراوانەی دیکە کە بەدەستی رۆڵە کوردە دڵسۆزەکان نووسراون، هەر سەرکەوتووبن.

جا ئەوە ئێوە و ئەوەش رەخنەکان و یا لە راستی دا، هێندێک روونکردنەوەی مێژوویی:

١- لەلاپەرە سێزدەی کتێبەکەتان دەڵێی: سنووری رووسیا لە سنووری کوردستان نێزیک بۆتەوە. ئەوەی راستی بێ لەباری مێژوویی، کورد خاکی لە نێزیک و دەوروبەری رووسیا نەبووە. لەراستی دا ئەوە خاکی ئەرمەنە کە لەپاش شەرەکانی تورک و رووس دا لە مابەینی ئەو دوو وڵاتە دابەشکراوە. لە دوای شەری نێوان سەفەوییەکان و تورکەکانی عوسمانی، وردە وردە هێندێک عەشیرەتی کورد لەبەشێک ناوچەی ئەورۆی کوردستانی باکووردا نیشتەجێ کراون و بەشێکیان لەخاکی گەلی ئەرمەن داگیر کردووە. بەو شێوە لەسەدەی شازدە بەولاوە، هێندێک عەشیرەتی کورد لە ناوچەی بایەزید و باکووری ماکۆی (ئەورۆ) و دەوروبەری ئەوێ نیشتەجێ کراون بەدەستی سەفەوییەکان. تورکەکانی عوسمانیش بەنۆرەی خۆیان هێندێکیان عەشیرەتی کورد لەو ناوچەیەدا جێگیر کردوون و وردە وردە دایانمەزراندوون. دیارە ئەو کاردساتە چوار سەدەی بەسەردا هاتووە و ئێستا ئەو ناوچانە بە خاکی کوردان لەقەڵەم دەدرێن، لەباری مێژووییەوە بەشێکی خاکی ئەرمەنیشیان لەگەڵە.

لەپاش شەری یەکەمی جیهانی، وەختێک کۆنفرانسی ئاشتی لە شاری (سێور)ی

دەوروبەری پاریس لە فەرەنسا دا پێک هات، دەستەی نوێنەرانی ئەرمەنی نەخشەیەکیان پێشکەشی کۆنفرانسەکە کرد کە لەباری مێژووییەوە تەواوەتی ولاتی ئەرمەنی دەگرتەوە و شامیلی بەشێک لەو خاکەش بوو کە کوردی لێ دەژیا. شەریف پاشاش نەخشەیەکی لەلایەن کوردەکانەوە پێشکەشی کۆنفرانسەکە کرد کە ئەویش بەشێکی لەخاکی ئەرمەنی دەگرتەوە. مەسەلەی خاک لە نێوان کورد و ئەرمەنیدا کێشەیەکی مێژووییە کە ئەگەر زەمانێک باسی بکرێ دەبێ بە وردی دوکیومێنتەکان و نەخشەکانی ئەو کاتە و کاتەکانی پێشوو لەبەر چاو بگیرێ. دیارە مێژوونووسە کوردەکان زۆر جار نەیانویستووە، یان نەیانوێراوە باسی ئەو راستییە مێژووییە بکەن ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە هەموو گەلەکانی دنیا دڵیان بە خاکی خۆیانەوەیە و پێیان خۆش نییە کەس باسی ئەو راستییانە بکا کە رەنگە رۆژێک بە قازانجی ئەوان تەواو نەبێ. لە ئەنجام دا دەتوانین بڵێین کە ئەگەر گەلی ئەرمەنی داوای بەشێک لەو خاکە دەکا کە ئەورۆ کوردی تێدا دەژی بەبۆنەی بەڵگەی مێژووییەوە، دەبێ ئەو راستییەش لەبەرچاو بگیرێ کە کوردیش لە چوار سەدە لەوەی بەر لەسەر ئەو خاکە دەژی و بەقەولی فارس دەڵێن: حەقی ئاو و گڵی هەیە.

سەبارەت بە کوردەکانی رووسیا دەتوانین بڵێین کە لە پاش شەڕەکانی نێوان تورکەکانی عوسمانی و رووسەکان بەشێک لە کوردەکان بۆ لای رووسییا هەڵاتن و هەر لەوێ نیشتەجێ بوون. بەو شێوە کورد قەت خاکی لە رووسیە دا نەبووە، بەڵام کۆمەڵێکی کورد لە ولاتەکانی ئەرمەنستان و ئازەربایجان و قازاقستانی شورەوی سابیق دا دەژین و شوێنەوار و کەلتووری خۆیان پاراستووە.

- هەر لەلاپەڕەی سێزدەدا سەبارەت بە پەیمانی لۆزان:

پەیمانی لۆزان کە لەساڵی ١٩٢٣ لە شاری لۆزان لە سویس لە نێوان ولاتە سەرکەوتووەکان و تورکیای کەمالیدا گیراوە، هەر باسی کوردی نەکردووە. لەو پەیمانەدا بە پێچەوانەی پەیمانی سێڤر باسی نەتەوەکانی غەیری تورکی ئیمپراتۆری عوسمانی ناکرێ. تەنیا کەمایەتییە ئایینییەکانی ئەو ئیمپراتورییە لەبەر چاو دەگیرێن ئەوانیش وەکو کەمایەتی ئایینی نە کەمایەتی میللی. مەسەلەی ئەرمەنەکان و ئاسوورییەکان وەکو کەمایەتی مەسیحی لەبەر چاو دەگیرێ. کوردەکان لەبەر ئەوەی کەبەشی زۆریان موسڵمانن، وەکو کەمایەتی لەبەر چاو ناگیرێن و باسیان ناکرێ. لەباسەکانی ئەو کۆنفرانسەدا، تورکەکان، کوردەکان وەکو برای ئایینی خۆیان لەقەڵەم دەدەن و وا نانوێنن کە مافێکی تایبەتی میللییان هەبێ. دیارە ئینگلیزەکان بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆیان

له ناوچەی موسڵ باسی نەتەوەی کورد دەکەن و دان بەسەر ئەوەدا دێنن کە کورد گەلێکی جیاوازە و تورک نییە. بەڵام بۆ رازی کردنی تورکەکانی کەمالی لە تورکیادا باسی کورد ناکەن و چاوی لێ دەپۆشن. کوردەکانیش لەوێ دەستەی نوێنەرایەتییان نییە و ناتوانن دیفاع لە مافی خۆیان بکەن.

- لەلاپەڕەی ٦٧ی کتێبەکەی دا، کاک جەلیل دەڵێ: کاک صارم خانی صادق وەزیری قازی دادگستری بوو. لەدوای ساڵەکانی ٣٢ و زیندانی کێشان لە زیندانەکانی شا، کاک صارم کاری قەزاوەتی وەلانا و بوو بەوەکیلی دادگستری.

- لەلاپەڕەی ٧٩: کاک جەلیل گیان پێشنیار دەکەم، لەو لاپەڕە و لە هەموو لاپەڕەکانی دیکە دا، نێوی شارە ئەورووپاییەکان و نێوی نووسەر و کتێب و مەدارکی ئەورووپایی، بەخەتی لاتین، بەزمانی فەرەنسی یا ئینگلیزی یان هەر زمانی دیکە کە پێویستە وەکو ئاڵمانی یا ئیتالیایی یا ئسپانیولی و هتد بنووسرێ زۆر باشترە. ئەو کارە بۆ ئەو بەشە لە کوردەکان کە لە وڵاتانی ئەوروپایی دا دەژین یا لەسەرچاوەکان کەڵک وەردەگرن و کاری لێکۆڵینەوە دەکەن زۆر بەنرخە.

لە لاپەڕە ٢٢٠ی کتێبەکەدا باسی تەرحی ٢٦ مادەیی دەکرێ. ئەو تەرحە، سەبارەت بە خودموختاری کوردستانی ئێرانە و ئی صارم خانی صادق وەزیری بوو. وەختێک وەفدی حکوومەتی جمهوری ئیسلامی لە ساڵی ١٣٥٨ (١٩٧٩) لە پاش شەڕی سێ مانگە هاتن بۆ وتوویژ لەگەڵ نوێنەرانی گەلی کورد لە شاری مهاباد، کاک صارم ئەو تەرحەی ئامادە کرد و پێشکێشی دەستەی نوێنەرانی کوردی کرد.

سوهەیلای ماملێ

دیسامبری/ ٩٧

## رۆژهەلاتی کوردستان
## لە نووسینەکانی (جەلیل گادانی)دا [*]

جەلیل گادانی، (٥٠ساڵ خەبات کورتە مێژوویەکی حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران) بەرگی یەکەم ١٩٩٦ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان هەولێر ٣٦٦ لاپەرە.

وا ماوەیەکە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران بە کۆن و نوێوە، دەستیان بە نووسین و بلاوکردنەوەی بیرەوەرییەکانی خۆیان کردووە و بەشێکیان هەر ئێستا لەبەر دەستی خوێنەری کورد دان و بەشێکی دیکە بە دەست نووسینەوەدن. ئەم کارە، ئەگەر بۆ ئامانجی شەرە دەندوکە و ولامدانەوەی یەکتر و پووچانەوەی لایەنی ناحەز بەرێوە نەچێت، کارێکی بەسوودە و یارمەتی نەوەی داهاتووی خەباتکارانی کورد دەدات تا لاوازی و بەهێزیی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد باشتر بناسن و ئەزموونی دوێنێ بکەنە چرای رێنموونی سبەی.

کارەکە، دوابەدوای بلاوبوونەوەی بەرگی یەکەمی (چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی) دکتۆر قاسملووی شەهید دەستی پێکرد - ئەگەر چی کتێبەکەی ئەو، زیاد لەوەی بیرەوەری بێت مێژوولکەی حیزب و بە گشتی مێژووی سیاسی کوردستان و ئێران بوو، کە مخابن ناتەواو مایەوە.

هێندێک لەو کەسانەش کە دوای قاسملوو بیرەوەری خۆیان نووسی، بەهەمان شێوە بیرەوەری و مێژوونووسینیان ناوێتەی یەک کردوسنوورێکی دیاریکراویان بۆ ئەم دوو بابەتە دانەنا [**]

ئەو کتێبانەی کە بەرپرسانی ئەمرۆ و دوێنێی حدکا تا ئێستا بلاویان کردۆتەوە و من بە بەرچاوم کەوتوون بریتین لە:

١- عەبدولرەحمان قاسملوو (چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی)، بەرگی یەکەم، ١٩٨٥، فەسلی سێ هەم لەبەرگی یەکەم، ١٩٩١، چاپی حدکا.

٢- عەبدوللا حەسەن زادە (نیو سەدە تێکۆشان) بەرگی یەکەم، ١٩٩٥، بەرگی دووەم ١٩٩٦ چاپی حدکا.

٣- کەریمی حسامی (لەبیرەوەرییەکانم) ١٠بەرگ، بەرگی یەکەم ١٩٨٦، بەرگی دەیەم ١٩٩٦ چاپی نووسەر.

٤- کەریمی حسامی (پێداچوونەوە) بەرگی یەکەم ١٩٩٦، بەرگی دووهەم ١٩٩٧، چاپی هەرزان سوێد.

٥- سەعید کاوە (کوێستانی) "ئاوڕێک لەبەسەرهاتی خۆم و ڕووداوەکانی نێو حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران" ١٩٩٦، چاپی سوێد.
٦- جەلیل گادانی (پەنجا ساڵ خەبات - کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)١٩٩٦ چاپی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان- هەولێر.
٧- غەنی بلووریان، (ئاڵە کۆک) ١٩٩٧ ستۆکهۆلم.

ئاساییە ئەگەر کتێبەکان لە باری گێڕانەوەی مێژووەوە، تەواوکەری یەکتر بن و هەر کام بەشێوەیەک هەولیان دابێت مێژووی ڕووداوەکان لە ڕوانگەی خۆیانەوە بنووسنەوە، لە عەینی کاتدا ئەوەش نائاسایی نییە کە هەرکام خاوەنی بۆچوون و هەڵسەنگاندنی تایبەت بە خۆی بێت و لەم بوارەدا دژ بە بۆچوونی کەسەکەی دیکە بوەستێت، خۆ ئەگەر بۆچوونەکان جیاوازییان لەگەڵ یەکدا نەبوایە (تاقمی حەوت کەسی)و (لایەنگرانی کۆنگرەی چوار) و (ڕیبەرایەتی شۆڕشگێر) لە بەڕێنی سەرەکی حیزب جیا نەدەبوونەوە و حیزب شەق نەدەکرا. ئەوانەی کە ئاسایی نییە و خوێنەری بێ لایەن تووشی سەر سوورمان دەکات، هێرش کاری توندوتیژە بۆ سەر هاوسەنگەرانی حیزبی خۆیان و تەنانەت ئەم پووچاندنەوە و بێ ئیعتبار کردنە، لە نووسینی ژمارەیەکیاندا دەگاتە باس و خواسی منداڵانە و گێڕانەوەی شتی ئەوتۆ، کە ئیتر تۆی خوێنەر هیچت لە دەست نایەت بیجگە لە حەسرەت خواردن بۆ بزووتنەوەیەک، کە ڕێبەرایەتی دراوەتە دەست کەسانی وا کەم چیکلدانە و خۆخۆشەویست. یەکیان ئەوی دیکە تاوانبار دەکات، کە تەنیا لەسەر ڕاتبەی مانگانە پێنج دینار، خۆی لە ئەندامیەتیی حیزب کێشایەوە، ئەویش لە وەڵامدا، تاوانی ئەوە دەداتە پاڵ یەکەم کەس، کە ڕۆژنامەی لە ڕۆژنامە فرۆشان دزیوە!

هەر چۆنێک بێت، ئەم بیرەوەرییانە، ئاوێنەی باڵانوێنی لاوازیی و بەهێزیی بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانن و جیا لە هەندێک خاڵی سەلبی، دارماڵی زانیاری و مەعلوومات بۆ ئەوەی داهاتووی خەباتکاری گەلەکەمانن. هەڵسەنگاندنی ئەو مەعلووماتانە، ئەرکێکی مەزنە و بەراوردکردنیان لەگەڵ یەکتر، گەلێک پێویستە.

من لێرەدا هەوڵ دەدەم چاوێک بە یەکێک لەو بیرەوەرییانەدا بخشێنم، بەڵام زۆر بە پێویستی دەزانم ئەگەر کەسانێک بە ئەرکی بەراوردکاری و هەڵسەنگاندنی هەموویان هەستن. مانگنامەی (پەیام) دڵنیام ئامادە دەبێت هەر لێکۆڵینەوەیەکی بێلایەن لەسەر کتێبەکان، بە ئامانجی ڕوونکردنەوەی ڕاستی، بخاتە بەرچاوی خوێنەری کورد. لە

عەینی کاتدا منیش هەوڵ دەدەم لە ژمارەکانی داهاتوودا، یەک دوو بەرگی دیکە لەو بیرەوەرییانە شی بکەمەوە.

**٥٠ ساڵ خەبات – کورتە مێژوویەکی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران:**

کاک جەلیل گادانی روخسارێکی ناسراوی بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کوردە لە رۆژهەڵاتی کوردستان. کەسایەتی هێمن و میهرەبانی گادانی، کردوویەتە جێگەی رێزی کۆمەڵێکی زۆری خەڵک، زیندان و ئەشکەنجە و ئاوارەیی بەشێکی زۆری ژیانیان داگرتووە. ئەندامی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی حدکا و ئەندامی دەفتەری " سیاسی رێبەرایەتی شۆڕشگێر " بووە و ئێستا دوای یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی حیزب، ئەندامی دەفتەری سیاسی حدکایە. ئەو کەسایەتییە هێدی و لەسەرخۆیە بە گشتی لە بیرەوەرییەکانیدا خۆ دەنوێنێت، بەڵام ئەوەی بۆ خەڵکانی ناسیاوی گادانی سەرنجڕاکێش بێت، توندوتیژییەتی بە نیسبەت هاوخەبات و هاوسەنگەرانی خۆیەوە. نووسەر کە چاوێکی هەڵەپۆشی بۆ رێکخراوەیەکی وەک " موجاهیدینی خەلق " هەیە، لە باسی بەرپرسانی حدکادا، گەلێک بێبەزەییە و بە هەمان شێوە لەگەڵیاندا دەبزوێتەوە، کە بێگانە و تەنانەت دوژمنیش! بەو جۆرە لەگەڵیاندا نابزوێتەوە.

گادانی لە گێڕانەوەی مێژووی رووداوەکاندا، گەلێک سەرکەوتووە و کەمتر لاپەڕەیەکی کتێبەکەی هەن کە زانیارییەکی مێژوویی بە خوێنەر نەبەخشن. بەڵام لە هەڵسەنگاندن و تەفسیری رووداوەکاندا ئەو سەرکەوتووییەی نییە و تەنانەت هەندێک جار تووشی هەستێکی خۆبەزل زانی دەبێت. نووسەر، کە رووداوەکان لە زمانی سێیەم کەسەوە دەگێڕێتەوە، لە لاپەڕە ٢١٥ دا دەنووسێت: جەلیلی گادانی بەهۆی کار و تێکۆشانی زۆر بەرچاوەوە لە یەکەم کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندیدا ببووە مشاور " یان لە لاپەڕە ٢٠٣ دا دەنووسێت: دوکتور قاسملوو بۆ بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان غەریب و نەناسراو بوو، بەڵام لە پێش قسەکردنی (لە میتینگی ١١ی رەشەمەی ١٣٥٧ دا)، جەلیلی گادانی کە لە تارانەوە بۆ بەشداری لە میتینگ هاتبووە مەهاباد و بەڕێوەبەری ئەم میتینگەش بوو، دوکتور قاسملووی بە جەماوەر ناساند."

هەروەها، گادانی لەباسی موجاهیدینی خەلقدا، بۆچوونێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە لەگەڵ راستەقینە مێژووییەکاندا یەک ناگرێتەوە. موجاهیدین و فیدائیان و بەگشتی هەموو رێکخراوە چەپە ئێرانییەکان کاتێک روویان کردە کوردستان، کە ئیتر مانەوەیان لە

شارەکانی دیکەی ئێراندا نەدەگونجا و تەنیا کوردستان بوو، کە خەباتی گەل و خوێنی شەهیدان دەرەتانی ئازادییەکی کەم و زۆری بۆ کورد و غەیرە کورد خولقاندبوو. ئەو تاقمانە، بەتایبەت موجاهیدین، بۆ چرکەیەکیش هاوڕێیی خەباتی گەلی کوردیان نەکرد و ئەمانەت دۆستی وەستان. ئەوجا ئەگەر کاک جەلیل باسی "هاوکاری تەواو" لەنێوان حدکا و موجاهیدیندا دەکات (٢٢٦)، ڕاستی- یەکان دەشارێتەوە. بەڵام وانییە هەموو بۆچوونەکانی گادانیش لەم دەستە بن. هەڵوێست گرتنی بە نیسبەت دەوڵەتی عێراق و بەتایبەتی شەڕی ئەگریسی نێوان کۆمەڵە و دیموکراتەوە، ئازایانە و ڕوونە و ئەم شێوە بۆچوونە ڕاست ئەو شتەیە، کە لە گادانی چاوەڕوان دەکرێت.

سەبارەت بە شەڕی پاوە لە ٢٤ی گەلاوێژی ١٩٨٠ دا دەنووسێت: بەدەسیسەی کۆنەپەرستانی ڕێژیم و ساواکییەکان و هەندێک گومان لێکراوی سەر بەعێراق، شەڕێکی خوێناوی سازکرا(٢١)٧. لە پەیوەندیی شەڕی کۆمەڵە و دیموکراتیشدا دەنووسێت: ئەوەی جێگای داخ و کەسەر بوو دەکرێ بڵێین بووە هۆی گەیاندنی زیانێکی زۆر بە شۆڕش و گەلی کورد، سازبوونی شەڕ لە نێوان کۆمەڵە و حیزبدا بوو..... شەڕێکی خوێناوی و چەند ساڵەی نێوخۆیی هەڵایسا و ژمارەیەکی چەند سەد کەسی لەهەردوولا شەهید بوون.... ئەوەی ڕاستی بێت تەنیا دوژمنانی گەلی کورد سوودیان لێ وەرگرت،....ئەم کارساتە یەکێک لە خاڵە ڕەشەکانی خەباتی پڕ لە شانازیی شازدە ساڵەی گەلی کورد دژی کۆماری ئیسلامییە.....(١٤٩- ٣١٣).

بەڵام گادانی لە مەحکوم کردنێکی ساکاری شەڕ بەولاوە هیچی تر ناکات، نەهۆیەکانی شەڕ دەردەخات و نە بەرپرسانی ڕاستەوخۆی کارەکە لە هەردوو بەرە بۆ خوێنەر ڕوون دەکاتەوە- کارێک کە دەبوایە بکرێت بۆ ئەوەی ئەوەی داهاتوومان دەرسی لێ وەربگرێت. سەبارەت بە د. قاسملوو دەڵێت: " ئەندامانی کومیتەی ناوەندی گلەییان لێ هەبوو و بۆ هاوڕێیانی ک.ن جێگیر لە عێراق ببووە مایەی دەردەسەر (١٨٥).لە دەنگدانەوەی دوایی کۆنگرەی شەشەمدا، هێندێک هەڕەشە و تەماع وەبەرنان و ڕێککەوتن و نفووزی دوکتور بوونە هۆی ئەوەی " سوسیالیزمی دێموکراتیک" و " کورتە باسێک لەسەر سوسیالیزم" زۆربەی دەنگیان هێنایەوە. دوکتور بۆ یەکەم جار لیستەی فیکسی هێنایە گۆڕێ" ٧(٢٩).

دەربارەی غەنی بلووریان و کەریمی حیسامیش دەڵێت: کەوتبوونە لای یەک و خۆیان بەتەواوی لەسەر مەسەلەی وتووێژ لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا کردبووە کوێخای حیزب و

مەوقیفی حیزبیان لە وتوویژەکانی خۆیاندا لاواز نیشان دابوو (٢٢٠)، کاک غەنی لە کۆنگرەی چواردا لەخۆ بایی ببوو و حیزبی توودە بانگی شەیتانیی بە گوێدا دابوو، تووشی نامۆیی هاتبوو، بۆ خۆشی نەیدەزانی چی دەوێ و بۆ کوێ دەچی (٢٢٢). بەلام لە پەیوەندی دەوری پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق (قیادە موقتە) و شەڕیان لەگەڵ پێشمەرگەی حدکا دا، ڕێزیان دەپارێزێت و تەنیا ڕەخنە لە هەڵوێستیان دەگرێت: " بەهۆی هێندێک کردەوەی پارتی لە کوردستانی ئێران و دەست تێوەردانی برایانی پارتی لە کار و باری کوردستانی ئێراندا، ناکۆکی و ناتەبایی سازبوو کە تێکرا، زیانێکی زۆری بۆ هەردوولا بەتایبەت بۆ حیزبی ئێمە هەبوو. لەم بابەتەوە زۆر شت بلاوکراوەتەوە کە هێنان و نووسینیان جارێکی دیش زیانمان پێ دەگەیەنێ و بەم هۆیەوە چاوی لێ دەپۆشین... برایانی پارتی لەسەر دەرهێنانەوەی تەرمی سەرۆک بارزانی کە بەناڕەوا بەسەر حیزبی ئێمەیان داهێنا و نامادەش نەبوون لێپرسینەوەی هاوبەشی لەسەر بکرێ چونکە حیزب دەیتوانی هەر لای خۆیان ئەو کەسانە بدۆزێتەوە کە ئەو کاریان کردبوو... پێشمەرگەی کوردستانی ئێران حەزی نەکرد خوێنی برایانی میوانی خۆی بڕژێنێ و دڵی دوژمنانی کورد خۆش بکات... (١٩٧).

وەک پێشتر گوترا، ٥٠ ساڵ خەبات، زانیارییەکی زۆری مێژوویی لەسەر ڕووداوەکانی پەنجا ساڵی ڕابردووی ڕۆژهەلاتی کوردستان تێدا گرد و کۆ کراوە. وا لێرەدا کورتەیەک لەوبابەتانە دەخەمە بەرچاو:

" ئالای کوردستان لە ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ ١٦/١٢/١٩٤٥ لە مەهاباد و دووڕۆژ دواتر لە نەغەدە و ڕۆژی ١٧/١٢/١٩٤٥ لە بۆکان هەڵکرا (٣٢-٣٤). لە لاپەڕە ٤٤ دا ناوی " هیات رئیسەی میللی کورد "واتە: سەرەک وەزیر و وەزیرانی کابینەی کوردستان ناوبردە دەکات، لە هەمان لاپەڕەدا، باسی کارگێرانی چاپخانەی کوردستان دەکات و دەڵێت: " مەلا قادر مدرسی سەرپەرشتیان بوو..."لە لاپەڕە ٤٥ دا ناوی نووسەرانی ڕۆژنامەی کوردستان دەبات: " حەسەن قزلجی، هێمن، هەژار و...." لەهەمان لاپەڕەدا باسی دامەزرانی رادیۆ لە مەهاباد (ئیستاسیۆنی رادیۆ) دەکات، کە لەڕۆژی (١٠/٢/١٣٢٥ = ٢٩/٤/١٩٤٦) دامەزرا و دەڵێت: "ئەو دەزگایەش وەک چاپخانە، لەلایەن سۆڤیەتەوە هاتبوو و پێشەوا لە ڕۆژی ١/١٥/١٩٤٦ دا قسەی لەسەر کرد". لەمەسەلەی دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک دا، کە جێگەی مشتومڕە، نووسەر ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١ بە ڕۆژی دامەزرانی دادەنێت، کە دەکاتە ڕۆژی ١٥/٩/ ١٩٤٢

(لاپەڕە ٢٠). لە هەمان لاپەڕەدا ناوی ١٥ کەس لە بەشدارانی یەکەمین کۆبوونەوە دەبات و دەڵێت: میرحاج و مستەفا خۆشناویش بە نوێنەرایەتی حیزبی هیوای کوردستانی عیراق بەشداری کۆبوونەوەی نەسڵی بوون." گادانی دەنووسێت: هەر لەمانگی بانەمەڕدا، نزیکەی ٨٠ کەس لە لاوەکان بۆ خوێندن نێردرانە باکۆ، ژمارەیەکیش نێردرانە تەوریز..." ئەمجا ناوی ژمارەیەک لەو لاوانە دەنووسێت (٤٦). لەلاپەڕە ٤٨ و ٤٩ دا هێزی عەشایری پشتیوانی کۆماری کوردستان ناودەبات: " بارزانی، جەلالی ،ماکۆ، میلانی، شکاک و دەڵێت: بە هەموویان ١٢٧٥٠ سواردیان هەبوو...." (٤٨ و ٤٩).

لەکۆتایی دا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە هێندێک خاڵی بچووک لە پەیوەندی زمانی نووسینی کتێبەکەدا بکەم: کاریگەریی زمانی فارسی بەسەر قەڵەمی کاک جەلیلەوە دیارە و بۆ پاڵاوتنی زمانەکە، باشتر دەبوو کەسانێک لایەنی زمانەوانی کتێبەکەیان بگرتایەتە بەرچاو و بەسەریدا بچوونایەتەوە: ناهەماهەنگی(١٨٣)، ئامادەگی (١٥٦)، شا، مەجلیسی هەڵوەشاوە راگەیاند (١١٩)، هاوناهەنگ بکا (١٨٥)، پێشمەرگە سازماندەهی بکرێتەوە (٢١٧)، ئەفرادی زانستگە دیتوو(٢٢٩) و..... ئەگەر ئەم لاوازییە بخرێتە لای چاپی کتێبەکە، کە بە پیتی فارسی و بەبێ نیشانە تایبەتەکانی زمانی کوردی نووسراوە، خوێنەر دەتوانێت بێتە سەر ئەو باوەڕەی کە شێوازی نووسین و لایەنی زمانەوانی، پشتگوێخراون و بایەخی تەواویان پێ نەدراوە.

* ئەم یادداشتە لەبەر نوسخەیەکی کتێبەکە نووسراوە، کە لە مامۆستای بەڕێز (محەممەد رسول هاوار)م بە ئەمانەت وەرگرتووە. سوپاسی مامۆستا دەکەم.
** بۆ نموونە: نیو سەدە تێکۆشانی مامۆستا عەبدوڵلا حەسەن زادە و ٥٠ ساڵ خەباتی کاک جەلیل گادانی.

**لەندەن: ئەنوەر سوڵتانی**
**گۆڤاری پەیام: ژمارە ١٠ گەلاوێژی ١٩٩٨**

## وەلامی نامەکان

بە پێویست دەزانم لەسەر نامەی ئەو بەڕێزانەی کە پێشتر خوێندتانەوە بە کورتی ئاماژە بە هێندێک خاڵ بکەم.

کاک هوشەنگ توفیق قامکی لەسەر هێندێک شت داناوە، بۆ نموونە دەنووسێ: "حیزب نەیتوانیوە ئارشیوێکی رێک و پێکی هەبێ و تا چەند ساڵ لەمەوبەر خەڵک بە فارسی و کوردی شتی لەسەر حیزب نووسیوە بەڵام بەرپرسانی حیزب خۆیان نەداوەتێ و لەمەڕ حیزب شتیان نەنووسیوە و ئێستا ئەوە دەستیان پێکردووە."

برای بەڕێز حیزبێک کە بەشی هەرە زۆری تەمەنی بە نهێنی تێکۆشابێ بۆی ناکرێ ئارشیوی رێک و پێکی هەبێ. حیزب بەر لە شۆڕشی گەلانی ئێران و تا دوو ساڵ دواتریش لە هیچ شوێنێکی ئەورووپا دەفتەر و بونیاتی نەبووە، سەرەڕای ئەوەش دەکرا هێندێک بەڵگە وەک ئارشیو بپارێزرێ. ئێستاش زۆر شت هەیە وەک رۆژنامەکانی دەورەی کۆمار و فیلمی رۆژی ئیعلامی کۆماری کوردستان و گۆڤارەکانی ئەو سەردەم کە دەبێ هەوڵی بۆ بدەین و پەیدایان کەین و بە ئارشیویان بسپێرین. راستە خەڵکی دیکە زۆریان بە کوردی و فارسی لەسەر حیزب نووسیوە، بەڵام بۆ ئەو نووسینانە بەڵگە و سەنەد کەمتر لەگۆڕێ دابووە. لەم بوارەدا دەتوانین لەسەر کتێبی کوردستان و کوردی دوکتور قاسملوو حیساب بکەین کەبۆ زۆر شت ئامار و بەڵگەی بە دەستەوە داوە و بە شێوەیەکی ئاکادیمیک و بەر لە هەموو ئەو کتێبانەش نووسراوە کە بەرپرسانی دیکەی حیزب دواتر نووسیویانە.

ئێستاش کە هاوڕێیانی حیزبی دەستیان پێکردووە جێگەی خۆشحاڵییە و بە قەولی کورد دەڵێ زەرەر لە نیوەش بگەڕێتەوە قازانجە و لە هەر شتێ مشتێ دەست کەوێ هەر بەکەڵکە و زەحمەتەکانیان جێگەی رێز و تەقدیرە.

کاک هوشەنگ دەنووسێ دەبوو دەست نیشان کرابا کە کاک هاشم و کاک عوسمان کام فەسڵانەیان نووسیوە. من نەتەنیا موافقی ئەوە بووم بەڵکو لە کاتی خۆیدا پێشنیارم کرد کتێبەکە بە ناوی هەموانەوە چاپ کرێ بەڵام ئەو هاوڕێیانە موافقەتیان نەکرد و ئەوەش کە لەسەرەتاکەوە سوپاسی هاوکارییەکەیانم کردووە بە پێچەوانەی مەیلی ئەوان بووە کە لە روانگەی منەوە ئەوە لانی هەرە کەمی سوپاسە لە زەحمەتەکانیان.

بۆچوونی کاک هوشەنگ لەم بوارەدا کە لەسەر "حیزبی ئازادیخوازی کوردستان" کەمم نووسیوە تەواو راستە بەڵام لەوە زیاتر لەم پێوەندییەدا بەڵگەم بە دەستەوە نەبووە و

مقالەکەی خۆشی زۆر دوای کتێبەکەی من لە رۆژنامەی ئاڵای ئازادی دا چاپ کراوە هیوادارم هەروەک بۆخۆشی قەولی بە من داوە لەم بوارەدا زیاتر بنووسێ و لە پەرتوکێک دا بڵاوی بکاتەوە.

رەنگە وەک کاک هوشەنگ باس دەکا بە دوای تێکچوونی کۆمار دا کەسانێک هەبووبن بە رەخنە لە کۆمار و ... خوازیاری ئەوە بووبن حیزبێکی چینی کرێکار و زەحمەتکێش پێک بێنن یا لەسەر رێبازی کۆمەڵەی ژ.ک برۆن بەڵام بۆ هیچ کام لەوانە بەڵگەی پێویست لەگۆڕێ دا نییە و بە شێوەی نووسراو و چاپ کراوە بڵاو نەکراونەوە یا ئەگەر بڵاویش کرابنەوە من دەستم نەکەوتوون تا ئاماژەیان پێبکەم و لەسەریان بڕۆم.

لەمەڕ شەهید کردنی کاک صدیق ئەنجیرییش بەڵگەی زیندووی قانوون پەسند بە دەستەوە نییە تا مرۆڤ بکارێ بە روونی لەسەر ئەحمەد تۆفیقی ساغ کاتەوە، ئایا شک بۆ ئەوە ناچێ ئەو کابرایەی ئەو کارەی کردووە بە دزی ئەحمەد تۆفیق لەگەڵ رێژیمی شا و ساواک سازابێ و بە نرخی شەهید کردنی کاک صدیق خۆی لە لای رێژیم تەئمین کردبێتەوە و وەک بەرزەکی بانان لەسەر کار و ئیشی خۆی دامەزرێتەوە؟

* * *

کاک مەلا رەسووڵ پێشنماز نامەیەکی دوور و درێژی نووسیبوو بەم هۆیە لە وەڵامیدا دەنووسم:

کاکی خۆم نامەکەت زۆر درێژ بوو، هێندێک بە گرژی نووسرا بوو بەڵام لە عەینی کات دا شتی جێگەی سەرنجیشی تێدا بوو کە هەوڵم داوە بیانهێنم. هەر وەک پێشتر دەگەڵ خۆشتم باس کردووە شوکر هەوری ناکۆکی رەویوە و ئێستا ئاشتی گەشەی کردووە بۆیە بەشێکی زۆر لەو شتانەی دەنامەکەدا بوون چاپم نەکرد.

دیارە نووسینی کتێبێکی وەک پەنجا ساڵ خەبات ناتوانێ بێ کەم و کووڕی بێ و بەو بێ ئارشیوییەی حیزبەکەمان تووشی ھاتبوو و لە جەنگەی شەڕی سێ مانگەش دا کە ئێمە نە چاپەمەنی رێک و پێک و نە رادیۆمان هەبوو، گەلێک لە قارەمانەتی پێشمەرگە و خەڵک کە لە زۆربەی ناوچەکان کراوە مەگەر لەبیری تیژی هێندێک کەس دامابن دەنا زۆربەی هەرە زۆریان لەبیر چوونەوە.

ئێوەش لەو نامەدا بەشێک لە راستییەکانتان وەبیر هێناوەتەوە و بە گشتی و لە چەند

رستەدا ئامـاژەت پێکردوون بەڵام ئەوەندە نووسـینە بە هیچ شێـوەیەک وەڵامـدەری ئەو هەموو گیانبازییە نییە کە لەو هەلومەرجە دا خومەینی و سوپای ئیسلامی ئابی محەممەدی بەچۆک داهێنا و داوای وتووێژی کرد و ئێمەش قەبوولمان کرد.

من لە سـەرەتای پەرتوکێک دا کـە لە ژێر سـەردێری "یادداشـتـهـای یک پیشـمـرگ قـهـرمـان"دا لە پاریس چاپم کـردۆتەوە، داوام لـە هەمـوو بەرپرسـان، فـەرمـاندەکـان و پێشمەرگەکانی حیزب ح ئەوانەی لە دەرەوەی وڵاتن و ح ئەوانەی لە کوردستـانن کردووە کە هەتا شتێکتان لەبیر و مێشک دا ماوە یادداشتیـان بکەن، یا بۆخۆیان چاپی کەن یا بیدەن بە حیزب تا کاتی چاپ کردن لە ئارشیو دا بمێنێتەوە. بەم هۆیەوە لە جەنابیشت داوا دەکەم بە ئەنجامی ئەم ئەرکە هەستی: هێندێک بیر بکەوە و زۆر شتی فەرامۆش کراو وەبیر خۆت بێنەوە، بیانووسە و پێشکەشی باردگای گەل و شۆڕشیـان بکە. ئاخر هەمووی ئەوانە مێژووی حیزبی دێموکرات و خەباتی گەلی چەوساوەمان لەم بەشە لە کوردستان دان، حەیفە نەنووسرێن و لەبیر بچنەوە.

لەسـەر کـۆنگرەی دوو، ئەوەی نووسـیـوتە روونکردنەوەیەکی باشـە، بەڵام مـیـرزا خـدر مەرسەنە کە لە بەرانبەر برایانیدا شەڕی نەکردووە بۆی روون بووە کە ئێوە هەوڵتـان داوە بۆ بەشـداری لە کۆنگرە دا بچن و بە دیالۆگ و مەنتق بە خـاوەن دەسـەڵاتی کۆنگرە کـاک احمد توفیق بسـەلمێنن کە مافی خۆتانە لە کۆنگرە دا بەشـداری بکەن و داخوازییـەکانی خـۆتان بێننە بەرباس: بە خـۆشـییـەوە دەگـەڵ ئەوەش کـە ویسـتی رەوای ئێـوەیان قـەبووڵ نەکـردووە و بـە ناهەق رێگەیان پێ نەداون بچنە کـۆنگرەی دوو شـەڕتان نـەکـرد و خـۆتان تووشی براکوژی نەکـردووە. هەر ئەو لەسـەرەخۆییەتان لە خـۆی دا کـارێکی باش بووە و جێگەی سوپاسە.

* * *

**بەڕێز دوکتور سوهەیلا خانم ماملێ:**

ئەوەی کە لە نامەکەتان دا نووسیوتانە کورد گەلێک جار ناچارە گەلی خۆی لەچاو بێگانەوە ببینێ، بە تەواوی راستە چونکو بۆخۆمان وەک کورد زۆر درەنگ بایەخی مێژووی خۆمان دەرک کردووە و دەستمان بۆ نووسینی بردووە، بە داخەوە دەتوانین ئێستاش بڵێین لەم بوارە دا هەر کەمتەرخەمین و رووداوەکان لە کات و ساتی خۆیدا سەبت ناکەین تا بۆ مێژوو بمێنێتەوە.

لەسەر سنووری کوردستان و رووسیا و ئەرمەن، بێگومان بۆچوونی ئێوە پایە و بنەمایەکی زانستی و مێژوویی هەیە و هیوادارم رۆژێک تێزەکەت کە بێگومان شتێکی زۆر بە نرخە نەتەنیا بە زمانی فەڕەنسی چاپ و بڵاو بکرێتەوە بەڵکو بکرێتە کوردی و فارسی و تورکی و ئەرمەنی و عەرەبیش تا بتوانین لە کاتی پێویست دا کێشەی خۆمان بە بەڵگە و سەنەدی کۆن و لەمێژینە و پڕبایەخ بە دراوسێکانمان بسەلمێنین و حەق هی هەر کەسە بە حەقدار بگا. زۆریش بەجێ دەبێ ئەگەر کاتتان هەبێ ئەو شتانە وەک مەقالە بنووسن و لە چاپەمەنی بێگانە و کوردی دا بڵاو بکرێنەوە. راستە ئێمە کوردین و دەیان سەدەیە غەدرمان لێکراوە و ئێستاش ئەو زۆردارییە بەسەرمانەوە بەردەوامە، بەڵام دەبێ بە کردەوەکانی رابردووی خۆشمان دا بچینەوە و لە هێندێک بوار دا رەخنە لە خۆمان بگرین.

گومان لەوە دا نییە کە صارم خان ساڵی ٣١ ئەوکات کە کاندیداتۆری مەهاباد بوو بۆ پارلەمانی ئێران و سەریش کەوت بەڵام بە پیلانی نۆکەرانی شا نەیانهێشت بچێتە پارلەمان، وەکیلی پایە یەک، واتە محامی پایە یەک بووە جا پێشتر لە کوێ قازی بووە یان نەبووە نازانم. بەڵام لە قازی بوونی هیچ وەکیلێکی دادپەروەری دا گومان نییە، چونکو تا ماددەکانی پێویست لە زانکۆ تەواو نەکا و، ماوەیەکی لەژێر چاوەدێریی وەکیلێکی پایە یەک دا، کارئەکا و تەجرەبەی نەبێ، ناتوانێ ئیزنی وەکالەت وەرگرێ. بەتایبەتی من هەر لە کۆنەوە صارم خانم بە تێکۆشەرێکی دێرین ناسیوە، ئەوەندەش لە وەکالەتی بەرحەق و قەزاوەتی دادپەروەرانەی دا بڕوام پێی بووە و هەیە. بەڵام لەو

لاپەڕەش دا، کە دوکتور سوهەیلا ئامـاژەی پێکردووە، شتی وا نابیندرێ کە من تەنیا بەقازیم لە قەڵەم دابێ.

لەسەر ئەوەی کە نێوەکان بە لاتینیش بنووسرێن پێشنیارەکەت زۆر بەجێیە و هیوادارم لە داهاتوودا بەرچاوی بگرم. لەوەش دا گومانم نییە کە گەلاڵەی ٢٦ ماددەیی خودموختاری صارم خان صادق وەزیری مافناسی شارەزا و دڵسۆز و نیشتمانپەروەر ئامادەی کردووە و بە نێوی هەیئەتی وتووێژی کورد دراوە بەو هەیئەتەی کە بە زاهیر بۆ وتووێژ لە لایەن ڕێژیمەوە هاتبوونە مەهاباد. بەڵام هیچیان نەکرد و تەسلیمی بیر و بۆچوونی خومەینی بوون و خۆیان لە بەیانی ڕاستییەکان و مەتردح کردنی داخوازییەکانی گەلی کورد بۆ خەڵک بوارد.

* * *

کاک ئەنوەری سوڵتانی لە گۆڤاری پەیام دا کە لە لەندەن چاپ دەکرێ مەقالەیەکی لەسەر بەرگی یەکەمی "پەنجا ساڵ خەبات" نووسیبوو. وەک خوێنەری بەڕێز پێشتر لە مەقالەکەی ئەودا خوێندوویەتەوە، گەلێکی لوتف بە نیسبەت خۆمەوە کردووە و لەسەر نێوەرۆکی کتێبەکەش هێندێک شتی باس کردووە کە لە چەند خاڵدا ئاماژەی پێدەکەم.

منیش لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کاک ئەنوەر بە تەواوی موافقم کە ئەو نووسینانە نابێ ببنە هۆی شەڕەدەندووکە. هەروەک لەسەرەتای "با نەبێتە درۆی پاش مردوو" دا نووسیومە و بڕوای قووڵیشم پێیەتی، بیروبۆچوونی جیاواز لەسەر هەر مەسەلەیەک دەبێ بە حورمەتەوە بنووسرێ و دوژمنایەتی تێدا نەبێ، چونکە بێگومان هیچ کەس ناتوانێ بە بچووک کردنەوەی کەسێک خۆی گەورەتر لەوەی کە هەیە نیشان بدا و ئەو نووسراوانە دەبێ لە غەرەز دوور بن و بەو مەبەستە بنووسرێن کە خەڵک کەڵکیان لێ وەرگرێ و بە بەراوردکردنی نووسراوەکان لەبەرانبەر یەکدا خوێنەر بە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن ڕاستی و ناڕاستی لێک هەڵاوێرێ.

هەروەک کاک ئەنوەر نووسیویەتی جیاوازی بیروڕا دەگەڵ یەکتر تاوان نییە و مرۆڤ هەموو لەسەر ڕووداوەکان و هەڵس و کەوتەکان وەک یەک بیرناکەنەوە. تەنانەت لە حیزبیش دا ئەگەر مەنتق و عەقڵی سەلیم حوکم بکا دەگونجێ ئەندامان بیروڕایان لەسەر مەسەلەیەک فەرقی هەبێ و بە شێوەی دێموکراتیک ڕێگە حەللی بۆ ببیننەوە. دیارە

ئەوەش روونە کە هێندێک جار ناتەبایی بڕواکان ئەوەندە لێک دوور دەکەوێتەوە کە دەبێتە هۆی وێک هەڵنەکردن و جیابوونەوە و لێک ترازان.

هەرچی تێدەفکرم من باسی برایانی حیزبیم لە بەرگی یەکەمی "پەنجا ساڵ خەبات" دا نەکردووە کە بۆنی دوژمنایەتی لێ بێ و بێ بەزەییانە هێرشم کردبنە سەر. بەداخەوە لە مقالەکەش دا ئیشارەی بە لاپەڕەکە نەکردووە. بەڵام وێدەچێ ڕەخنەم گرتبێ کە ئەوەش لە چوارچێوەی حیزبایەتیدا ئەگەر دوور لە غەرەز بێ و شتەکە ڕاست بێ کە بۆخۆم دڵنیام هیچی بە ناحەقم لەسەر کەس باس نەکردووە بە مافی ڕەوای خۆمی دەزانم.

هەر لەو باسەدا منی بەوە تاوانبار کردووە کە پاکانەم بۆ موجاهیدین کردووە و لە هەڵەکانیان چاوم نوقاندووە. بە دڵنیاییەوە دەڵێم لەو بابەتەشەوە شتی ناڕاستم بەقەڵەم دا نەهاتووە و ڕەنگە هەموو شتێکیش لەهەموو شوێنێک شی نەکرێتەوە و دەبێ لە کاتی خۆی و جێگای خۆیدا بێ.

لەسەر ئەوەی کە دەنووسێ موجاهیدین قەت هەنگاوێکی خێریان دەگەڵ کورد هەڵنەهێناوەتەوە من ئەو شتە بە ڕاست نازانم و لەزۆر جێگا لە جبهەکاندا لە کاتی هێرشی ڕێژیم هەر لە کوردستان و هێندێک جار شان بە شانی پێشمەرگە بەربەرەکانیان کردووە. ئەو دەمەی کە چریکەکان چەکەکانیان تەحویلی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی دەداوە و دەگەڵ ئێمە پەیمان شکێنیان کرد، ئەودەم کە توودەییەکان دژمان ڕاوەستابوون و بە نۆکەری ئەمپریالیزمیان لەقەڵەم دەداین و جاسووسیان لەسەر دەکردین، موجاهدین لانی کەم بۆماوەی چەند ساڵ هاوپەیمانی بەکردەوەی ئێمە بوون. باوەر بفەرموو مەبەستم بە هیچ شێوەیەک ئەوە نەبووە ڕاستییەکان بشارمەوە، بەڵکوو لەم بوارەدا ڕاستییەکان ئەوەن کە ئەمن باسم کردوون نەک ئەو درۆ و دەلەسانەی لەلایەن ڕێژیمەوە دژیان بڵاو دەکرێتەوە و هێندێکیش فێربوون دووپاتیان بکەنەوە. زۆر کەسیش هەن کە پێیان خۆشە ئەوانەی ڕێژیم لەسەر ئەوان دەیڵێ ڕاست بن تا ڕقی کۆنی خۆیانیان لانی کەم بەو قسانە پێ بڕێژن.

کاک ئەنوەر دەنووسێ کە لە هێندێک جێگا من تووشی خۆ بە زل زانی بووم. ئێوەی بەڕێز و هەموو ئەو کەسانەی کە من دەناسن باش دەزانن کە خۆ بە زل زانی لە وجوودی من دا نییە و زۆر لەوە خاکیترم کە تووشی ئەو شتانە بم. بەڵام ئەوەی ئەمن نووسیومە لەبەرامبەر کار و تێکۆشانی بێ وچانم دا لە لایەن کومیتەی ناوەندی حیزب لە ساڵی ١٣٥٧ دا کراوم بە مشاویر، حورمەتێکە بۆ ڕێبەرایەتی ئەوکاتی حیزبم داناوە کە بە

خۆرایی منی نەکردە مشاویر و کارنامەکەشم بۆ هەموو کەس روونە. بەناشوکری نەبێ دواتر هیواش هەبوون کە قەزا و قەدەر هێنابوونییە سەر و هیچ کاتیش سیاسەت و حیزبایەتییان نەکردبوو.

ئەوەش کە ئەمن دوکتور قاسملووم بە خەڵک ناساندووە کوفر نییە، لە لایەک وەک بەڕێوەبەری بەرنامەی مێتینگی یازدەی رەشەمەی ۱۳۵۷ و ڕێوڕەسمی ئاشکرابوونەوەی تێکۆشانی حیزب، ئەرکم ئەوە بووە و دەبوو بیڵێم کێ قسە بۆ خەڵک دەکا. لە لایەکی دیکەشەوە دوکتور قاسملوو تا ئەوکات زۆر کەم لە کوردستان ماوەتەوە. لەو ماوە کەمەش دا کە ماوەتەوە بە ئەهێنی ژیاوە و تێکۆشاوە. هەر بۆیە دەگەڵ خەڵک تێکەڵاو نەبووە. ئەو کاتەی کە گەڕاوەتەوە کوردستان نەتەنیا خەڵکی ئاسایی نەیانناسیوە بەڵکو لە نێو ئەندامان و لایەنگرانی حیزبیش سەت کەس لە نزیکەوە نەیانناسیوە. با ئەو سکرتێری حیزبیش بووبێ، پێویستی بە ناساندن هەبووە تا زووتر لە نێو کۆمەڵی کوردەواری دا جێگەی خۆی بکاتەوە و شوێنی تایبەتی خۆی لە پەیوەندی دەگەڵ کۆمەڵانی خەڵک دا دابنێ و هەرواش بوو. پێشم وایە بەتایبەتی ئەو ئەرکەیان بەمن ئەسپاردبوو.

لەو بابەتە کە کوردییەکەی ئێمە خەڵکی کوردستانی رۆژهەڵات لە ژێر کاریگەری فارسی دایە گومانی تێدا نییە، بەڵام ئاخر ماوەیەکی دوور و درێژ هەر بە فارسی خوێندوومانە و خوێندوومانەتەوە و زمانی خوێندنی کوردی قەدەغە بووە، بۆیە ئەو مەسەلەیە سروشتییە. بۆ پێداچوونەوەش چەند کەس وتارنووس و کوردیزانی خۆمان پێیدا چوونەوە، سەرەڕای ئەوەش ئەو وشانەی هەر تێدایە کە لە فارسی دا باون و ئاماژەت پێکردوون.

* * *

کاک حامید گەوهەری پاردکە پەرتووکێکی لە ژێر ناوی "راستییەکان بۆ خۆیان دەدوێن" لە پێوەندی دەگەڵ "دوو کتێبی من" بەرگی یەکەمی پەنجا ساڵ خەبات و بانەبێتە درۆی پاش مردوو نووسیوە و بڵاوی کردۆتەوە. من نامەیەکی تایبەتیم بۆ نووسیوەتەوە کە پێویست ناکا هەمووی لێرەدا بێنم بەڵام بۆ ئەوەی لەم کتێبەش دا بێ وەڵام نەمێنێتەوە چەند رستەیەکی بو دەنووسم:

برای بەڕێز کاک حامید "سوپاست دەکەم کە زەحمەتت کێشاوە و کتێبەکانت خوێندۆتەوە

و زیاتریشت هەوڵ داوە و لەم پێوەندییەدا ئەو پەرتووکەت نووسیوە. زۆر کتێبی دیکەشت نووسیوە یا وەرتگێڕاون، سەرەڕای ئەوەی من ئەم دیون سوپاسی زەحمەتەکانت دەکەم "دیارە ئەگەر عومر باقی بێ بەرگی دووهەمی (با نەبێتە درۆی پاش مردووش دەنووسم) زۆر کتێب نووسراون کە یا دەستم نەکەوتوون و نەمخوێندونەوە یا رەنگە هێندێک شتیش بنووسرێ بەڵام شیاوی ئەوە نەبێ وەک سەرچاوە پیاو کەڵکی لێ وەرگرێ. بێگومان لەبەرگی دووهەمی با نەبێتە درۆی پاش مردوودا زۆر شت لەوانەی جەنابت نووسیوتن روون دەکەمەوە.

دڵنیاش بە هێشتا ئەوەندەم لە دێموکرات بوون پێماوە کە ئەگەر ئەتمنیا برادەرێکی دێرینی وەک ئێوە بەڵکو تازە لاوێکیش شتەکانم ئەقد کا بەو شەرتەی بۆچوونەکەی دروست بێ سوپاسی دەکەم و شتی لێ فێر دەبم.

من بە پێچەوانەی بۆچوونی مەلا رەسووڵ پێشنەماز کە دەیگوت ناسری زاوای سەرەتاکەی نووسیوە پێم وایە ئەویش هەر چکاوەی خامەکەی خۆتە کە بە بڕوای من بە نییەتێکی پاک نەنووسراوە. رەنگە هەڵەش دەرێکەوت و هەڵسەنگاندنەکانم دا هەبێ بەڵام ئەوەی نووسیومە بە نییەتی پاک و بێگەرد نووسیومە و قەرارم داوە لەمەودواش ئەگەر کەسانێک کە بۆخۆیان چەند ساڵ لە حیزبی دێموکرات و لە رادەی هەرە بەرز دا کاریان کردبێ بیانهەوێ بە درۆ و دەلەسە و فڕ و فیشاڵ ئەو حیزبە بەناحەق بەدنێوکەن بێ وەڵامیان نەهێڵمەوە.

لەسەر نووسراوەکانی جەنابیشت بە وردی دەیانخەمە بەرچاو، هەرچی راست بێ لە چاپەکانی دوایی دا چاکی دەکەم و ئەوەی واش نەبێ وەڵامەکەی دەنووسمەوە.

فەرمووتە"ئەو کتێبە بەڵگەی تێدا نییە و بێ بەڵگە نووسراوە یا بۆ جێگە و شوێنی چاپ و چاپخانەی لێنەنووسراوە؟"

لە وەڵام دا عەرزت دەکەم ئەوەندەی بەڵگە هەبووە مادام دەستم کەوتبێ هێناومە و هێندێکش بڕوایان وایە زیاتر لە پێویست بەڵگەی تێدایە. ئاخر بۆخۆشم با کوردیش بم ئەوە پەنجا و چوار ساڵە ئەندامی ئەو حیزبەم و لە ئەندامەتی سادە را تا پلەی هەرە بەرز کە سکرتێری بووە پێواومە و قەت نەوەستاوم دەبێ وەک شاهید و نیوە بەڵگەنامەیەک کەم و زۆر حیسابم بۆ بکرێ.

لە لایەکی دیکەوە دەزانی من لە کوردستان دەژیم و لەو بەشەی دام کە بە خۆشییەوە

ئەوە دە ساڵە کورد حکوومەتی تێدا دەکا بەڵام بەداخەوە ئێستاش وای لێ نەهاتووە کە لایەنێک ئەگەر لە دەسەلاتیش دابێ، خاوەن چاپخانەیەک ئەگەر زۆریش بەکار و دڵسۆز بێ بتوانێ ئێوی خۆی لە سەر کتێبێک بنووسێ کە باسی رێژیمی کۆماری ئیسلامی بە باری راست و دروست دا تێدابێ. خاوەن چاپخانە دەڵێ بۆت چاپ دەکەم ئەوەندەشت خەرج دەبێ، بەڵام ناوێرم ناونیشانی خۆمی لە سەر بنووسم، چونکە لەوانەیە چاپخانەکەم لێبتەقێننەوە. دڵنیابە ئەگەر لە سۆئێد چاپ کرابا هەموو ناونیشانی لەسەر دەبوو.

جارێ بۆ نووسینەکانت ماندوونەبوونیت لێدەکەم تا لە کاتی خۆی دا ئەوانەی نووسیوتن و راستن، چاکیان دەکەم و ناراستەکانیش بەدەلیل ردد دەکەمەوە

**برایت جەلیل گادانی**
**٢٠٠٢/٥/٢٧**

# بەڵگەنامەکان

## (١)

هاوڕێی هێژا میخائیل سرکیویچ گۆرباچف سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بە سڵاوی شۆڕشگێرانەوە لە لایەن ڕێبەرایەتی حیزب بۆ ئێوە، حیزبی لینینی مەزن و هەموو گەلانی سۆڤیەت بۆ پتەوتر بوونی هەرچی زیاتری بناخەی سۆسیالیزم لە وڵاتی گەورەی شووراکان سەرکەوتن بە ئاوات دەخوازم.

پلینۆمی سێیەمی حیزبەکەمان، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر لە سەر ئەم بڕوایەیە کە لە دووساڵی ڕابردوو دا هەنگاوی زۆر گرنگ لەلایەن جەنابتانەوە بۆ نەهێشتنی ئاڵۆزیە نێونەتەوەییەکان هەڵگیراوە، ئەو کارە لە جێی خۆیدا بۆ حەللی گیروگرفتەکانی چەندین ساڵەی زۆر لە نەتەوە ستەم لێکراوەکان شوێنی بەرچاوی داناوە.

ئێستا کە بۆجێبەجێکردنی ئاشتی و دابینکردنی هێمنایەتی درێژخایەن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا زۆر بە جیددی هەوڵدەدەن و دەوڵەتی سۆڤیەت بەناردنی وەزیری کاروباری دەرەوەی خۆی بۆ ئەوناوچە، چارەسەری گیروگرفتەکانی ئەم ناوەی وەپێش کارەکانی دیکە خستووە زۆر بەجێ دەبێ کەمافی نەتەوەی (٢٥)ملیۆنی کوردیش کە لە مێژساڵە لەڕێی گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی تێدەکۆشێ بێتە گۆڕێ و سەرنجی تەواوی بدرێتێ. حیزبی ئێمە کە هەموو کات خۆی بە دۆستی ڕاستەقینە و ئیستراتژیکی وڵاتانی سۆسیالیستی حیساب کردووە و لە قووڵایی دڵەوە بڕوای بەم دۆستایەتییە هەیە، چاوەڕوانە خەباتی ڕەوا و عادلانەی بە حوکمی ئەرکی ئەنترناسیونالیستی لەلایەن ئێوەوە تەئید بکرێ و

پشتیوانی حیزبی ئێوە و دەوڵەتی سۆڤیەتی لە پشت بێ. گەلی زۆرلێکراوی ئێمە پاش تەحەمولی (٥٧) ساڵ ئیستبدادی پاشایەتی، ئێستا دە ساڵە لەلایەن ڕێژیمی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامیدا بە توندترین شێوە سەرکوت دەکرێ تائێستا هەزاران بنەماڵە ماڵوێران بوون و دەیان هەزار کەس شەهید کراون، ئەو شەڕە درێژخایەنە کە نزیکەی دەساڵە لەلایەن ڕێژیمی سەدەکانی نێوەڕاست بەسەر گەلی کورددا براوە، یەکێک لەو مەسەلە گرینگانەیە کە دەبێ سەرنجی بەشەرییەتی پێشکەوتنخواز بۆ لای خۆی ڕاکێشێ.

بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە دابین کردنی مافی ڕەوای گەلی ئێمە شوێنی بەکەڵک و بەرچاو لەسەر بەرقەرار بوون و بەهێز بوونی پایەی ئاشتی لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دادەنێ. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم وەزعەیە کە بە ناوی گەلی ستەم لێکراوی کورد و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لە جەنابتان وەک دەبیری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت داوا دەکەم، سەرنجی پێویست بدەنە سەر مەسەلەی کورد و لەم ڕێبازەدا هەنگاوی پێویست هەڵگرن، بەڵک لە ڕێگەی ئێوەڕا ئەوشەڕە ماڵوێرانکەر و خوێناوییە تەواو بێ و گەلی کورد لە کوردستانی ئێران کەلە سەرەتاییترین مافی نەتەوەیی و ئینسانی خۆی بێ بەشە، ببێتە خاوەنی چارەنووسی خۆی و لە کۆمەڵی مرۆڤایەتی ئازاد و پێشکەوتنخوازدا شوێنی شایستەی خۆی بدۆزێتەوە.

**بە حورمەتەوە جەلیل گادانی**
**سکرتێری حیزبی دێموکراتی کوردستان- ر.ش**
**١٣٦٨/١/١**
**٢١/مارس/١٩٨٩**

(٣)

## هاوڕێی زۆر بەڕێز میخائیل گۆرباچۆف
## بە سڵاوی گەرم و حورمەتی پێویست!

هەواڵی هەڵبژاردنی جەنابتانمان بەسەرۆک کۆماری یەکێتی سۆڤیەت بیست و زۆر پێ خۆشحاڵ بووین بەم هۆیەوە لە لایەن گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانەوە بەتایبەتی لەلایەن کومیتەی ناوەندی و هەموو ئەندامانی حیزبەکەمانەوە پیرۆزباییتان لێ دەکەین. بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکەش کە لەم دەوروزەمانە دا چ لە وڵاتی پان و بەرینتان و چ لە مەیدانی سیاسەتی نێونەتەوەییدا وەعۆدەتان گرتووە داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم.

جەلیل گادانی
سکرتێری حیزبی دێموکراتی کوردستان
ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ
١٩٩٠/٣/١٨
١٣٦٨/١٢/٢٧

(٣)

# ڕاگەیاندراوی دەبیرخانەی کومیتەی ناوەندی بە بۆنەی جینایەتی ڕێژیم لە "برلین"

**هاوڕێیانی بەڕێزەکانا**

**خەڵکی خەباتگێڕی کوردستانا**

بە پێی هەواڵ، سـەعـاتی ۱۱/۳۰دەقـیـقـەی شـەوی پێنج شـەمە، ڕێکەوتی ۱۳۷۱/٦/۲۷،۲٦ی هەتاوی لە شـاری بێـرلینی ئەڵمـان، پیـاوکـوژانی ڕێژیمی جینایەتکاری کۆماری ئیسـلامیی ئێران دوکتور سادقی شەرەفکەندی و هاوڕێکانی: فەتاحی عەبدوولی و هومایوونی ئەرسەلان و نووری دەهکردی یان تیرۆر کرد.

ئەمە یەکەم جار نییە کە ڕێژیمی جینایەتکاری کۆماری ئیسـلامیی ئێران دەست دەداتە ڕەشەکوژی و تیرۆری موخالیفانی خۆی لە دەرەوەی وڵات و یاسا ئێونەتەوەییەکان بە ئاشکرا پێشێل دەکا.

حیزبی ئێمە لەگەڵ مەحکووم کردنی ئەو جینایەتە تازەیەی ڕێژیمی جینایەتکاری کۆماری ئیسـلامیی ئێران، داوا لە وڵاتانی ئورووپایی و ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان دەکا بە شێوەیەکی جیددی بۆ دۆزینەوە و سزادانی عامیلانی ئەم جینایەتە و پێشگرتن بە کردەوە تیرۆریستییەکانی ڕێژیمی کۆماری ئیسـلامیی ئێران لە دەرەوە و ناوەوەی ئێران ئیقدام بکەن و چیدیکە ڕێگا نەدەن ئەم ڕێژیمە تاوانبارە درێژە بە جینایەتەکانی بدا، ڕێژیمێک کە بە هۆی نەپاراستنی مافی مرۆڤ و گرتن و ئەشکنجە و ئێعدامی هەزاران کەس لە ڕۆڵە خەباتگێڕەکانی گەلانی ئێران چەندها جار لەلایەن کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی مەحکووم کراوە.

کۆمەڵانی خەڵکی زۆر لێکراوی ئێران!

هێزە ئازادیخوازەکانی ئێران و کوردستان!

هەروەک تا ئێستا زۆرجار حیزبی ئێمە رایگەیاندووە، رێژێمی کۆنەپەرست و دژی گەلیی کۆماری ئیسلامی رێژێمێک نییە کە لە باری ماهییەتەوە بتوانێ سەرەتاییترین ماف و ئازادییە دێموکراتیکەکانی گەلانی ئێران جێبەجێ بکا. ئاکار و کردەوەکانی ناخوندەکان لە ماوەی تەمەنی ئەم رێژێمەدا ئەم راستییەی بە تەواوی سەلماندووە.

لە رووناکایی ئەم راستییەدایە کە ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی بە گشتی و هێزە کوردستانییەکان بە تایبەتی دەبێ، بەودلانانی هەموو شک و گومانێک سەبارەت بە ماهییەتی ئەم رێژیمە، بۆ چارسەرکردنی هەر چەشنە ناکۆکییەک لە رێگای سیاسییەوە هەنگاو هەڵێننەوە و هیچ کاتێک لەم راستییە غافڵ نەبن کە ناکۆکی و دژایەتی لە نێو بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی ئێران و لە رادەی سەرانسەری دا تەنیا و تەنیا بە قازانجی رێژێمی جینایەتکاری کۆماری ئیسلامی تەواو بووە و تەواودەبێ.

هەر بۆیە خوازیاری ئەودین بۆ رووخاندن و راماڵینی ئەم رێژیمە ئەگریسە هەموو ئەو حیزب و رێکخراوە ئازادیخوازانەی ئێرانی کە بە کردەوە بۆ رووخاندنی رێژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران تێدەکۆشن و هەروەها هەموو هێزەکانی نێو جووڵانەوەی کورد لە کوردستانی ئێران بۆ هێنانە سەرکاری رێژیمێکی دێموکراتیک لە ئێران و دابین کردنی مافی چارەنووسی گەلەکەمان لە کوردستانی ئێران دا یەک بگرن.

برووخێ رێژیمی جینایەتکار و تیرۆریستپەروەری کۆماری ئیسلامیی ئێران!

**دەبیرخانەی کومیتەی ناوەندیی**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**رێبەرایەتی شۆڕشگێر**
**٧١/٦/٢٦**

## (٤)

## زۆر بەڕێز تورگوت اوزال سەرۆک کۆماری تورکیا:

بەڕێزەوە رادەگەیەنین بە پێی ڕاپۆرتی هەواڵدرییەکانی جیهان و تەئییدی بەرپرسانی خاوەن سەلاحییەتی دەوڵەتی تورکیا، لەشەوی (١٥ی نوتی ١٩٩٠) عەلی کاشف پوور ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزبی ئێمە، لە لایەن (٣) تیرۆریستی چەکدارەوە کە بەبڕوای ئێمە بەکرێگیراوانی کۆماری ئیسلامی بوون لە ماڵی خۆی لە شاری قوونیە ڕفێنردراوە و شەهید کراوە.

لەبەر ئەوەی کە ناوبراو دانیشتووی تورکیا بووە و لە ژێر حیمایەتی قانونی ئەو دەوڵەتەدا بووە و بەلەبەر چاو گرتنی ئەوەی کە ئەو جینایەتە دژایەتی دەگەڵ حاکمیەتی دەوڵەتی تورکیاهەیە و پێشێل کردنی یاساکانی پێوەندی نێونەتەوەییە و دژایەتی ئاشکرای دەگەڵ یاساکانی ئیعلامیەی جیهانی مافی مرۆڤ و کونوانسیونەکانی ئەو هەیە و لە لایەکی دیکەشەوە بێدەنگی دەوڵەتی تورکیا لەم بارەوە دەبێتە هۆی ڕوو هەڵماڵاوی زیاتری کاربەدەستانی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی و دووپات و چەند پات کردنەوەی ئەم چەشنە جینایەتانە، لە ئێوە سەرکۆماری بەڕێز داواکارین وێڕای مەحکوم کردنی ئەو جینایەتە ترسناکە ئەمر بفەرموون بۆ دیتنەوە و گرتنی ئەو تیرۆریستانە و ڕاگەیاندنی ناکامەکەی بۆ خەڵکی دنیا هەوڵی پێویست بدرێ.

به حورمەتەوە دەفتەری سیاسی

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ

جەلیل گادانی

ڕێکەوتی ١٩٩٠/٨/٢٠

## (٥)

# بۆ بەڕێز و تێکۆشەر مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق

وێڕای سلاوێکی گەرم و برایانە سەرکەوتنتان بەسەر گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەکان دا بە ئاوات دەخوازین. هاوڕێیانی تێکۆشەر، هەروەکو بۆخۆتان شارەزا و ئاگادارن خەباتی گەلی کوردمان لە کوردستانی عێراق بە قۆناغێکی ناسک و ناستەم دا تێدەپەڕێ. دوژمنانی رەنگاوڕەنگی نەتەوەکەمان بەتایبەتی دەوڵەتانی حاکم بەسەر کوردستان دا هەوڵ دەدەن بەهەر شێوەیەک بۆیان بلوێ ئاژاوە بنێنەوە و پێش بە بەئەنجام گەیشتنی خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق بگرن، کە لەناستی نێونەتەوەییدا جێگای تایبەتی گرتووە و گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە، هەر بۆیەشە دوژمنانی ئازادی کورد کە توانای بەرەنگاری راستەوخۆیان لە بەرامبەر جوولانەوەی نەتەوەکەماندا نییە، دووبەرەکی لە نێو جولانەوەی کورد دا دەنێنەوە و لەم رێگەوە زیان بە نیعتبار و بەرژەوەندیی جوولانەوەکان دەگەیەنن، بەتایبەتی جوولانەوەی کورد لە کوردستانی عێراق دا.

حیزبی ئێمە تێکهەڵچوونی چەکدارانەی سەرکردایەتی جوولانەوەی کورد لە کوردستانی عێراق لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا لەم راستایەدا دەبینی و پەژارەی خۆی سەبارەت بەم رووداوە دڵ تەزێنە دەردەبڕێ، هەرچەند ئێمە سەبارەت بە چارسەری مەسەلەی کورد بە شێوەی گشتی، لەگەڵ پارتی کرێکارانی تورکیا جیاوازی بیر و بۆچوونمان هەیە و لامان وایە ئەو پارتییە پێویستە گرینگایەتی وەزعیەتی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دەرک بکا، بەلام سەرەڕای ئەمەش لە هیچ قۆناغێکدا تێکهەڵچوونی چەکدارانە لە نێوان هێزە کوردستانییەکاندا بە قازانجی نەتەوەی کورد نازانین، هیواداریین هەروەکو هەمیشە کە لە کاتی ناسکدا بڕیاری بەجێ و شیاوتان بۆ نەهێشتنی ناکۆکییەکان داوە، رێگا چارەیەک بۆ کۆتایی هێنانی ئەم تێکهەڵچوونە بدۆزنەوە.

**دەفتەری سیاسی**

**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**

**١٣٧١/٨/٣**

## (٦)

## "بانگەوازێکی مێژوویی ئەدیب و ڕووناکبیرانی کورد"

شتێکی ئاشکرایە، هەر ئەسکۆ و هەردەس و ساتەیەک لەهەر سەردەمێکدا بەرەنگاری ڕەوتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردمان بوو بێت.... یان هەر گلان و نوشوستیەک ڕووبەڕووی سەرکردەکانمان بوو بێتەوە لەگەڵ هەر دابڕان و دردۆنگییەک دا بەر لە سەد و پەنجا سالی رابردوو ئەمڕۆشی لەگەڵ دا بێ.. دوای کارەسات و ڕووداوە خوێناوییەکان بە خۆیاندا چوونەتەوە و پەنجەی پەشیمانییان گرۆشتووە... بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە پەند و وانە لە ئەزموونە تاڵ و سوێرەکانی پێش خۆیان وەربگرن.

بەسەد داخ و مەخابنەوە هەمان هەڵوێستی پێش خۆیان دووبارە کردۆتەوە و بە هەمان هەڵدێردا ئەسپی سەرکێشی نارەزوویان تاو داوە تا گلان و زەرەر و زیان دووبارە و سێ بارە بۆتەوە و گوێیان بە ڕەوتی مێژووی سەردەم و گۆڕانکارییەکان نەداوە... بۆیە ئەمڕۆ لە دیدی پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندی نەتەوەیی و بانگەشەی کوردستانییەتی و ناوێنەی قووڵ بوونەوە بۆ ناو کێشە سەرەکییەکانی نەتەوەی کوردی ستەم دیدە و بە یەکەوە گرێدانی پشتێنەی خەباتێکی شۆڕشگێڕی کوردستانی کە ناتوانین لە هەر بەشێکی ئەم وڵاتە بریندارەدا کێشەکان لە یەکتری جودا بکەینەوە و هەرچەندە لە گەوهەردا یەک مەسەلەیە و سەرەڕای گرێ کوێرەکەش وا لە دەست عەقڵێکی کاڵی هاوچەرخی خۆمان دایە... ئەگەر هەندێ ململانێ و بیر تەسکی و ڕەشبینی کەسان ئەبنە دڕکی سەرە ڕێ و بوارمان لێ ئەشێوێنن.... هەر لەبەر گەوهەری ئەم هۆکارە ناوەکییەیە... ئێمە کە کۆمەڵێکین لە ئەدیب و ڕووناکبیر و شاعیر.. دەنگی خۆمان لە بڵندگۆی ویژدانی بە تەنگەوە بووغان بۆ مەسەلەی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان ڕادەگەیەنین.. چۆک دادەدەین لە بەردەم سەدان گۆڕی بە کۆمەڵ و ئەنفال و کیمیاباران و قوربانییەکانی خەڵکی شەرەفمەندی سنە و مهاباد و سەردەشت و بۆکان و شرناخ و دیاربەکر و قامشلی... لە ژێر پەرچەمی پەیکەرە شکۆدارەکانی پێشەوا قازی محەمەد و شێخ مەحمود و شێخ سەعید و سمایلی شەریف زادە و داد نایدن و بارزانی ئەمر و زەکیە ئەلکان و دەیان نارام و مامە ریشەدا... چاوی بە ئەسرین هەڵدەبڕین و لە ڕوانگەی ویستی سەردەم و ناستی

بیروبۆچوونی نوێ نەفرەت لە خود پەرستی و بیر تەسکی لایەنە کوردستانییەکان بکەین و بۆ لەبەین بردنی هەر کێشەیەکی لاوەکی و ناەموزوعیانە هەوڵێکی دڵسۆزانە بدەین تا دەتوانین بە هاوکاری پیاوچاکان بەردێک دەخەینە سەر دیواری یەکگرتن و تەبایی ناو ریزەکانی گەلە ستەم دیدەکەمان... تا بنەمایەکی سەخت و پتەوی قەڵای رزگاری یەکجارەکی نایندە دادەرێژین.. ئەگەر دەرفەتمان بدەن وەک کەس و زێد روو دەکەینەوە بارەگای هەردوو باڵی حیزبی دیموکراتی کوردستان / ئێران و لە سەرکردایەتییەکانیان دەخوازین با هەڵوێستەیەک لەبەردەم بکوژە دڕندەکانیان دا بکەن کە میشە ئەگەر بۆیان لوابێ ریزەکانی کوردیان پچڕ پچڕ و بەش بەش کردووە.. ویستویانە زمانمان لە پشتی سەرمانەوە دەربهێنن و کلتوور و کەلەپوورمان لە پێستی گادا بدوورن. ئەوا هەستمان و ئەوا دڵمان ئەوا نیزای وشە و چیرۆک و رۆمانی مێژوو دەکەینە چەپکە گوڵێکی رەنگاوڕەنگ و وەک دیاری شوان بۆ ناو رەشماڵی هەواری پڕ لە ئسکۆی هەردوو لایەنی حیزبی دیموکراتی کودستانی هێژای دەنێرین..

ئێمەش هەموو هەست و ئەست و گیانمان دەکەینە ئەستێرەی چاوڕوانی ئەو ساتەی مژدەی زەماوەندی ئەو دەستەملانە رادەگەیەنرێ تا لە سۆنگەی ئەو زەماوەندە دا شاگەشکە دەبین و گیانی شەهیدانی سەرجەم کوردستانی دڵ برینداریش ئاسوودە دەکەین.

١٩٩٤/٤/٢٠

**سەرجەم ناوی ئەدیب و رووناکبیرەکان :**

١- عەبدولقادر سەعید / ئەدیب
٢- عەبدوللا تاهیر بەرزنجی / ئەدیب
٣- جەمال محمد ئیسماعیل (سوارە) /شاعیر
٤- حەمە کەریم عارف / نووسەر و وەرگێڕ
٥- لەتیف هەڵمەت / شاعیر
٦- رئوف حسن / چیرۆکنووس
٧- ئەحمەد قادر سەعید/ ئەدیب
٨- بەهادین نوری باباعلی/ سیاسی و نووسەر
٩- عەبدوللا سۆفی کەریم/ سیاسی
١٠- قادر میرزا کەریم / ئەدیب
١١- عومەر مەحوی / ئەدیب
١٢- ئەنودر عارف قەرەچەتانی/ نووسەر
١٣- سەلام مەغی / چیرۆکنووس
١٤- سوارە قەرەداغی / ئەدیب
١٥- دیاری علی ئەحمەد / ئەدیب
١٦- عەبدوللا رەحمانی، ناسراوبە (د.هەژار) ئەدیب
١٧- جەمال غەمبار / شاعیر
١٨- فەردیدون دارتاش / هونەرمەند
١٩- فوئاد محەممەد ئەمین سەراج/ نووسەر
٢٠- رەئوف بێگەرد / چیرۆکنووس
٢١- هۆشیار بەرزنجی / ئەدیب
٢٢- حوسێن عوسمان / ئەدیب
٢٣- جیهاد دڵپاک / هونەرمەند
٢٤- عەبدول حەمە جوان / هونەرمەند

٢٥- جەلیل زەنگەنە / ئەدیب
٢٦- عەباس ئەلبەدری / نووسەر
٢٧- محەمەد نوری تۆفیق/ چیرۆکنووس
٢٨- عەبدول شاربازێری/ ئەدیب
٢٩- ئەحمەد ردزا / هونەرمەند و نووسەر
٣٠- عوسمان شەیدا / شاعیر
٣١- عەلی کەریم / ئەدیب
٣٢- محەمەد مەردان محەمەد / ئەدیب
٣٣- کەریم زەند / مێژوونووس
٣٤- مەحمود زێوەر / ئەدیب
٣٥- سەلام سەعید / ئەدیب
٣٦- بەهات حسیب قەرەداغی / شاعیر
٣٧- مستەفا صالح کەریم / چیرۆکنووس
٣٨- عەبدوڵڵا کەریم مەحمود / ئەدیب
٣٩- چنوور کەمال بابان / شاعیر
٤٠- سەلاح حەسەن پاڵەوان / ئەدیب
٤١- محەمەد فەریق حەسەن / چیرۆکنووس
٤٢- ئەحمەد سەلام / چیرۆکنووس

# (١٠)

## راگەیەندراوی مەکتەبی سیاسی
## بەبۆنەی تۆپ باران کردنی شاری قەلادزێی کوردستانی عێراق
## لە لایەن ڕێژیمی کۆماری ئیسلامییەوە

هاونیشتمانە بەڕێزەکان !

خەلکی خەباتگێری کوردستان!

بە دوای هەول و تێکۆشانی دلسۆزانەی حیزب و ڕێکخراوە سیاسی و جەماوەری و پیشەییەکانی کوردستان و هەروەها تەلاشی بێدریغی دۆستانی کورد لە هەندەران سەرەنجام ئاگری شەڕی دوو مانگەی براکوژی لە کوردستانی عێراق لە نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان- یەکگرتوو، تا ڕادەیەکی زۆر بەرەو کوژانەوە ڕۆیشت و ، دۆستان و دلسۆزانی گەلی کورد بەگشتی و ، خەلکی کوردستانی بەتایبەتی، شاد و خۆشحال کرد. هەروەها ڕێککەوتنی کۆڕی هەردوولا لە پاریس زیاتر هیواو ئومێدی خستە دلی خەلکی دلسۆتاوەوە، چونکە خەلکی کوردستان بە ڕەگ و پێستەوە هەست بەوە دەکەن کە شەڕی براکوژی شەری خۆکوژییە، شەڕی براکوژی بەفیرۆدانی خوێنی شەهیدانە، شەڕی براکوژی لە کیس چوونی دەسکەوتەکانی گەلە، و لە هەموان خراپتر شەڕی براکوژی دەرفەت بە دوژمنان دەدا کە لە ئاوی لیل ماسی بگرن. هەر بۆیەش ڕێژیمی دژی گەلیی کۆماری ئیسلامی کە نەک تەنیا دوژمنی سەرەکی گەلی کورد و هەموو گەلانی دیکەی ئێرانە، بەلکو دوژمنی خەلکی کوردستانی عێراق و حکوومەتی هەرێمیشە، بۆ ئەوەی لە ڕەوتی بەرەو پێشەوەچوونی ئاشتی پێشگیری بکا، لە سەعات (٥)ی ڕۆژی (١٩٩٤/٨/٦) ی زایینی بە شێوەیەکی وەحشیانە و کوێرکوێرانە بە پشتیوانی لە هێرشی بزووتنەوەی ئیسلامی، قەلادزێی وەبەر ئاگری تۆپی (١٧٥م.م) و کاتیوشادا، سەدان گوللە تۆپ و موشەکی کاتیوشا لە شار و دەوروبەری تەقییەوە کە بەداخێکی گرانەوە بووە هۆی شەهید بوونی (٣٠)کەس، کە زۆربەیان ژن و مندال و کەسانی بێ دیفاع بوون، لەوانە (١٣)مندالیان هی دوو بنەمالەی جگەر سوتاو و مال

ویران کراوبوون و، زیاتر له (۱۰۰)کەسیش بریندار بوون. بۆ ئێمە خەلکی کوردستانی ئێران، که ئەو رێژیمە خوێنمژه دەیان جار شارەکانی مەهاباد و سنه و بانه و سەقز و زۆربەی شار و گوندەکانی دیکەی کوردستانی وەبەر ئاگری تۆپ و خومپاره و کاتیۆشا داوه ئەو کاره شتێکی چاوەروان نەکراو نەبوو بەلام بۆ هێندێ خەلکی ساویلکه که ئێستاش پێیان وایه رێژیمی کۆماری ئیسلامی به پێی شەرع و قانونی ئیسلام دەجولێتەوه، ئەو کردەوه چاوەروان نەکراو بوو، چونکه ئەو کەسانه پێیان وانەبوو ئەو رێژیمه که ئیدعای ئیسلام پەناهی دەکا ئاوا به هاسانی ژن و منداڵی بێ تاوان به تۆپ و کاتیۆشا کوشتار بکا. بەلام دەبێ هەمووومان بزانین، که رێژیمی کۆنه پەرست و تیرۆریستپەروەری کۆماری ئیسلامی، نەک تەنها دوژمنی کورد و مرۆڤ به گشتییه، بەلکو به ژن و منداڵیش رەحم ناکا، ژن و منداڵێک که به پێی شەرع و قانونی ئیسلام که ئەو رێژیمه به درۆ ئیدعای پەیرەوی کردنی لێدەکا، کوشتنیان تاوانێکی زۆر گەورەیە. ئێمه لەگەڵ ئەوەی ئەو کردەوه درندانەی رێژیمی کۆماری ئیسلامی مەحکوم دەکەین به جیددی داوا له پارتی و یەکێتی دەکەین، پەیمانی یەکجاری بۆ نەهێشتنی شەر و ئالۆزی مۆر بکەن، با هەر کەس و هەر رێکخراوێک درێژەدەری ئەو شەرە بێ و، ماڵی خەلک وێران بکا و رۆڵەی خەلک بکوژێ، لەبەر بارەگای گەل و مێژوودا به تاوانبار بناسرێ. هەروەها داوا له کۆر و کۆمەڵه مرۆڤ دۆستەکانی جیهان دەکەین که ئەو کردەوه بێ بەزەییانەی رێژیمی کۆماری ئیسلامی مەحکوم بکەن، پێشی دەستتێوەردانی ئەم رێژیمه له کاروباری کوردستانی عیراق بگرن و ، نەهێلن لەمە زیاتر ئەو جینایەتانه دووپات ببنەوه.

**دەفتەری سیاسی**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**رێبەرایەتی شۆڕشگێر**
**۱۳۷۳/۵/۱۷ هەتاوی**
**۱۹۹٤/۸/۸ زایینی**

(١١)

# بەڕێز کاک مسعود بارزانی سەرۆکی
# پارتی دیموکراتی کوردستان/ یەکگرتوو

وێڕای سڵاو: هەروەکو ئاگادارن بە داخەوە وەزعی کوردستانی عێراق دیسان تووشی ئاڵۆزی و شەڕ و شۆڕ هاتووە لە نێوان پارتی دێموکرات و یەکێتی نیشتمانی کوردستان. لەگەڵ پەرۆشیمان بۆ ئەم وەزعە هیواداریین هەروەکو هەمیشە لە کاتی ئاسکدا بڕیاری پێویستتان داوە، ئەم جارەش بۆ ئاسایی کردنەوەی باری کوردستان و لەبار نەچوونی ئەزموونە دێموکراتییەکە بڕیاری پێویست بدەن.

**دەفتەری سیاسی**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**١٩٩٤/١٢/٢٤**

## (١٣)

## بەڕێز مام جلال تالەبانی سکرتێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان

وێڕای سڵاو

هەروەکو ئاگادارن بە داخەوە وەزعی کوردستانی عێراق دیسان تووشی ئاڵۆزی و شەڕ و شۆڕ هاتووە لە نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دێموکراتی کوردستان ــ یەکگرتوو. لەگەڵ پەرۆشیمان بۆ ئەم وەزعە هیوادارین هەروەکو هەمیشە لە کاتی ئاسکدا، بڕیاری پێویستتان داوە، ئەم جارەش بۆ ئاسایی کردنەوەی باری کوردستان و لەبار نەچوونی ئەزموونە دێموکراتییەکە بڕیاری پێویست بدەن.

**دەفتەری سیاسی**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**١٩٩٤/١٢/٢٤**

# (١٣)

## (کەڵاڵەی ئێمە بۆ تەواوکردنی شەڕی یەکەمی براکوژی کە دراوە بەهەردوو لایەنی شەڕەکە و هێزەکانی دیکە)

١- دانیشتنی هەرچی زووتری کاک مەسعود و مام جەلال.

٢- راگرتنی شەڕی تەبلیغی لە دژی یەکتر.

٣- راگەیاندنی هاوبەش و هاوکاتی ئاگربەس لە لایەن هەردوو حیزبەوە و، بەردانی هەموو ئەسیرەکان لە هەردووک لاوە، بەبێ هیچ شەرت و مەرجێک و ئەو پەردکەی هەتا (٤٨)سەعات دوای راگەیاندنی ئاگربەس.

٤- کێشانەوەی هێزەکان بۆ شوێنەکانی پێش هەڵگیرسانی شەڕ.

٥- چاوەدێری بەسەر ئاگربەس دا لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە بە سەلاحیەتی تەواوەوە.

٦- هەرکەس لە هەر شوێنێک ئاگربەس بشکێنێ، بە جیددی سزا بدرێ لە لایەن بەرەی کوردستانییەوە و بەرێوەبردنی بریاری بەرە لە لایەن پارتی و یەکێتییەوە بەسەر راستی.

٧-دەست بەکاربوونەوەی پەرلەمان و ئۆرگانەکانی سەر بە حکومەتی هەرێمی کوردستان.

٨- تەعمیر و ئاوەدانکردنەوەی هەر بنکەیەک کە لەلایەن هەرکام لەو دوو حیزبە دەستی بەسەر داگیراوە و وێران کراوە و، دانەوەی بە حیزبی خاوەن بنکە.

(١٤)

## هەڤاڵانی بەڕێز و برایانی تێکۆشەر
## کاک عبداللە ئۆج ئالان، سکرتێری گشتی پارتی کرێکارانی کوردستان
## کاک کەمال بورقای، سکرتێری گشتی پارتی سۆسیالستی کوردستان
## وێڕای سڵاوی گەرم و شۆڕشگێڕانە

لەلایەن خۆم و هاوڕێیانی ڕێبەرایەتی و هەموو کادر و پێشمەرگە و ئەندامانی حیزبەکانەوە، لە ناو دڵی چیاکانی کوردستانەوە، بە بۆنەی جەژنی نەورۆزی پیرۆزەوە، هەروەها بە بۆنەی دانیشتنە پڕسوود و برایانە دوو قۆڵییەکەتان کە بوو بە هۆی نووسین و بڵاوبوونەوەی بەیان نامە هاوبەشەکەتان، پڕبە دڵ پیرۆزباییتان لی دەکەم.

بێگومان ئەم کردەوە شۆڕشگێڕانە تین و توانێکی تازە بە خەباتی ڕەوای نەتەوەکەمان دەبەخشی. ئێمەش سەرکەوتنی زیاتر بۆ ئێوە بەڕێزان و پتەوتر بوونی ریزی خەباتکارانی کوردستان و هەموو ئازادیخوازانی جیهان بە گشتی و گەلی کورد بەتایبەتی بە ئاوات دەخوازین. هیواداریین ئەم کردەوە شۆڕشگێڕانەیەی ئێوە لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیش ڕەنگ بداتەوە.

**سکرتێری گشتی**
**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**
**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**نەورۆزی ٧٤**

## (١٥)

## بەڕێز بەڕێوەبەری وەزارەتی
## کاروباری دەرەوەی دەوڵەتی تورکیا

وێڕای سڵاو ! بەڕێزەوە ئاگادارتان دەکەین کە لە ڕێکەوتی ١٩ی نوێتی ١٩٩٣ هەواڵدەرێکی وڵاتی ئێوە محەممەد عەلی بیراند بەڕێوەبەری بەرنامەی سی و دووهەمین ڕۆژ لە کانالی (Show) سەردانی بنکەی دەفتەری سیاسی حیزبی ئێمە (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ)ی کرد کە کەوتوتە سنووری ئێران عێراق، بەرپرسانی حیزبی ئێمە، پێشوازی گەرمیان لێکردو زۆر لە شوێنەکانی بنکەی دەفتەری سیاسی وەکوو: بەشی رادیۆ، پارێزگاری و فێرگەیان پیشانی هەواڵدەری ناوبراو دا کە لە هەموویان عەکس و فیلمی هەڵگرت. بەڵام بە داخەوە ئەم هەواڵدەرەی وڵاتی ئێوە، عەکس و فیلمەکان، لەکەنالی (Show)دا بەناوی شوێنی گەریلاکانی (پ.ک.ک)وە بڵاو دەکاتەوە کە لە پاردەوە تا ئێستا چەندین جار لەم کەناڵە تلویزیۆنییەوە بڵاوکراونەوە، حیزبی ئێمە وێڕای دەربڕینی نارەزایی توند داوای تەعقیبی یاسایی ئەم مەسەلە دەکا. حیزبی ئێمە حیزبی خۆشەویستی گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانە و خوازیاری چارەسەری دیموکراتی و ئاشتیانەی مەسەلەی نەتەوەکانی ئێرانە کە، یەک لەوانە نەتەوەی تورکی ئازەربایجانە. حیزبی ئێمە دلنیایە ڕێژیی کۆماری ئیسلامی ئێران، بەهۆی هاندانی ئیسلامی بناژۆ لە وڵاتانی دراوسێ دەبێتە هۆی گێرەشێوێنی، تێک دانی هێمنی و پەرەنەستاندنی تیرۆریزم لەم وڵاتانە دا کە وڵاتی ئێوە تورکیاش دەگرێتەوە.

تکامان ئەوەیە لە گەیشتنی نامەکەمان و ئاکامی مەسەلەکە ئاگادارمان بکەنەوە.

**بەڕێوەبەری دەبیرخانەی**
**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**
**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**مانگی/٢/١٩٩٥**

## (١٦)

### بەرێز مەکتەبی سیاسی پارتی کرێکارانی کوردستان
### سلاوێکی شۆڕشگێرانە

بیستنی هەواڵی تێک هەڵچوونی چەکدارانەی نێوان پارتی و پ. ک. ک بۆتە هۆی نیگەرانی ئێمە و گشت کوردێکی دڵسۆز و نیشتمان پەروەر، ئێمە شەڕی نێوان هێزە سیاسییەکانی کوردستان، بەهەر بیانوویەک، بەتایبەت لەم هەلومەرجە ناسکە مێژووییەدا، بە دژی قازانج و بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کورد بەگشتی و گەلی کورد لە کوردستانی باشووردا دەزانین. هەوڵ و تێکۆشانتان بۆ کۆتایی هێنان بەم شەڕە بە بێ گومان تیشکی هیوا بەسەرکەوتن لە دڵی کۆمەڵانی خەلکی کوردستان دا بەهێزتر دەکا.

- وێنە بۆ/ پارتی دیموکراتی کوردستان یەکگرتوو

**دەفتەری سیاسی**
**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**
**رێبەرایەتی شۆڕشگێر**
**١٩٩٥/٨/٢٨**

## (١٧)

## بەرێز پرۆفیسۆر. جونیی کاپیتۆرن، نوێنەری تایبەتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر وەزعی ئێران

### کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ و نارەندی مافی مرۆڤ لە ژنێڤی سویس

جەنابی کاپیتۆرن:

وێرای سڵاوی گەرم لەم بابەتەوە کە ئێوە بۆ پێ ڕاگەیشتنی مەسەلەی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ لە ئێران دیاری کراون زۆر خۆشحالم. ئەوە بەرپرسایەتییەکی گەلێک گەورەیە وە ئەستۆت گرتووە و هیوادارم تێدا سەرکەوتوویی. هەر بۆیەش بە پێویست دەزانم لەم بابەتەوە زانیاری خۆمانتان بەتایبەتی لە کوردستان بۆ بنێرین بەڵکو لە روون کردنەوەی راستییەکان دا بەکەڵکت بێ.

بە کورتی عەرزت دەکەم کە بۆ هەشت میلیۆن کوردی ئێران یەک کلاسی زمانی کوردی و یەک کتێب بە زمانی کوردی بۆ خوێندن وجودی نییە.

رێژیمی کۆنە پەرستی ئێران هەموو حیزبە کوردستانییەکانی یاساغ و غەیرە قانونی راگەیاندووە، یەک لەوانە حیزبی ئێمەیە کە بە رابردووی پەنجا ساڵ خەباتی خۆی لە پێناو ئازادی و دیموکراسی دا هەڵوشاوە راگەیندراوە. خومەینی لە ساڵی (١٩٨٠) دا بە دژی گەلی کورد فتوای جیهادی دا و شەرێکی سەخت و خوێناوی بەسەر خەڵکی ئاشتی خوازی کوردستان دا سەپاند کە ئەوە شازدە ساڵە درێژەی هەیە.

لەو شەڕە نابەرامبەر و وێرانکەرەدا رێژیم لە فڕۆکە و بۆمباران و هەموو جۆرە چەکێکی قورس کەڵکی وەرگرتووە لە ئاکامی ئەو هێرشە دڕندانەدا تا ئێستا دەیان هەزار کەس لە دانیشتوانی شار و دێ شەهید بوون سێ ساڵ پێش بەکرێگیراوانی رێژیم ژەهریان لە چێشتی پێشمەرگەکانی ئێمە کرد، لە ئاکام دا بەشێک شەهید بوون و بەشێکی دیکەش بەژان و دەردەوە دەژین. بێ شک ئەو کارە زۆر سەیر و سەمەرە دێتە بەر چاوتان بەڵام بەتەواوی خاترجەم بە کە بە زۆر دەلیل و بەڵگەی زیندوو، ئەو کارە لە لایەن بەکرێگیراوانی رێژیمەوە کراوە.

بەڵێ ئەو رێژیمە زۆر جار هێرشی کردۆتە سەر خەڵکی بێدیفاعی گوندەکان و دانیشتوانی ئەو گوندانەی قەتل و عام کردووە و خەڵکێکی زۆری لە شارەکان ئیعدام کردووە کە ریزی بەشێک لە ئەوانەت دەگەڵ ئەو نامە دەنێرمە خزمەت.

ڕێژیم لەم دوایانەدا لەسەر چەند گوندی ناوچەی سەردشتی کردووە کە دەبێ بە زوویی ناوایییەکانیان چۆڵ کەن و بچنە شوێنی نادیار.

لە چەند ساڵی ووایی‌دا ڕێژیمی ئێران نەتەنیا بۆتە ناوەندی ڕاگواستنی تیرۆریزم بۆ شوێنەکانی جۆراوجۆری دنیا بەڵکو ئەرکی تیرۆریزمی دەولەتی بۆتە سیاسەتی ڕۆژانەی ڕێژیم بەشێوەیەک کە تا ئێستا لە وڵاتانی قبرس، ئۆتریش، سوئیس، فەڕەنسا، ئاڵمان، دانیمارک، سوئید، تورکیا، عیراق و هیندێک لە وڵاتانی تر توانیویەتی زۆرکەس تیرۆر بکا.

ڕێژیم بەکەڵک وەرگرتن لە ناتەبایی ناوخۆیی لە کوردستانی عێراق تا ئێستا توانیویەتی زیاتر لە (١٢٠)کەس لە ئەفرادی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی دانیشتووی ناوچە مەرزییەکانی کوردستانی عێراق تیرۆربکا کە لیستی (٢٨)کەس لەو کەسانە کەئەندام یا لایەنگری حیزبی ئێمە بوون و بوونە قوربانی سیاسەتی تیرۆریزمی دەولەتی ڕێژیم دەگەڵ ئەو نامە دەنێرمە خزمەتتان.

هیوادارم جەنابتان لەوەش ئاگادارین کە ڕێژیم لەیەک دووساڵی ڕابردوودا مەرزەکانی کوردستانی بەدرێژایی سەدان کیلۆمیتر هەڵکەندووە و کردوویەتە کاناڵ و جگە لەوەش بە تەواوی مینڕێژی کردووە و تا ئێستا سەدان کەس لە کاروانچی و بازرگانان و جووتیارانی کوردستان بوونە قوربانیی ئەم پیلانە.

بە دوای یەکەم سەفەری ڕەفسەنجانی بۆ کوردستان ڕێژیم لە سەرەتای ئوکتوبری ١٩٩٥ پەلاماری بردە سەر خەلکی شارەکانی کوردستان و بە سەدان کەسیان گرت و ڕەوانەی بەندیخانەیان کردن، لانی کەم تا ئێستا دەکەس لەوانە ئیعدام کراون و باقی ئەو زیندانییانە لەژێر هەلومەرجێکی زۆر نالەباردا ئەشکەنجە و ئازار دەدرێن.

هیوادارم دوای گەڕانەوەتان لە ئێران زیاتر لەو هەموو جینایەتەی ڕێژیم لە ئێران و کوردستان بە گشتی کردوویە ئاگادارین و ڕێگە حەلێک بۆ ڕەفعی ئەو گیروگرفتانەی ئەتەوەکەمان و هەلکەندنی ڕیشەی زولم و زۆر لە وڵاتەکەمان دا ببینیەوە.

پێشەکی لە هەول و تێکۆشانتان بۆ روون بونەوەی ڕاستییەکان سوپاس دەکەم.

**جەلیل گادانی**

**سکرتێری حیزبی دێموکراتی کوردستان**

**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**

**١ فێوریە ١٩٩٦**

## (١٨)

## (كۆنگرەس وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا)

**واشنگتۆن دی. سی.**
**پریزیدێنت ویلیام جیی. کلینتۆن،**
**کۆشکی سپی، واشنگتۆن دی. سی.**
**بەڕێز سەرۆک کۆمار**

ئێمە وەک ئەندامی کۆنگرە، ئیجازە دەخوازین لە دەوڵەتی بەڕێزتان داوا بکەین بۆ کۆمەک بەو ٢٤ میلیۆن کوردەی کە لە ئێران و عێراق دەژین و لەلایەن کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی و ڕژێمی سەدام حوسێنەوە لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ بێبەش کراون هەنگاوی جیددی هەڵبگرێ.

کوردەکان لە ژێر دەستی ئەو دوو ڕژێمە دا بە شێوەیەکی یەکجار دڕندانە ڕەفتاریان دەگەڵ دەکرێ. لە ئێرانێ، لە حاڵێکدا کە بە سەدان گوند وێران کراون، زیاتر لە دەیان هەزار کوردیش گیانی خۆیان لەدەست داوە. هەر لەم دواییانەدا، ڕێبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کەوتنە بەر هێرشی تیرۆریستانەی دەوڵەتی ئێرانێ. دوو کەس لەو ڕێبەرانە، یەک لە ئۆتریش و یەکیشیان لە ئاڵمانیا، تیرۆر کران. بێجگە لەوەش، ژمارەیەک زیندانی سیاسیش ئێعدام کراون.

بە بڕوای ئێمە ئەگەر بێتو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و باقیی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەروا بێدەنگ دانیشن، زۆر کەسی دیکەش گیانی خۆیان لە دەست دەدەن. کوردەکانی ئێران هەوەڵین خەڵکێک بوون کە حکوومەتی ئایەتوڵاکانیان قەبووڵ نەکرد و پێش هەموو کەسیش دەست بەسەرداگیرانی باڵوێزخانەی ئەمریکایان لە ساڵی ١٩٧٩ مەحکووم کرد. پاش شەڕی کەنداو، کوردەکانی عێراقێ لە دژی سەدام حوسێنی ڕاپەڕین، بەڵام زۆر دڕندانە سەرکوت کران.

کوردەکانی عێراق و ئێرانێ هەمیشە لە ژێر ترس و خۆفی تۆڵە لێئەستاندنەوەکانی دەوڵەتەکانیاندا ژیان بەسەر دەبەن. هەرچەند دەگەڵ چەند کەس لە بەرپرسانی کورد هێندێک وتوێژمان هەبووە، بەڵام دەبێ سیاسەتی ئێمە لە پێوەندی دەگەڵ ئەواندا

لێبڕاوانەترین. ئێمە چاوەڕوانین کە دەوڵەت بۆ ئەوەی لە مەسەلەی پارێزگاری لە کوردەکانی ئێران و عێراقی بەتەواوی ئەرخەیان بێ، دەبێ وتووێژێکی زۆر جیددیتر وەئەستۆ بگرێ.

بەڕێزەوە

تام لانتوس　　　جان ئیدوارد پۆرتر

ئەندامی کۆنگرە　　　ئەندامی کۆنگرە

باقی ئیمزاکان

٥ی فیوریەی ١٩٩٦

ئەوەش وێنەی ئیمزاکان بە گشتی:

(١٩)

## جەنابی پورتێر
## وێنە بۆ خاوەنی باقی ئیمزاکان

**وێڕای سڵاو**

لەو ڕۆژانە دا بۆ یەکەم جار بەمەبەستی بەڕێوەبردنی ئەرکی حیزبی و ئەنجام دانی زنجیرە چاوپێکەوتنێک دەگەڵ بەرپرسانی، کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی و مرۆڤدۆستەکان و کەسایەتییە سیاسییەکانی ئەمریکا هاتبوومە واشەنگتۆن. حەزم دەکرد چاوم بە جەنابیشت کەوتبا و بە درێژی لە سەر وەزعی ئێران و کوردستان بۆتان بدوێم. بەداخەوە لەبەر کەمی کاتی سەفەرەکەم بۆم نەلوا.

بە پێویست دەزانم لە ڕێگەی ئەو یادداشتەوە کە لە ڕێکەوتی پێنجی فێوریە دا جەنابت و بیست و یەک کەسی دیکە لە کۆنگرێسمانەکان لە مەڕ پێویستی پشتیوانی زیاتر لە گەلی کورد بۆ پرێزیدێنت کلینتۆنتان نووسیوە پڕبەدڵ سوپاستان بکەم.

سەرکەوتنتان لە پێناو کاری خێرخوازانە و بیروبۆچوونی مرۆڤدۆستانەدا بە ئاوات دەخوازم.

**جەلیل گادانی**
**سکرتێری گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**١٣ی مارسی ١٩٩٦**

(٢٠)

## بەڕێز هانک براون
## سەرۆکی کومیتەی فەرعیی ڕۆژهەڵاتی نزیک و ئاسیای باشوور،
## مەجلیسی سەنای ئەمریکا
## واشنگتون دی. سی

**بەڕێز: جەنابی سەرۆک**

ڕێگام بدەن لە پێوەندی دەگەڵ یەکەم سەردانم لە وڵاتە یەکگرتووەکان کە بە مەبەستی ڕوونکرنەوەی هەلومەرجی گشتیی ئێران، لە لایەک و ، سەرکوتی گشت لایەنەی خەڵکی کوردستان، لە لایەکی دیکەوە، کردوومە، هێندێک واقعییەتی تاڵ و دڵتەزێن بخەمە بەر چاوی ئێوەی بەڕێزەوە.

ڕێژیمی ئێران لە ماوەی ١٧ ساڵ دەسەڵاتی ڕەشی خۆیدا، بێجگە لە مەرگ و کوشت و کوشتار، هەژاری و چارەڕەشی، نەزانی و دەمارگرژی و ، وێرانکاری و لە ژێر پێنانی یاسا و ڕێسا نێونەتەوەییەکان لە دژی ئێرانییەکان و خەڵکی جیهان، هیچ شتێکی دیکەی دەگەڵ خۆی نەهێناوە.

نرخی سەرسوڕ هێنەری شتومەک، بێکاری، دەستەنگی و هەژاری، خراپە و فەساد سەرتاپای وڵاتەکەمانی داگرتووە و ، پایە و بناخەی ئابووریی وڵات بە تەواوی لەبەر یەک هەڵتەکاوە، بە چەشنێک کە سەرەڕای ئەو هەمو کانگا بە پیت و بەرەکەتانەی وڵاتەکەمان، لە ئاکامی قازانج پەرەستی ناخوندەکان و کەڵکی خراپ وەرگرتنیان لە دەسەڵات و ، هەروەها بە هۆی ئاژاوەگێڕی ئەو ئاخوندانە کە بە مەبەستی زێدەخوازی و درێژەدانی بەرنامەی سەرکوتی خەڵک لە نێوخۆی وڵات دا بەڕێوەی دەبەن، ئێستا ئێران چل میلیارد دولار بە وڵاتانی دەرەوە قەرزدارە.

لە ئێرانی ئەمڕۆدا مرۆڤ و مرۆڤایەتی مانا و واتای خۆیان لە دەست داوە. درێژەکێشانی سەرکوتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ، گوشارێکی لە ڕادەبەدەر کە لەسەر ئەو خەڵکەیە، ئەم وڵاتە دەوڵەمەند و جوان و لە مێژینەیەی وەک سەربازخانەیەکی زەبەلاح و بەندیخانەیەکی بەسام لێ کردووە.

هەتا ئێستا خوێنی دەیان هەزار کەس لە هاووڵاتییانی ئێمە بە تاوانی بیروڕای

سیاسی و هێنانە ژێر پرسیاری دەسەڵاتی ناخوندە بناژۆکان رژاوەتە سەر خاکی وڵات: تەواوی سەمبولە فەرهەنگی، ئەدەبی و مێژوویی وڵاتەکەمان لە نێو چوون: مافی نەتەوایەتیی هەموو گەلان و کەمایەتییە ئایینییەکانی ئێران لە ئاکامی خۆ رانان لە ژێر پەردەی "ئیسلام" لە ژێر پێ نراوە.

رێگام بدە ئەو راستییەش بخەمە بەر چاوی بەرێزتان کە بۆ وێنە بۆ نزیک بە ٨ میلیون کوردی ئێرانی نە کلاسێکی زمانی کوردی و نە تاقە کتێبێک بۆ فێرکاری ئەو زمانە لە گۆڕێ دا هەیە.

هەموو حیزب و رێکخراوە لائیکەکان و دژی بناژۆیی، پێشکەوتوو و دژی ویلایەتی فەقیە قەدەغە کراون و گشت ئەیارانی رێژیم لە مەترسی زیندان و مەرگ دان.

حیزبی ئێمە کە حیزبێکی نەتەوەیی و دێموکراتە، بە ٥٠ساڵ رابردووی خەبات و تێکۆشانەوە لە پێناو دامەزراندنی دێموکراسی لە ئێران و دابین کردنی مافی گەلانی ئێران، هەرگیز خوازیاری مافێکی زیاتر لە مافی خودموختاری نەبووە. بەو حاڵەش لە ساڵی ١٩٨٠وە لە لایەن رێژیمی ناخوندەکانەوە دژ بە یاسا و هەڵوەشاوە راگەیەندراوە و ، لە ئاکام دا و لەو ساڵەوە هەتا ئێستا لە هەر چەشنە چالاکییەکی ئازادانە بێبەش کراوە.

خومەینی لە وڵامی داخوازەکانی ئێمە دا، لە ساڵی ١٩٨٠ لە دژی خەڵکی ئاشتیخوازی کوردی ئێران "جیهاد"ی راگەیاند و هەر دوابەدوای ئەو "فتوایە"ش، شەڕێکی گشت لایەنەی بەسەر ئەم گەلە دا سەپاند، شەڕێک کە ١٦ ساڵی رەبەقە هەروا درێژەی هەیە.

لەو بەربەرەکانییە نابەرابەرەدا، رێژیم لە هێزی هەوایی و بۆمبی ناپاڵم و تۆپخانەی قورس کەڵکی وەرگرتووە. لە ئاکامدا، دەیان هەزار کەس لە خەڵکی بێتاوان و بێدیفاع لە شار و گوندەکانی کوردستان شەهید بوون و دەیان هەزار کەسیش ئاوارە و دەربەدەر بوون.

ئەم رێژیمە نەک هەر دەستی داوەتە ئێعدامی بە کۆمەڵ و بێ موحاکەمەی ئەو خەڵکە، بەڵکو ژەهری لە ناوی خواردنەوەی ئەندامانی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی کردووە و ، لە هەر جێگایەک بۆی لواوە تیرۆری کردوون. سەدان گوندی وێران کردوون و ، دانیشتوانی ئەو گوندانەی بۆ شوێنی دیکە راگواستوون و قەتلوعامی کردوون.

لەگەڵ ئەم نامەیە ناوی ٧٤٢ شەهید (هەتا ساڵی ١٩٩٠) و هەروەها ناوی ١٣٠ گوندی وێران کراوم ناردۆتە خزمەتتان.

تیرۆریزمی دەوڵەتی شێوەکاری رەسمی و هەمیشەیی ئەم رێژیمە بووە. نزیک بە ٢٠٠

کەس لە ئەندامانی ئۆپۆزسیۆن لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی جیهان، وەک قبریس، سویس، ئۆتریش، ئاڵمان، دانیمارک، تورکیا و عێراق بە دەستووری ئەم ڕێژیمە کوژراون. بێجگە لەوەش، ناوی ۳۰ کەسی دیکەش لە ئەندامان و لایەنگرانی حیزب و ۳۸ کەسی تر لە ئەندامانی حیزب و ڕێکخراوە کوردییەکانی دیکەتان پێشکەش دەکەم کە لە ماوەی چوار ساڵی رابردوو دا بە دەستووری ڕێژیم کوژراون.

بۆ بەربەست کردنەوەی ڕێگای هاتووچووی کوردەکانی ئێران و عێراق بە سنووری نێوان ئەو دوو وڵاتەدا، کارێک کە لە چەند سەدە لەمەو پێشەوە هەر بەردەوام بووە، ڕێژیمی ئێران هاتووە کاناڵی زۆر قووڵ و بەرینی هەڵکەندوون و دەوروبەری ئەو کاناڵانەی مینچێن کردووە. ئەمەش کارێکە کە بۆتە هۆی کوژران یا کەمئەندامبوونی سەدان کەس لە خەڵکی ساکاری وەک شوان، کاروانچی، بازرگان و وەرزێری کورد.

بە هەزاران کەس لە خراپترین هەلومەرج دا لە بەندیخانەکانی ڕێژیمیدا ڕاگیراون و هەمووشیان بە "تاوانی" بیروبڕوای ئازادیخوازانە کەوتوونەتە بەر ئەشکەنجە و لێدان و کوتانەوە. ژمارەیەکی بەرچاو لە لاوانی کورد، بەتایبەت لە پارێزگاکانی ڕۆژئاوای وڵاتدا، زیندانی کراون. لە ساڵی ۱۹۹۵، چەند جار بازداشتی بەکۆمەڵی خەڵک رووی داوە و لە ئاکامدا لانی کەم دە کەس لە ڕۆژەکانی کۆتایی ئەو ساڵەدا ئێعدام کراون.

بەلەبەر چاوگرتنی ئەم وەزعییەتەی کە لە گۆڕێ دایە، بێجگە لە شێلگیر بوون لەسەر درێژەدانی خەبات لە دژی ئەو ڕێژیمە جینایەتکارە هەتا دامەزرانی سیستەمێکی دێموکراتیک و گەلی لە وڵاتەکەمان، هیچ ڕێگایەکی دیکەمان لە پێش نییە. بۆ ئەم مەبەستەش هێندێک هەنگاوی دێموکراتیکانە هەڵێنراوەتەوە، حیزبی ئێمە بە هاوکاری دەگەڵ باقیی ڕێکخراوەکانی کورد، لە لایەک و ، هێزە سەرانسەرییەکان، یەک لەوان "شورای ملی مقاومت ایران"، لە لایەکی دیکەوە، هەنگاوی زۆر گرینگمان هەڵگرتووە. لە هەمان کاتدا، بە دڵەوە خوازیاری هاوکاری دەگەڵ هەموو ئەو لایەنانەین کە ئاشق و دڵبەستەی ئازادیی مرۆڤ لە سەرانسەری جیهانن.

بەم هۆیەوە لە ئێوەی بەڕێز داوا دەکەین لە هەر ڕێگایەکەوە کە بۆتان دەکرێ لەبزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد پشتیوانی و بە دامەزراندنی دێموکراسی لە ئێران کۆمەک بکەن.

بەم هیوایە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ـ بێجگە لە گەمارۆی ئابووری کە خستوویەتە سەر ئێران و ئێمەش بە تەواوی تەئییدی دەکەین ـ بۆ کۆتایی هێنان بە

دەسەڵاتی رەشی ئاخوندەکان لە ئێران، کە هۆکاری سەرەکی وێرانکاری و تیرۆریزمن، بە نەخشە و بەرنامەیەکی دیکەوە دەست بەکار بن و بەشێوەیەکی بەربلاوتر و جیددیتر دەگەڵ هێزە ئازادیخواز و بە تواناکانی ئۆپۆزیسیۆن هاوکاری بکەن.

لەو دواییانە دا، ٢٢ کەس لە ئەندامانی کۆنگرە نامەیەکیان بۆ پرێزیدێنت بیل کلینتۆن نووسی، لەو نامەیەدا، وێرای پشتیوانی کردن لە خەڵکی کوردستان، بە حەقیش خوازیاری هەنگاوی جیددیتر لەو پێناوەدا بوون. بە بڕوای ئێمە هەڵێنانەوەی هەر هەنگاوێکی جیددی لە پێوەندی لەگەڵ وەزعییەتی کوردستان و رێژیمی کۆماری ئیسلامی پێویستییەکی بێ ئەملا و ئەولای مێژووییە و، هەر چەشنە کەمتەرخەمییەک لەم باردوە دەبێتە هۆی هەرچی زیاتر بێسەرەوبەرەیی لە ئێران و رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و سەرانسەری جیهاندا.

لە ماوەی ئەم حەوتووەی کە دەرفەتی مانەوەم لە واشنگتۆن هەیە، زۆر هەست بە خۆشحاڵی دەکەم کە ئەگەر بکرێ چاوم بە جەنابتان و باقی ئەندامانی کۆنگرە بکەوێ بۆ ئەوەی بتوانم مەسەلەکان باشتر روونبکەمەوە و پرسیارەکانتان وەڵام بدەمەوە.

**دەگەڵ رێز و حورمەت**
**جەلیل گادانی**
**سکرتێری گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**

# (٢١)

## راگەیەنراوی کۆمیتەی ناوەندی بە بۆنەی کۆچی کاک نەبی قادری ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بەرپرسی گشتیی کۆمیتەکانی حیزب لە دەرەوەی وڵات

**هاووڵاتییە بەڕێزەکان!**
**خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!**
**ئەندامان، کادر و پێشمەرگە دلێرەکانی حیزب!**

بە داخ و کەسەرێکی گرانەوە. کادری کارامە و تێکۆشەر و ئەندامی لێوەشاوە و بەوەجی ڕێبەرایەتی حیزبەکەمان رۆڵەی بەنەمەگ و ماندوویی نەناسی گەل و پێشمەرگەی ئازا و بە جەرگی نیشتمان و نموونەی هەڵکەوتووی هەموو خووخدەیەکی بەرزی ئینسانی، کاک نەبی قادری، بەهۆی نەخۆشیی سەرەتانەوە سەعات شەشی ئێواردی دووشەممە ٢ی دیسامبری ١٩٩٦ بەرامبەر ١٢ی سەرماوەزی ١٣٧٥ لە شاری کۆپنهاگ پێتەختی دانیمارک، دڵی پڕ لە ئاواتی بۆ سەرکەوتنی گەلی کوردی بەشخوراو و دابەشکراو لە لێدان کەوت و بەم جۆرە هاوڕێیان و هاوسەنگەرانی خەفەتبار و دۆستان و ئاشنایان و ئەندامانی بنەماڵەی کوردپەروەر و وڵاتپارێزی قادری، تازیەدار کرد.

کاک نەبی، لە ساڵی (١٣٢٠ ی) هەتاوی لە گوندی سوفیان-ی سەر بە ناوچەی لاجانی پیرانشار لە بنەماڵەیەکی سەر بە عەشیرەتی مامەش لە دایک بوو و لە باوەشی گەرم و پڕ لە هەستی کوردایەتی دا گەورە بوو و هەست و بیری بە ناوی پاکی نیشتمانپەروەری و گەل دۆستی پەروەردە بوو. خوێندنی سەرەتایی لە شاری شنۆ تەواو کردو لە ساڵی ١٣٤٠ چووبۆ (دانشسرای مقدماتی) لە شاری ورمێ و، دوای تەواو کردنی سەرکەوتوانەی ئەو ئاوەندە ئامووزشییە لە شنۆ بوو بە مامۆستای قوتابخانە و، هەر لەو شارەش لە ساڵی(١٣٤١)دا بە نهێنی بوو بە ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. پاش ماوەیەک بۆ درێژەدانی خوێندن چووبۆ تاران و لەزانستگەی گەورەی ئەو شارە دەرەجەی لیسانسی لە رشتەی جوغرافی دا وەرگرت و، سەر لە نوێ گەڕایەوە بۆ شارەکەی و، کاری فەرهەنگیی خۆی لەتاکە دەبیرستانی ئەو شارە درێژە دا. لە ساڵی١٣٥٥ دا شوورای شاری شنۆ ئەو رۆڵە پاک و ئەمەگناسەی وەک شارداری شار هەڵبژارد، بەڵام کاک نەبی کە لە شێوەی بەڕێوەچوونی دام و دەزگا دەوڵەتییەکان بە تەواوی بێزار بوو. زۆر

زوو لەو کارە خۆی کێشایەوە و بۆ خزمەت بە منداڵانی کورد گەڕایەوە سەر کاری پەروەردە و فێر کردن. بە دەستپێکردنی شۆڕشی گەلانی ئێران، کار و تێکۆشانی حیزبیی کاک نەبی لە شێوەی نهێنی هاتەدەر و گوڕ و تینێکی بەرچاوی پەیدا کرد. ئیمانی پتەو بە خەباتی رزگاریخوازانەی حیزب و هەوڵ و تێکۆشانی بێ وچانی لە لایەک و پاکی و دروستی و فیداکاری و لە خۆبوردوویی بێ هەرچەشنە چاوەڕوانییەکی ئەو رۆڵە هەڵکەوتووی گەل و حیزب لەلایەکی دیکەوە بوون بە هۆی ئەوە کە لە کۆنگرەی پێنجەمی حیزب شەرەفی ئەندامەتی کومیتەی ناوەندیی پێ بدرێ و، لە کۆنفرانسی چوارەمیش دا بە ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی هەڵبژێردرێ.

کاک نەبی لە ماوەی نزیک بە هەژدە ساڵ بەشداری چالاکانەی لە بزووتنەوەی میللی دێموکراتیکی گەلی کوردمان لە کوردستانی ئێران کرد و ، دەکرێ بڵێین لە هەموو ناوچەکانی کوردستان لە باکووری کوردستانەوە هەتا باشوور مەئموورییەتی حیزبی بەڕێوەبرد و لەهەموو ئەو ماوەیەدا سەرەڕای گیروگرفتی بێ ئەژمار، ئەرکی حیزبی و مەئموورییەتی پێ ئەسپێردراوی بە دڵسۆزیی تەواو و بە ئیمانی پتەوەوە بەڕێوەبرد و لە زۆربەی نزیک بە تەواویان دا سەرکەوتنی وەدەست هێنا.

کاک نەبی، بێجگە لەوە کە پێشمەرگەیەکی ئازا و تێکۆشەرێکی بەجەرگ بوو، ئینسانێکی پێشکەوتنخواز، دێموکراتێکی راستەقینە و کەسایەتییەکی مرۆڤدۆست و لایەنگر و پارێزەری مافی چین و توێژە چەوساوەکان و پیاوێکی ئازادیخواز و خەباتگێرێکی بە ئیمانی رێگای رزگاریی ئینسان لە هەر چەشنە چەوسانەوەیەک بوو.

لایەنگران، ئەندامان و کادر و پێشمەرگە دلێرەکانی حیزب!

بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو راستییانە کە ئاماژەمان پێ کرد، کومیتەی ناوەندیی حیزب لە دەست چوونی کاک نەبی قادری بە خەسارێکی گەورە بۆ حیزب و بزووتنەوەی گەلەکەمان لە کوردستانی ئێران دەزانێ و بەم بۆنەوە لە هەموو ئێوە هاوسەنگەرانی و لە خەڵکی ئەمەگناسی کورد، بەتایبەتی لە بنەماڵەی کوردپەروەر و وڵاتپارێزی قادری لەناخی دەرونەوە سەرەخۆشی دەکا و لەبەرامبەر ناوی هەمیشە بەرزی کاک نەبی دا سەری ئەوازش و کرنۆش دادەنوێنێ.

**بەرزێ بێ یادی رۆڵەی هەڵکەوتووی حیزب و گەل، هاورێ نەبی قادری**

**کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**

**رێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ**

**١٣٧٥/٩/١٣ - ١٩٩٦/١٢/٣**

## (٢٢)

# بانگەوازی هاوبەشی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران - ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر و کۆمەڵە

بۆ کۆمەلانی خەلکی ئازادیخواز لە کوردستانی عێراق
جەماوەری خەلکی ئازادیخواز لە کوردستانی عێراق!

لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی ئێران لە جەرگەی شارەکان و شوێنی ژیانی ئێوەدا، هەتا هاتووە پەرەی گرتووە. پەنابەرانی سیاسی، ئاوارەکان، لایەنگران و ئەندامانی حیزبە سیاسی- یەکانی کوردستانی ئێران، بەردەوام کەوتوونەتە بەر پەلاماری تاقمە تیرۆریست و ئینسانکوژەکانی حکوومەتی ئێران. هەتا ئێستا زیاتر لە (١١٠) کەس لەوانە، لە ئەنجامی پیلانە جۆراوجۆرەکانی ئەو تاقمە ئینسانکوژانە لە کوردستانی عێراق گیانی خۆیان لە دەست داوەو ژمارەیەکی لەوە زیاتریش بریندار بوون. جگە لەوەش، هەتا ئێستا دەیان پیلانی ئەو تاقمانە پووچەل کراونەتەوە کە هۆشیاری و هاوکاری ئێوە خەلکی تێکۆشەر و دڵسۆز، لە پووچەل کردنەوەیاندا، دەوری بەرچاوی بووە و، بێگومان ئەگەر ئەوە نەبوایە ژمارەی قوربانییەکان لەوەش زیاتر دەبوو. ئەوانەی بەم جۆرە دەستدرێژی دەکرێتە سەر گیانیان و پارە بۆ سەریان دەدرێ و دەستەی ئینسانکوژان لە دژیان کۆ دەکرێنەوە و چەکدار دەکرێن، ئەوانە پەنابەرانی سیاسی کوردستانی ئێران، یا لایەنگر و تێکۆشەری حیزبە سیاسییەکانی ناو بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کۆمەلانی خەلکی زۆرلێکراو لە کوردستانی ئێرانن. ڕێژیمی سەرکوتکەرو کۆنەپەرستی ئێران بە دەستدرێژی بۆ سەر گیانی ئەو کەسانە دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ هەرچەشنە ئازادیخوازی و هەقخوازییەک نیشان دەدا. ئەو ڕێژیمە، دوژمنی هەموو ماف و ئازادییەکانی خەلکی کوردستانە، لە گشت بارێکەوە.

ئەو ڕێژیمە هەتا ئێستا بۆ لە گەرێژنە بردنی بزووتنەوەی ئێوە لە دەست بردن بۆ هیچ

چەشنە پیلانگێڕان و ئاژاوە نانەوەیەک نەپرینگاوەتەوە.، تۆپ باران و مووشەک باران کردنی شارۆچکە و ئاواییەکانی سەر سنوور، رووخاندنی مالی دانیشتوانی ئاواییەکان، سوتاندنی رەز و باغ و مووچە و مەزرا و خەلە و خەرمانی خەلکی هەژاری ئەو ناوچانە کە بەهەزار مەینەت و دوای ساڵەها ئاوارەیی پارچە زەوییەکیان بە چنگەکرێ وەبەرهەم هێناوە، ئاودێوکردنی کەل و پەلی کارگاکان و نەخۆشخانەکان و پرۆژەکانی پیشەسازی و کشتوکال و ئاوەدانکردنەوە بە نیازی بنکۆل کردنی بناغەی ئابووری لەم ناوچەیە، رێگا گرتن و سنوور داخستن لەسەر هاتنی ئازووقە و کەلوپەل بۆ خەلکی موحتاج لەم دیوی سنوور، پێکهێنانی تۆڕ و شەبەکەی خراپەکاری و تەقاندنەوە و تیرۆر، هاندان و پەرەپیدانی کۆنەپەرستی، ئاژاوەنانەوە و خۆشکردنی ئاگری شەڕی ناوخۆ، دارشتنی کەلالە و پیلانی سێقۆلیی هاوبەش لەگەل دەولەتانی ناوچەکە لە دژی خەلکی کوردستانی عیراق و، زۆر کار و کردەوەی دزێو و دژی ئینسانی دیکە، چەند لاپەڕەیەکی لە کارنامەی رەشی ئەو رێژیمەکۆنەپەرستە لە دژی ژیان و بەرژەوەندییەکانی ئێوە.

ئێستاش ئەو رێژیمە، لەگەل بەدناوترین و جینایەتکارترین دەستە و تاقمی خۆفرۆش و ئینسانکوژ لە کوردستانی عیراق بێوچان خەریکی دارشتن و بەرێوەبردنی پیلانی جینایەتکارانەن بۆ ئەوەی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی ئێوە بەدناو بکەن. دەیەوێ هەستی هاوددەر و هاوچارەنووسی لە نێوان خەلکی زەحمەتکێش و زۆرلێکراو لە کوردستانی ئێران و عێراق ژەهراوی بکا. دەیەوێ کەلێن و ناتەبایی بخاتە نێوانیان، دەیەوێ تۆوی بێ باوەری و بەدبینی لەناویاندا بچێنێ و لەبەرچاوی یەکتر ناحەزیان کا، دەیەوێ لەنێو خەلکی کوردستانی ئێراندا ئەو هەستە ببزوێنێ کە گیانی رۆلەکانیان لە کوردستانی عێراق پارێزراو نییە و بایەخی بۆ دانانرێ. ئەوە هەستێکی تال و زیانبارە کەنابێ رێگەی پێ بدرێ. .نابێ رێگە بدرێ پەیوەندی ریشەداری خەلکێک کە بەدرێژایی ساڵەهای سال بەوە ناسراون بەهانای یەکترەوە چوون و لە هەرتک لا پشتیوان و هاودل و هاوددرد بوون، بەم شێوەیە بنکۆل بکرێ. ئەم پیوەندییە بە نرخە، دەسکەوتی ساڵەها فریای یەکتر کەوتن و سفرە بۆ یەکتر راخستنە و پێویستە بپارێزرێ.

لە رووناکایی ئەو راستییانە دایە کە ئێمە:

داوا لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەکەین بۆ بە سزا گەیاندنی تیرۆریستەکان بە جیددی هەول بدا بۆ ئەوەی کە هەرێمی کوردستان چیدی نەبێتە بنکەی تیرۆریزم.

داوا لە حیزب و رێکخراوە سیاسی و سنفییەکان دەکەین ئەندامان و لایەنگرانی

خۆیان هان بدەن تیرۆریستەکان بە دەزگاکانی ئاسایش و دادگاکان لە کوردستانی عێراق بناسێنن.

داوا لە نووسەران، شاعیران و گشت هونەرمەندانی ئازادیخواز و مرۆڤدۆست دەکەین بە خامە و هونەری خۆیان دژی ئەم دیاردە دزێوەی کە لە کوردستان سەری هەڵداوە هەلوێست بگرن.

هەروەها لە هەموو ئەو کەسانەی خەبات لە دژی زۆرداری، ستەمکاری و کۆنەپەرستی بە لایانەوە رێز و بایەخی هەیە و، لە هەموو ئەوانەی ئایانەوێ وڵاتەکەیان ببێتە مەیدانی هەڵسوڕانی دەزگاکانی ئیتلاعات و جاسوسی و گۆڕەپانی شەڕناخێوی تاقمە تیرۆریستەکان، داوا دەکەین بۆ کۆتایی پێ هێنان و بەربەست کردنی تیرۆریزمی رێژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران لە کوردستانی عێراق بە هەموو توانایانەوە هەوڵ بدەن.

**سازمانی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران-کۆمەڵە**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران-رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ**
**مارسی ١٩٩٦**

- وێنە بۆ/ گشت رێکخراوە مرۆڤدۆستە جیهانییەکان.

# (٣٣)
# بەیاننامەی هاوبەش

**کۆمەڵانی خەباتگێڕی خەڵکی کوردستان!**
**حیزب و ڕێکخراوە سیاسییە کوردستانی و ئێرانییەکان!**
**دۆستانی گەلی کورد لە سەرانسەری جیهان دا!**

پاش کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، بەشێک لە کادر و ئەندامانی حیزب، بە هۆی هێندێک گیروگرفتی نێوخۆیی، لە سەرەتای مانگی خاکەلێوەی ١٣٦٧ ی هەتاویدا بەناوی (حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕیبەرایەتی شۆڕشگێر) (اعلام موجودیت) یان کرد و لە ژێر ئەو ناوەدا تێکۆشانی خۆیان درێژە پێدا. ماوەی (٨) ساڵ بوونی دوو ڕێکخراو بە ناوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و ئەو گیروگرفتانە کە بەوهۆیەوە هاتە پێشەوە، زیانێکی زۆریان لەبزووتنەوەی میللی - دێموکراتیکی خەڵکی کوردستانی ئێراندا. بە خۆشییەوە دوای هەوڵ و کۆششی دڵسۆزانی حیزب و دۆستانی گەلی کورد، لە بەهاری ساڵی ١٣٧٤ دوە دەرگای وتوویژ بۆ چارەسەری ئەو گیروگرفتانە کرایەوە. پاش چەند کۆبوونەوەی باس و راوێژ، هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە دیاردەی بوونی دوو ڕێکخراو بەناوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کۆتایی پێ بهێنن و هەموو تێکۆشەرانی دێموکرات لە ریزێکی یەکگرتوو دا خەباتی خۆیان بۆ وەدیهێنانی دروشمی لەمێژینەی حیزب (دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان) درێژە پێ بدەن. بۆیە بە خۆشحاڵییەوە مزگێنی بە هەموو دڵسۆزانی حیزب و گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و هەموو ئۆگرانی ئاشتی و ئازادی دەدەین کە لە دەرچوونی ئەم بەیاننامەیەوە، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، حیزبی هەموو تێکۆشەرانی دێموکراتە و ئەو ئاواتە پیرۆزەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و دۆستانی حیزب وەدی هاتووە. هیوادارین ئەم هەنگاوە پیرۆز و بەرپرسانەیە، گوڕوتینێکی زیاتر بە خەباتی ڕزگاریخوازانەی حیزبی دێموکرات و کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی ئێران بدا و لە وەدەست هێنانی ماف و ئازادییەکانیان نیزیکتریان بخاتەوە.

بەم بۆنەیەوە، داوا لە تێکرای تێکۆشەرانی دێموکرات دەکەین، بە سەرنجدان بە گرنگیی ئەم هەنگاوە پیرۆزە، چەندی بکرێ زیاتر گیانی هاوکاری و برایەتی و تەبایی لە نێو

خۆیان دا بەهێز بکەن. پێویستە یەکدلی و یەکپارچەیی لە هەموو ئاکار و رەفتارێکی خەباتگێرانی دێموکرات دا رەنگ بداتەوە و بەم جۆرە دڵی دۆستانیان شاد بکەن و هەموو ئەوانەی ویستویانە لە ناکۆکیی نێو ریزەکانی حیزب بە زیانی بزووتنەوەی گەلەکەمان کەلک وەربگرن، ئانومێد بکەن. لە کۆمەلانی خەلکی کوردستانیش، کە لەهەموو کەس زیاتر چاوەروانی بیستنی ئەم مزگێنییە بوون داوا دەکەین زیاتر لە جاران پشتی حیزبە خۆشەویستەکەیان بگرن و لە خەبات بۆ وەدیهێنانی ئامانجە لە مێژینەکانی گەلی کورددا یارمەتیی بدەن.

لێرەدا بە پێویست دەزانین لە کانگای دلمانەوە سوپاسی هەموو ئەو حیزب و رێکخراو و شەخسیەتە سیاسی و کۆمەلایەتییە کورد و ئێرانی و خاریجییانە بکەین کە لە چەند سالی رابردوودا هەولی رێککەوتنەوەی تێکۆشەرانی دێموکراتیان داوە و بەم جۆرە دلسۆزیی خۆیان بۆ یەکپارچەیی حیزبی دێموکرات نیشان داوە. ئەوەندەی ناکۆکی و لێک دوور کەوتنەوەی خەباتگێرانی دێموکرات لە چەند سالی رابردوودا جێگای داخ و کەسەر بوو، ئەوەندەش هەلوێستی بەرپرسانەی هەموو لایەک لەماوەی یەکسال و نیوی رابردوودا و دانیشتن و وتووێژیان بۆ چارەسەر کردنی گیر و گرفتەکان جێگای خۆشحالییە. تێکۆشەرانی دێموکرات ئازایانە لەمپەرە رەوانییەکانیان شکاند و راستەوخۆ پێکەوە دانیشتن. هەتا توانیان دوا کەند و کۆسپەکانی سەر رێگای یەکپارچەیی ریزەکانی حیزب لە نێو بەرن. بێ لە خۆبایی بوون دەلێین ئەم کردەوە شۆڕشگێرانەیە لە پێوەندیی نێوان لایەنەکانی نیو بزووتنەوەی کورددا بۆچارەسەریی گیروگرفتەکانیان دیاردەیەکی نوێ و جێگای ئومێدە.

هیواداریین ریزەکانی حیزبی دێموکرات رۆژبەرۆژ پتەوبوونی زیاتر بەخۆوە ببینن و لەوەش زیاتر، ئاشتی و تەبایی و هاوکاری بال بەسەر پێوەندیی نێوان لایەنەکانی بزووتنەوەی کورد و حیزب و رێکخراوە سەرانسەرییەکانی ئێران دا بکێشێ و سەرەنجام دێموکراسی و پلۆرالیزمی سیاسی بە باشترین شێوە لە ولاتەکەمان دا سەقامگیر بێ. پیرۆزبێ یەکپارچەیی ریزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران.

یەکگرتوو بێ خەباتی گەلانی ئێران بۆ رووخاندنی رێژیمی کۆماری ئیسلامی.

**کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**

**کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران - رێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ**

**۱۹/۱۰/۱۳۷۵- (۸/۱/۱۹۹۷)**

## (٢٤)

# وتاری سکرتێری گشتیی حیزب

**هاوڕێی تێکۆشەر عەبدوڵڵا حەسەن زادە لە ڕێوڕەسمی یەکبوونەوەی ڕیزەکانی حیزب دا**

**خوشک و برا بەڕێزەکان!**

**هاوڕێیانی خۆشەویست! ئەم کاتەتان باش و بەخێربێن.**

لە دەوری یەک کۆبووینەوە بۆ ئەوەی دەسکەوتێکی بە نرخی حیزبە خۆشەویستەکەمان و بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلەکەمان بکەینە جێژن، دەسکەوتی وەسەریەک کەوتنەوەی بنەماڵەی گەورەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و پڕکردنەوەی ئەو قەڵشتە کە بۆ ماوەی نۆ ساڵ کەوتبووە ڕیزەکانی ئەو حیزبەوە. ئەم دەسکەوتە کە بە حەق دەکرێ بە سەرکەوتنێک بۆ هەموو بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی وڵاتەکەشمان دابنرێ، بە ئاسانی و بە نرخێکی هەرزان بەدەست نەهاتووە، بەڵکو ئاکامی چەند ساڵ هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزانەی دۆستانی حیزبی دێموکرات و نۆگرانی بزووتنەوەی میللی - دێموکراتیی خەڵکی کوردستانی ئێران و لەوەش زیاتر بەرهەمی هەستی بەرپرسایەتی و گوزەشتی تێکۆشەرانی حیزبە خۆشەویستەکەمانە. بەم بۆنەیەوە لەلایەن دەفتەری سیاسییەوە پڕ بە دڵ پیرۆزبایی لە ئێوە و لە هەموو تێکۆشەرانی حیزب و تێکرای کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دەکەم و سەرکەوتنی هەموو لایەک لە چەسپاندنی ئەم سەرکەوتنە سیاسییەدا بە ئاوات دەخوازم.

ماوەی نۆ ساڵ جیایی لە ڕیزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێراندا ئەگەر ڕوداوی ناخۆشی لێکەوتووتەوە و بیرەوەریی زۆر تاڵی بۆ بەجێ هێشتووین، ئەزموونی بەنرخیشی داوینە دەست. ڕووداوەکانی ئەم چەند ساڵە ڕیزی دۆستان و خێرخوازانی حیزبەکەمانیان بە باشترین شێوە لە ڕیزی دوژمنان و بەد خوازانی ئەم حیزبە جیا کردەوە. لە کاتێکدا دۆستانی حیزب و لایەنگرانی وەدی هاتنی ماف و ئازادییەکانی خەڵکی کوردستان هەموو ڕێگایەکیان تاقی دەکردەوە بۆ ئەوەی بتوانن کۆمەکێک بە یەکگرتنەوەی تێکۆشەرانی دێموکرات بکەن، دوژمنی لەمێژینەی گەلی کورد، یانی کۆماری ئیسلامی ئێران هەموو توانای خۆی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی چەندی بکرێ دووبەرەکی لە نێوان ڕێبوارانی ڕێگای

دیوکراسی و خۆدموختاری دا قوولتر بکا و نەهێلێ ریزەکانیان بۆ بەرەبەرەکانی دژی دەسەلاتی جەهەننەمیی ئەم ڕێژیمە یەک بخەنەوە. بۆ هەموانیش روونە ئێستا کە کۆمەلانی خەلکی کوردستان لە خۆشیی یەکگرتنەوەی تێکۆشەرانی حیزبەکەمان شاییان لە دلدا دەگەرێ، کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی باری ماتەمیان لە لێو نیشتووە و لە فکری ئەوەدان کە هەر چۆنێک بووە ئەم دەسکەوتەی بزووتنەوەی حەقخوازانەی گەلەکەمان پووچەل بکەنەوە.

کەوایە دەبێ زۆر وشیار بین، ئەوەی ئەمرۆ بە دەستمان هێناوە بە هەموو توانامانەوە بیپارێزین و بە هیچ جۆر رێگا نەدەین ریزی یەکگرتوومان کەلێنی تێ کەوێتەوە و دوژمن پێمان خۆش بێتەوە. ئەو هاورێ و هاوسەنگەرانەمان کە ماوەیەک بوو لە ژێر ناوێکی دیکەدا تێدەکۆشان، ئەمرۆ بە بریاریکی مەسئولانە تێکەل بە حیزبی خۆیان بوونەوە، لەمرۆوە ئەوان وەک هەموو هاورییانی دیکە تێکۆشەری نێو سەنگەری حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران و رێبواری رێگای خەبات بۆ وەدی هێنانی دروشمی لەمێژینەی حیزبەکەمان (دیوکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان)ن ئەوان لە ریزەکانی حیزبدا هەموو ئەو ئەرکانەیان لەسەر شانە کە دەکەونە سەر شانی هاوسەنگەرانی دیکەیان و تەواوی ئەو مافانەشیان هەیە کە بۆ هاورییانی دیکەیان هەن نە زیاتر و نەکەمتر. جێگای هەموو ئێمە لە یەک سەنگەردایە و بوونمان لە دوو سەنگەری جیاوازدا دیاردەیەکی ناسروشتی بوو کە بە هیممەتی هەموو دلسۆزان بۆ هەتاهەتایە کۆتایی پێ هاتووە. ئەوە کە رێژیمی کۆماری ئیسلامی هەمیشە لە یەکیەتیی ریزەکانی حیزبی دیوکرات و تێکرای رێبوارانی رێگای رزگاریی ئێران ترساوە و هەموو کاتێک بۆ دروست کردنی دووبەرەکی لە نێو لایەنەکانی ئوپوزیسیۆنی ئێراندا هەولی داوە، شتێکی سروشتییە و بێگومان لە داهاتووشدا هەرچی لەوێوەندییەدا بۆی بکرێ، دەیکا. بەلام زۆر نامۆ و جێگای سەرسورمان دەبێ ئەگەر خوانەخواستە لە نێو ریزەکانی ئوپوزیسیۆندا ئی وا هەبن کە بە یەکیەتیی تێکۆشەرانی دیوکرات و پتەوبوونی ریزەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کوردەوە قەلس بن. زۆر سەیر دەبێ کەسانێک لە نێو ریزەکانی ئوپوزیسیۆنی کۆماری ئیسلامی دا لە بەهێز بوونی یەکێک لە چالاکترین لایەنەکانی ئەو ئوپوزیسیۆنە هەست بە مەترسی و ئیگەرانی بکەن. ئێمە لەم تریبونەوە رادەگەیەنین کە بەهێز بوونی حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران بە زیانی هیچ هێزێکی دیکەی ئوپوزیسیۆنی ئێران نییە و بە پێچەوانەوە، هەرچەندی حیزبی دیوکرات بەهێزتر بێ، باشتر دەتوانێ ئەرکی

مێژوویی خۆی لە خەبات بۆ رزگاریی ولاتەکەمان دا بە جێ بگەیەنێ و پتر دەبێتە پاڵپشتی هەر هێزێکی سیاسی کە بەدڵەوە بۆ سەقامگیر بوونی ئازادی و دێموکراسی لە ئێراندا تێبکۆشێ، ئێمە ئاواتمانە هێزە سیاسییە نیشتمانپەروەرەکانی ئێران بۆ هەمیشە کۆتایی بە رەوتی لەت لەت بوون و دووبەرەکی بێنن و رەوتێکی پێچەوانە لە پێناوی تێکەڵ کردنەوەی هەموو تواناکان لە خەبات بۆ رزگاریی وڵاتەکەمان دا بگرنەپێش.

خۆشکانی خۆشەویست! برایانی بەرێز! لە ماوەی چەند ساڵ دوودەستەیی لە نێو ریزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دا زۆر شەخسیەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی و فەرهەنگی و نوێنەرانی زۆر حیزب و رێکخراوی سیاسی ئێرانی و کوردستانی و خاریجی بۆ یەکخستنەوەی ریزەکانی حیزبی ئێمە هەوڵیان داوە. هەر وەک لە پێشەوە گوتمان ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین، بەشێکی ئاکامی هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزانەی ئەوانە. زۆرمان پێ خۆش بوو لەم رۆژە مێژووییەدا هەمووی ئەو بەرێزانە لە نێومان بان، لە نزیکەوە هاوبەشی جێژن و شادمانیمان بان و سوپاس و ئەمەگناسییان لێ بیستباین، بەڵام ئێستا کەبە هۆی باری ناناسایی ناوچەکەوە ئەو شانازییەمان پێ نەبراوە، رێگام بدەن بەناوی ئێوە و هەموو تێکۆشەرانی دێموکراتەوە سوپاسیان بکەم و سەرکەوتنیان لە هەر هەوڵێکی دڵسۆزانەی لەم بابەتەدا بەناوات بخوازم، هەر لێرەدا پێویستە سوپاسی هاورییانی حیزبیش بکەم کە بە سەبر و حەوسەلە و هەستی مەسئولیەتەوە چەندین سەعات پێکەوە کۆبوونەوە تا هەموو کەند و کۆسپەکانی سەر رێگای بەیەک گەیشتنەوەیان تەخت کرد.

هاورییانی تێکۆشەر! زۆر جار لە موناسەبەتی وەک ئەوەی ئەمڕۆدا باسی ئەوە دەکرێ کە پێویستە رابردوو لە بیر بەرینەوە ئەمنیش لەو باوەڕەدام کە پێویستە رق و کینەکان لەبیر بەرینەوە و دەستی برایەتی و تەبایی و هاوکاری بدەینە دەستی یەکتر هەروا دەڵێم. دڵنیاشم کە هەمووومان بریارمان داوە پەردەیەکی ئەستوور لە نێوان ئێستا و چەند ساڵی رابردوودا دابدەینەوە و لاپەرەیەکی تازە لە هاوکاری و یەکدڵی بکەینەوە. (حافظ) مامۆستای غەزەلی فارسی دەڵێ (درخت دوستی بنشان کە کام دل ببار آرد * نهال دشمنی برکن کە رنج بیشمار آرد) بەڵام ئەمن پێم خۆشە لە بارێکی دیکەشەوە بۆ مەسەلەکە بچم و داوا لە هەموو خەباتگێرانی حیزب بکەم کە هەرگیز رووداوە تاڵەکانی چەند ساڵ لێک دابران و لێک دووری لەبیر نەبەنەوە با هەمیشە لەبەر چاومان بێ لەو ماوەیەدا چەندمان دوژمن بەخۆمان خۆش کرد و چەندە پەژارەمان خستە نێو دڵی دۆستانەوە با لە بیرمان بێ چەندمان هێز و توانا و ئینێرژی بە فیڕۆدا. رێگام بدەن راشکاوانە تر بدوێم و بڵێم با

لەبیرمان نەچێ لە ناکۆکی و ناخۆشییەکانی نێوخۆی حیزبی دیموکرات یان تێکرای بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کورددا چەندە خوێنی تێکۆشەری کورد بە دەستی تێکۆشەری کورد رژاوە و چەند جار سەنگەری بەرەنگاری دژی دوژمنانی ئازادی بە قازانجی سەنگەری شەڕی براکوژی چۆڵ کراوە. ئەمانەمان هەمیشە دەبێ لەبیر و لەبەر چاو بێ. بۆ ئەوەی قەت جارێکی دیکە رێگای دووپات بوونەوەیان نەدەین. زۆر جار دەبینین و دەبیستین کە هێندێ لە دۆستانی حیزبەکەمان دەپرسن تێکۆشەرانی دیموکرات ناکۆکییەکانیان چۆن چارسەرکردووە، لەسەر چی رێک کەوتوون و کام لا بۆ کام لای داشکاندووە، بۆ وەڵامی هەموو پرسیارێکی لەوبابەتە رێگا بدەن بڵێم: ئەگەر لە ناکۆکی و دوو بەرەکییەکانی رابردوودا هیچ لایەک سەرکەوتوو نەبوو و تەنیا لایەنێک کە قازانجی کرد، دوژمنانی ماف و ئازادییەکانی خەلکی کوردستان بوون لێرەدا راست بە پێچەوانەیە هەموو لایەنەکان سەرکەوتوون و ئەوەی لە نێوەدا زیانی پێ گەیشتووە و زەبری وێکەوتووە ئەوانەن کە خێری گەلی کورد و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان ناوێ. لەم رێککەوتنەدا کەس بۆ کەسی دانەشکاندووە، بەڵکوو هەموو لایەک لە خۆیان بە قازانجی حیزبێک کە حیزبی هەموویانە، مایەیان داناوە. هەموو لا تێگەیشتوون کە هێزی هەمووان لە بەهێزیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دایە . بەتێکرا باوەریان بەوە هێناوە کە وەرگرتنی مەرکەزێکی بچووک لە حیزبێکی گەورەدا زۆر زیاتر خزمەت بە ئامانجەکانی گەلی کورد دەکا تا وەرگرتنی مەرکەزێکی گرنگتر لە حیزبێکی بچووکتردا، سەرەنجام هەموو لا قەبووڵیان کردووە کە بە قەولی شاعیری شۆڕشگێڕ (ابوالقاسم لاهوتی) (قطره دریاست اگر با دریاست × ورنه او قطره و دریا دریاست). هەموومان لەم حەرکەتەدا قازانجمان کردووە و لەم هەنگاوەدا سەرکەوتووین. قازانج لەوە زیاتر کە دوژمنانی حیزب و گەلمان نائومێد کردووە ؟ لەوە زیاتر کە ریزەکانی حیزبی دێموکراتمان یەک خستۆتەوە ؟ لەوە زیاتر کەبەسەر هەستی خۆ ویستی دا زاڵ بووین و قازانجی گشتیمان وەپێش قازانجی تاکەکەسی خستووە ؟ لەوە زیاتر کە نیشانمان داوە ئەوەی بە چەند ساڵ شەڕ و ناخۆشی بە دەست نایە، دەکرێ بە چەند دانیشتنی دۆستانە بە دەستی بێنین ؟ سەرەنجام قازانج لەوە زیاتر کە رەزامەندیی کۆمەلانی خەلکی کوردستانمان بە دەست هێناوە ؟ ئاخر ئەوەی ئەمڕۆ بە هەوڵ و تێکۆشانی هەموو دڵسۆزان وەدی هاتووە، نۆ ساڵە داوای زۆربەی هەرە زۆری کۆمەلانی خەلکی کوردستان و بە گشتی دۆستانی بزووتنەوەی میللی - دیموکراتیی گەلی کوردە.

ئێمە بەسەربەرزی و شانازییەوە ئەم هەنگاوە پیرۆزە دەکەینە دیاری و پێشکەشی

باردگـای نـەتەوەی کـوردی دەکـەیـن هەر لەو کـاتەدا لە هەمـوو دڵسـۆزان دەخـوازیـن بۆ سەرخستن و چەسپاندنی ئەم دەسکەوتە نیشتمانییە یارمەتیمان بدەن ئێمە لە رابردوودا زۆر دەرسی بەنرخ لە ئەزمـوونی هێـزە سیاسـییـەکـانی کـوردسـتـان و ئێـران فـێـر بووین و هیـوادارین لەمـەودواش کـەڵکی باش لـە تاقـیکردنەوەکـانی رێـبـوارانی رێی ئازادی وەربگرین. بەڵام لەوپەری تەوازوع دا حەق بە خۆمان دەدەین بڵێین هەنگاوێک کە ئێمە بۆ چارەسەری گیروگرفتە نێوخۆییەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان هەڵمان هێناوەتەوە بۆ چاولێکردن و ئەزموون لێوەرگرتن دەبێ. ئاردزوومانە لە نێو ریزەکانی بزووتنەوەی کورد و هەروەها بزووتنەوەی سەرانسـەریی ئێـران دا هەر رۆژە نموونەیەکی دیکە لە لێک نیـزیک بوونەوە و چارسـەری گـیـر و گـرفـتـەکـان بە رێگـای وتوویژی راسـتـەوخۆ و دۆسـتـانە و بەرپرسانەدا ببینین.

بە خۆشـییـەوە ئێـسـتـا کـە بە شـادمـانیی یەکگرتنەوەی ریزەکـانی حـیـزبی دێوکـراتی کـوردسـتـانی ئێران لێک کۆبووینەوە، حیزبەکەمان لەگەڵ هیچ لایەنێکی کوردسـتـانی یان ئێرانی ناکۆکی و پیوەندیی ئاڵۆزی نییە، تا بڵێین ئامادەین چارسەری بکەین، بەڵام حەز دەکەم لە لایەن هەمووتانەوە ئامادەیی حیزبەکەمان بۆ پتەوکردنی پیوەندیی هاوکاری لەگەڵ تێکرای هێـزە نیـشـتـمـانپەروەرەکـانی کـورد و ئێرانی رابگەیەنم بەو ئاواتە کە دڕدۆنگی و لێـک دووری و هەسـتـی خـۆ بە زل زانـی و پاوان خـوازی لە نێـو لایـەنەکـانی بزووتنەوەی سـەرانسـەریی ئێـران دا کـۆتایی بێ و جـمـوجـۆڵێکی چالاک بۆ یەکـخـسـتنی ریزەکـان لە پێناوی رزگاریی وڵاتەکەمان دا دەست پێ بکا.

خۆشەویستان! بۆ ئەوەی دەردتان بۆ بەرنامەی شاد و مۆسیقا و هەڵپەرکێ بێنێتەوە، قسـەکـانم لێـرەدا کـورت دەکـەمـەوە. شـادی بکەن پێ بکەنـن، هەڵ پەڕن، شـانازی بە حیزبەکەتانەوە بکەن و بە دوارۆژێکی رووناک هیوادارین چونکە دوارۆژ ئی ئێوە و هەموو ئازادیخوازانە.

پیرۆز بێ یەکیەتیی ریزەکانی حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران.

یەکگرتوویێ خەباتی خەڵکی ئێران بۆ وەدەستهێنانی ئازادی و دێوکراسی.

ئەفرین لە دووبەرەکی و ناکۆکی و شەڕی نێو خۆیی.

بژی حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران، حیزبی قازی و قاسملوو شەرەفکەندی.

۱۳۷۵/۱۰/۱۹

## (٣٥)

# وتاری هاوڕێی بەڕێز کاک حەسەن ڕستگار

**هاوڕێیانی بەڕێزا**

بەجێ بوو کە بۆ ئەم ڕۆژە پیرۆزە کە ڕۆژی یەک گرتنەوەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە یەک پەیام و یەک وتەمان هەبێ، بەڵام لە لایەن هاوڕێیان و بە تایبەتی هاوڕێی تێکۆشەرمان مامۆستا (عبدالله حەسەن زادە) داوام لێ کرا منیش بەشی خۆم و هەستی خۆم باوێمە سەر ئەو دەستکەوتە بە نرخ و مێژووییە کە بۆ حیزبە تێکۆشەرەکەمان ڕەخساوە.

بێ شک لێتان ڕوونە ئەگەر وەزعی سیاسی کوردستانی عێراق بەم جۆرەی ئێستا هەیە، ئاوا ئاڵۆز و بە گرێ و گۆڵ و گیروگرفت نەبایە، جێژنەکەمان لە چوارچێوەیەکی یەکجار گەورەتر و بەرفراوانتر دا بەرگوزار دەبوو.

لەبەر ئەوەی مامۆستا لە وتارەکەی دا وەستایانە هەموو لایەنەکانی پیرۆزی یەک گرتنەوەی ڕیزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانی نرخاند و کەلێن و کەلەبەرێکی ئەوتۆی نەهێشتەوە ئاماژەی بۆ بکرێ و قامکی لەسەر دابنرێ. بۆیە منیش هەرئەوەندە دەڵێم، ئەم ڕۆژە مێژووییە کە ڕەوتێکی نوێی شارستانییانەیە بە تەمەنی خەباتی ئازادیخوازی نەتەوەکەمان دا لە نێوە خۆشەویستان و سەرجەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و سەرانسەری ئێران پیرۆزبایی دەکەم و هیوادارم یەک گرتنەوە و یەکگرتوویی ڕیزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ببێتە توانا و هاندەرێک بۆ هاوکاری و یەکگرتوویی هێزەکانی دژی ڕێژیمی ئاخوندیی ئێران. بێگومان لە هەموو لایەکمان ڕوونە و بە تاقی کردنەوەش دەرکەوتووە کە ڕێژیمی کۆنەپەرست و ستەمکاری کۆماری ئیسلامی ئێران کە بە زەبر و زەنگ دەسەڵاتی ئەگریسی خۆی بەسەر گەلانی ئێران دا سەپاندووە، چاوەڕوانی لێ ناکرێ چووکترین مافی ڕەوای گەلی کورد و گەلانی دیکەی ئێران دابین بکا

و، واز له سـهرکـوت و رهشـهکـوژی له ناوهوه و دهرهوهی ئێـران بێنن. بۆیه تهنیـا رێگا و ئاخرین رێگا که لهبهردهم تێکۆشهرانی کورد و خهباتگێرانی ئازادیی سهرانسـهری ئێران دایه خهباتێکی شێلگیرانهیه بۆ رووخـاندنی ئهم رێژیمه تاوانبار و زۆرداره. گرینگترین و کاراترین چهکیش بۆ ئهم مهبهسته، یهکگرتوویی بزووتنهوهی ئازادیخوازی گهلی کورد له کوردستانی ئێران و هاوکاری و هاودهنگی هێزه سهرانسـهرییهکانی ئێرانه، که ئهمرۆ به خـــۆشــیـــیـــهوه دهبینین تێکۆشـهرانی دێموکــرات بهرهی بناخـــهی ئهم رهوته تازه و پێشکهوتنوانهیه دادهنێن و سهرکهوتووانه به ئهنجامی دهگهیهنن. دیاره ههروهکو مامۆستا له وتارهکهی دا ئـامـاژهی بۆ کـرد، ئهم دهسـتـکهوته له خـۆوه و کـوت و پڕ نههاتۆته دی، بهڵکو بهرههمی ههوڵ و تێکۆشانی دۆسـتـانی بزووتنهوهی گهلی کوردمـان له کوردسـتـانی ئێران و به ههستی بهرپرسانهی ههموو لایهک گهیشتووته ئهنجام. خۆزگه ماوه دهبوو یادی ههموو ئهو خۆشهویستانه بکرێ که بهدڵهوه ههوڵی یهکگرتنهوهی حیزبی دێموکراتیان دهدا، بهڵام مهرگ، یان دهسـتی تـاوانی رێژیمی ئاخـوندی دهرفهتی وهدی هاتنی ئامـانجی نهدان. رێگهم بدهن لهم بارهوه بۆ وێنه و له جـیــاتی ههمـــوو ئهو عـــهزیزانه کـــه دهیانهویست یهکگرتنهوهی حیـزبی دێموکرات به چاوی خۆیان ببینن ناوی خوالێخۆشبوو کـاک (ئهبی قـادری) و شههید کـاک (عهبدوڵڵا شهریفی) بێنم و بڵێم هاوڕێیان داری ئاواتتان هاته بهر، رهوانتان شاد بێ و، رێگای ئامانجتان پڕ رێبوار.

## خوشک و برایانی بهڕێز

ههروهک ئاگـادارن سیـسـتـمی سیاسیی جیـهان له چهند سـاڵی رابردوودا گـۆڕانێکی یهکـجـار قـووڵ و بنهرهتی بهسـهردا هاتووه، کـه بێگومـان لهگـهڵ زۆر شـێـوهی خهباتی ئازادیخوازی کۆن و سوننهتی باو له بزووتنهوهی گهلی کورد دا یهکتـر ناگرنهوه، ههر بۆیه خۆ بواردن و تهریک کهوتنهوه لهم ئاڵوگۆڕانه و نهقۆستنهوهی ههل و دهرفهتهکان زیانێکی گهورهمان پێ دهگهیهنێ. جێژن و کۆبوونهوهی ئهمڕۆمـان نهتهنیا ههر مزگێنیی ئهمه دهدا، کـه حیـزبی دێموکـراتی کـوردسـتـانی ئێران له پاش سـاڵهها جیـایی و لێک دابڕان بۆ خۆ سـازدان لهگـهڵ ئهم ئاڵوگـۆڕانه یهک دهگـرێتـهوه، بهڵکو مـژدهی ئهمـهشی پێیـه کـه تێکۆشهرانی دێموکرات له توانایان دا ههیه ئاڵوگۆڕ له خۆیان دا پێک بێنن و لهگهڵ رهوتی بهرهو پێش چوونی زهمـان ههنگاو بنێن، بۆیه ئهم ئهزمـوون و تاقی کـارییـه گـرینگی تایبـهتی خۆی ههیه و، لهسـهر ههمـوو ئهندامـانی حیـزبه تێکۆشهرهکـهمان له دهرهوه و

ژوورەوەی کوردستان پێویستە ئەم دەستکەوتە مێژووییە لە بزووتنەوەی ئازادیخوازی نەتەوەکەمان دا بپارێزن و گەشەی پێ بدەن و بە ئامانجی سەرکەوتنی بگەیەنن. لە کۆتایی دا بە ئەرک و پێویست دەزانم سوپاسی هەمموو ئەو هێز و لایەنە سیاسییانە بکەم کە لەماوەی چەند ساڵی رابردوو دا یارمەتییان داین تێکۆشانی خۆمان لە پێناو ئامانجە رەواکانی گەلەکەماندا درێژە پێ بدەین و هەروەها سوپاسی هەمموو ئەو لایەن و هێز و رێکخراو و کەسایەتییانە بکەم کە هەوڵیان داوە ریزەکانی حیزبی دێموکرات یەک بگرێتەوە و، بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردمان لە کوردستانی ئیران دا بەهێزتر و پتەوتر بێ. هیوادارم بیرەوەری ساڵی داهاتووی ئەم جێژنە پیرۆزە لە کوردستانێکی ئازاد و ئێرانێکی دێموکراتیک دا یاد بکەینەوە.

بڕووخێ رێژیمی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامی ئێران.

پیرۆز بێ یەکگرتنەوەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران!

سلاو بۆ گیانی شەهیدانی رێگای ئازادی گەلەکەمان و لە سەرووی هەمموویانەوە سەرقافڵەی شەهیدان پێشەوا قازی محەممەد و دوکتور قاسلموو و دوکتور شەرەفکەندی!

**شاد و سەرکەوتوو بن**

**١٣٧٥/١٠/١٩**

بەشێک لە ئەندامانی ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ دەگەڵ چەند فەرماندەو پێشمەرگە



یاسر عەرەفات و حەلیل کادانی، ساڵی ١٩٩٠ لە بەغدا



چاوپێکەوتن لەگەڵ مافناس و سیاسەتوانی ناسراوی رۆژهەڵاتی کوردستان صارم الدین صادق وزیری لە سویس



هەیڤەتێکی حیزبی لەگەڵ کاک مەسعود بارزانی لە رانیە لە ساڵی ۱۹۹۳



دیدار لەگەڵ مام جەلال ساڵی ۱۹۹۲



دیداری لیژنەی کورد دەگەڵ یاسر عەرەفت ساڵی ١٩٨٩ ی زاینی



مام جەلال لە پێشڕەوی ئاوارەی مەیبەی



دیداری دەستەی حزبی دیموکرات و حزبی شیوعی لە هەولێر





دوو وێنە لە ڕێوڕەسمی جەژنی پەنجا ساڵەی حیزب لە دۆڵی شاری

